# بەرگری لە قورئان دژی ڕەخنەگرانی


نووسینی :

د. عەبدوڕڕەحمان بەدەوی

وەرگێڕانی:

وەرزێر حەمەسەلیم



2007 زایینی

1428 كۆچی

پرۆژەی تیشك

**ناوی کتێب:** بەرگری لە قورئان دژی ڕەخنەگرانی

**نووسینی:** د. عەبدوڕڕەحمان بەدەوی

**وەرگێڕانی:** وەرزێر حەمەسەلیم

**ژمارەی سپاردن:** (1144) ساڵی (2007)

**شوێنی چاپ:** کۆمپانیای چاپ و پەخشی نووسەر

**نۆرەی چاپ:** یەکەم

**ساڵی چاپ:** 2008

**نەخشەسازی بەرگ:** فازل قەرەداغی

**نەخشەسازی ناوەوە:** ئیدریس سیوەیلی

**لە بڵاوکراوەکانی:** پرۆژەی (تیشك)، زنجیرە (29)

**ناونیشانی پرۆژە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت :** www.tishkbooks.com

**ئیمەیلی پرۆژە:** info@tishkbooks.com
tishkbooks@yahoo.com

بسم الله الرحمن الرحيم

(إِنْ أُرِيدُ إِلاَّ الإِصْلاَحَ مَا اسْتَطَعْتُ وَمَا تَوْفِيقِي إِلاَّ بِاللّهِ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ)

(هود : 88 )

## پێشەکیی

قورئانی پیرۆز بەو پێیەی کە پایەیەکی بنەڕەتی ئیسلامە، لەلایەن ئەو کەسانەوە کە دژ بە ئیسلام دەنووسن چ لە ڕۆژهەڵاتو چ لە ڕۆژئاوادا ڕووبەڕووی چەندین هێرش بووەتەوە, ئەمەش لەسەرەتاوە لەنیوەی دووەمی سەدەی یەکەمی کۆچییەوە (حەوتەمی زایینی) دەستی پێکردوەو هەتا ئەمڕۆش هەر بەردەوامە.

یوحەنا دیمەشقی لەدەوروبەری ساڵانی نزیکەی (650–750) ئەم هێرشەی دەستپێکرد بە ئاراستەکردنی چەندین ڕەخنە لەسەر داڕشتنی گشتی قورئان, لەو بوارەشدا بەدوای ئەودا (اثیموس زیجابینوس ) دێت لەکتێبەکیدا بەناو (العقیدة الشاملة).

بەڵام یەکەم هێرش بەدوورو درێژی لەسەر قورئان بریتییە لەکارەکانی (نیکیتاس)ی بێزەنتی, ئەویش لە پێشەکی کتێبەکەیدا بەناوی (نقد الاكاذيب الموجودة في كتاب العرب المحمديين)

واتە (ڕەخنە لەو درۆیانەی کەلە کتێبی عەرەبە موحەممەدییەکاندا هاتووە), هیچ شتێکیش دەربارەی ژیانی ئەم نوسەرە نازانین ئەوە نەبێت کەناوبانگی لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمدا بڵاوبوویەوە کە قسەکەرێکی توند بوو دژبە ئیسلامو هەروەها دژ بەکەنیسەی ئەرسەدۆکسی ئەرمینی کەلەکتێبی (دحض الكنيسة الارمينية) دا ڕەخنەی لێدەگریت, لە هەمان کاتیشدا دژ بە (کەنیسەی کاسۆلیکی)ش بووە لە ڕۆما (علم القياس الاساسي), بەڵام گەورەترین هێرشی ئەرگۆمینتی (جدلی) لەسەر قورئانو ئیسلام ئەوەبوو کە (چان کنتاکوزین)ی ئیمپراتۆری بێزەنتیە لە دوو کتێبەکەیدا بەناوی (ضد تمجيد الملة المحمدية ) و (ضد الصلوات و التراتيل المحمديه ) ئەنجامی دا, ئەم هێرشەش لە ڕۆژهەڵاتداو بە زمانی یۆنانیش بوو, هەروەها بەزمانەکانی سریانیو ئەرمینیو عەرەبیش هێرشی کراوەتە سەر قورئان.

بەکەوتنی قوستەنتینیەو دەست بەسەراگرتنی لەلایەن موسڵمانەکانەوە لە ساڵی( 1453 ز)دا, هێرشی بێزەنتییەکان بۆ سەر قورئانو ئیسلام ڕاوەستاو پاش ئەوان ئەوروپای مەسیحی ئەوکارەی گرتە ئەستۆ, (کاردینال نیقولادی کوزا)ش (1401 – 1464) کاروانی ئەو هێرشە نوێیەی دەستپێکرد, ئەوەبوو بە ئاڕاستەکردنو فەرمانی (پاپا بیوسی دووەم) (نیقولا) کتێبێکی بەناوی (نقد وتفنيد الاسلام)و نامەیەکی جنێو ئامێزی لەسەر قورئان نووسی لە ژێر ناونیشانی (غربلة القران)و ئەم نامەیەش بەسەر سێ کتێبدا دابەشکرا، لەکتێبی یەکەمدا سەلماندنی حەقیقەتی ئینجیلی بە پشت بەستن بە قورئان ڕاگەیاندو لەکتێبی دووەمدا ڕوونکردنەوەو خستنە ڕووی مەزهەبی کاسۆلیکیو لەکتێبی سێیەمیشدا هەندێ دژو پێچەوانەی لە قورئاندا خستبووە ڕوو ،

ئەم کتێبانەش لە چاپخانەی بلیاندر لەشاری (بال)ی سویسری ساڵی (1543) چاپو بڵاوکرانەوە.

هەروەها چەند پاپایەکی (دۆمینیکاییو جزویت) هەستان بە بڵاوکردنەوەی کتێبگەلێکی هێرش ئامێز بۆ سەرقورئانو ئیسلام لەوانەش:

– دینیس لەکتێبەکەیدا بەناوی (حول الخداع المحمدي) کولون 1533 ز.

– الفونس سینا لەکتێبەکەیدا بەناوی (التحصين الايماني) (1491ز).

– چان دی تیریکریماتا لەکتێبەکەیدا بەناوی (بحث للرد على الاخطاء الرئيسية الخادعة لمحمد) ڕوما (1606 ز).

– لولیس فییف لە کتێبی (الايمان المسيحي الحقيقي ضد المحمديين) بال (1543 ز).

– میشیل نان لە کتێبی (الكنيسة الرومانية اليونانية في الشكل و المضمون للدين المسيحي ضد القران والقرانيين دفاعا وبرهانا) پاریس (1680 ز) .

بەڵام توندترین کتێبی هێرش ئامێز بۆ سەر قورئان ئەوەبوو کە (لوود ڤیجو مراش) (1612–1700) لە کتێبی (عالم النص القراني)دا نووسی و لەساڵی (1698) لە بادوا بڵاوکرایەوە, ئەمەش کتێبێك بوو لە دوو بەرگی گەورەداو ناونیشانی بەرگی یەکەمی بریتی بوو لە (مقدمة في دحض القران), ئەم کتێبەش بە جیاجیا لەچوار بەشدا ساڵی (1961ز) بڵاوکرایەوەو تیایدا (مراش) ژیانی موحەممەدی بەپێی سەرچاوە عەرەبییەکان خستۆتە ڕوو, وە بەرگی دووەمی کتێبەکەش دەقی عەرەبی قورئان و لەگەڵ وەرگێڕدراوی لاتینیو شرۆڤەکردنی لایەنە نادیارەکانی ناو دەقەکەو پاشان ڕەخنەلێگرتنو بەدرۆخستنەوەی لە خۆ دەگرێت, جێی ئاماژە پێکردنە کە (مراش) ی نووسەری ئەم کتێبە زمانی سریانیو عەرەبیو عیبری زانیوە.

(نللینو) دیراسەیەکی دەربارەی سەرچاوەی دەستنووسە عەرەبییەکان نووسیوە کە (مراش) دەربارەی قورئان لە کارەکەیدا پشتی پێیان بەستوە، وە دەتوانین بڵێین کە ئەم کارەی (مراش) لەسەر قورئان بە بنەماو خاڵی دەستپێکردن دێت لە دیراسەکردنی جدی لە ئەوروپادا، وە کارێکیشە پڕە لە هەڵەو ئەرگۆمێنتی کاڵو کرچو ناماقووڵ وە بەداخەوە هەمان ئەو هەڵەو لە سنوور لادانانە لە هەموو ئەو لێکۆڵینەوانەدا دووبارە دەبێتەوە کە پەیوەستن بە قورئانەوەو ڕۆژهەڵاتناسە ئەوروپیەکان لەماوەی ئەو دوو سەدەیەی پاش کتێبەکەی (مراش)دا نووسیویانە.

بەڕاستی ئەوەش سەرەتایەك بوو کە لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمدا ئەو ڕۆژهەڵاتناسانە هەرچی لەتوانایاندا هەبوو خستیانەگەڕ بۆ ئەوەی لە نووسینەکانیاندا بابەتی بنو نووسینەکانیان بەشێوەیەك بخەنەڕوو کە زیاتر بەڵگەدارترو جدی ترو بابەتیانەترینو لەڕووی میتۆدی زمانەوانیشەوە وردتربن, بەڵام بەبێ هیچ سوودێك چونکە ئەو پاڵنەرە ناوەکیانەی کە بە ڕقو کینە لە دڵیاندا دژ بە ئیسلامو کتێبە پیرۆزەکەی ئیسلامو پێغەمبەری ئیسلام گڕی دەگرت چۆن بوو هەروا مایەوەو بەڵکو زیاتریش کڵپەی دەسەند.

سەرەڕای ئەوەش کە ئەو نووسەرانە هۆکارەکانی تێگەیشتنی زمانەکانیان لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەمەوە تائەمڕۆ بۆ دابین کرابوو, زیاد لەوەش بڵاوبوونەوەی زۆری دەستنووسەکانیش لە ئارادابوو, بەڵام ئەوانە هەرسوور بوون لەسەرخستنە ڕووی تیۆرە هەڵەکانیان, ئەوەش لە میانەی وێناکردنە ساختەکانیان بۆ مەسەلە وەهمییەکان کەدەربارەی قورئان دەیانخستە ڕوو, هەروەها خستنەڕووی ئەو ئاکامە ساختانەی پێی دەگەیشتن.

لەبەر ئەوە ئێمەش لەم کتێبەماندا ڕووبەڕووی ئەوە وەستاوینەتەوە تاوەکو پەردە لەڕووی ئەو زاتکردنە نەزانانەو گێلۆکانەیەی ئەو ڕۆژهەڵاتناسانە دەربارەی قورئان هەڵبماڵین.

سەرەتاش بە تۆمارکردنی چەند تێبینیەکی گشتی دەست پێدەکەین:

1– لە ڕاستیدا شارەزایی ئەو ڕۆژهەڵاتناسانە لەزمانی عەرەبیدا لەڕووی ئەدەبیو هونەرییەوە لاوازە, دەتوانرێت بوترێت کە ئەم تێبینیە نزیکەی هەرهەموو ڕۆژهەڵاتناسەکان دەگرێتەوە.

2– زانیارییەکانی هەرهەموویان کەلەسەرچاوە عەرەبیەکانەوە وەرگیراوە لاوەکیو کەموو کورتو ناتەواون, ئەوانە بەو کارەیان خۆیان فڕێداوەتە ناو موغامەرەی خستنەڕووی چەند گریمانەیەکی ترسناكو هەڵەوە کەپێیان وایە ئەوان یەکەم کەس بوون کە بەو ئاکامە گەیشتوون, بەبێ ئەوەی ئەرکی هیلاکیو ماندوو بونی گەڕان بەوسەرچاوانەدا کەهەمان ئەو کێشانەی تێدایەو ئەوان دەیان وروژێنن بخەنە سەرشانی خۆیان لەڕاستیشدا لەو ڕووەوە نووسەرە موسڵمانەکان باسیان لەو گریمانانە کردووەو لەدژیان وەستاونەتەوە.

3– ئەوەی کەهەندێك لەو ڕۆژهەڵاتناسانە دەبزوێنێت پاڵنەری ڕقو کینەیە بەرامبەر بە ئیسلام, ئەمەش وایان لێدەکات کە نابابەتیانەو کوێرانە بڕواننە مەسەلەکان, ئەوەش بەتایبەتی بەسەر (هیرشفیلد)و(هور فیتز)و(سبیر)دا جێ بەجێ دەبێت.

4− هەندێك لەو ڕووكەشبینانە بۆ ئەوە چوون تابە بەرزترین دەنگی خۆیانەوە ئەوە ڕابگەیەنن لە قورئاندا لاساییكردنەوەو لێوەرگرتن هەیە لەمەشدا پشتیان بەو لێكچوونانە بەستووە كە هیچ بنەمایەكیان نییە, ئەمەش چەند ڕۆژهەلاتناسێكی وەك ( گولدتسهیر, شفالی, مرجولیوث )پێی هەستاون, وە تاڕادەیەك خۆیە دووردەگرین لەوەیاندا كەپەیوەسە بە(نۆلدكە)وە كە تاڕادەیەك خۆی بەریكرد لەوكتێبەی كە بەناوی (تأريخ القرآن)ەوە نووسیبویو ئەوەی ڕەنكردەوە كەدوویارە ئەو كتێبەی چاپ بكاتەوەو ئەوەی بۆ (شفالی) ڕۆژهەلاتناس بەجێ هێشت تاوەكوئەو بەو كارە هەستێت بۆیە ئەمەی دووەمیان جارێكی تر كتێبەكەی چاپ كردەوەو دواتریش بەكتێبی (نۆلدكە – شفالی) ناسرا.

5− هەندێك لەو ڕۆژهەلاتناسانە، ڕەگەزپەرستی مژدەدەری (التبشیر) پالّی پێوە دەنان تاوەكو بەكارێكی لەو جۆرە هەستن وەك ئەوەی كە تایبەتە بە(ولیەم مۆیر)ی ڕۆژهەلاتناس و(زویمر)ەوە، بێگومان ئێمە لەم كتێبەدا هەموو ئەو مەسەلانە چارەسەرناكەین كە ئەو ڕۆژهەلاتناسانە سەبارەت بە قورئان ورووژاندویانە، وە تەنها ئاوڕ بەلای ئەو مەسەلانەدا دەدەینەوە كە بەلامانەوە زۆر گرنگن، هەروەها ئەم توێژینەوەیەمان بەستۆتەوە بەو ماوەیەوە كە دەكەوێتە نێوان ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمەوە هەتا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم. میتۆدیشمان لەم توێژینەوەیەدا بریتیە لە میتۆدێكی دیكۆمێنتاری‌و بابەتیانەی ئاشكرا، ئامانجیشمان لابردنی دەمامك‌و دەرخستنی ڕووی ڕاستەقینەی ئەو بەناو زانایانەیە كە گومڕایی‌و فرۆفێڵیان بەخشیوەتە گەلانی ئەورووپاو گەلانی دیكەش.

بەلام لەهەمان كاتیشدا جەخت لەسەر ئەوە دەكەینەوە كە قورئان بە هەمیشەیی بەسەر ڕەخنەگرانیدا زالّ دەبێت‌و بەسەركەوتوویی دێتە دەرەوە.

**د. عەبدوڕڕەحمان بەدەوی**

یەکێك لەو وشانەی کە گفتوگۆیەکی زۆر دەوروژێنێت لە وەرگێڕانی زاراوە قورئانیەکاندا وشەی (ئوممی)یە بەتایبەتیش کاتێك کە پێغەمبەری (ﷺ) پیّ وەسف دەکرێت.

لە ڕاستیشدا ئەم وشەیە لە قورئانداو لەم ئایەتانەی خوارەوەدا بەسەر پێغەمبەردا (ﷺ) سەپێنراوە.

1– خوای گەورە لەئایەتەکانی (156–157)ی سورەتی(الاعراف)دا دەفەرموێت (الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوباً عِندَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالإِنْجِيلِ يَأْمُرُهُم بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَآئِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالأَغْلاَلَ الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ فَالَّذِينَ آمَنُواْ بِهِ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَاتَّبَعُواْ النُّورَ الَّذِيَ أُنزِلَ مَعَهُ أُوْلَـئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ) (الأعراف : 157 )

2–لەئایەتەکانی158ی هەمان سورەتدا دەفەرموێت (قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُولُ اللّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعاً الَّذِي لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ لا إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ يُحْيِـي وَيُمِيتُ فَآمِنُواْ بِاللّهِ وَرَسُولِهِ النَّبِيِّ الأُمِّيِّ الَّذِي يُؤْمِنُ بِاللّهِ وَكَلِمَاتِهِ وَاتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ) (الأعراف : 158 )

وشەی (ئوممی) لەم ئایەتە قورئانییەدا بەسەر نەخوێندەواراندا دەبڕدرێت:

1– خوای گەورە لەسورەتی(2)ی سورەتی (الجمعة)دا دەفەرموێت: (هُوَ الَّذِي بَعَثَ فِي الْأُمِّيِّينَ رَسُولاً مِّنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا مِن قَبْلُ لَفِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ) .

2–لەئایەتی (20)ی سورەتی(ال عمران)دا دەفەرموێت: (فَإنْ حَآجُّوكَ فَقُلْ أَسْلَمْتُ وَجْهِيَ لِلّهِ وَمَنِ اتَّبَعَنِ وَقُل لِّلَّذِينَ أُوْتُواْ الْكِتَابَ وَالأُمِّيِّينَ أَأَسْلَمْتُمْ فَإِنْ أَسْلَمُواْ فَقَدِ اهْتَدَواْ وَّإِن تَوَلَّوْاْ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلاَغُ وَاللّهُ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ) .

3–لەئایەتی (75)ی هەمان سورەتدا دەفەرموێت: (وَمِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ مَنْ إِن تَأْمَنْهُ بِقِنطَارٍ يُؤَدِّهِ إِلَيْكَ وَمِنْهُم مَّنْ إِن تَأْمَنْهُ بِدِينَارٍ لاَّ يُؤَدِّهِ إِلَيْكَ إِلاَّ مَا دُمْتَ عَلَيْهِ قَآئِماً ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُواْ لَيْسَ عَلَيْنَا فِي الأُمِّيِّينَ سَبِيلٌ وَيَقُولُونَ عَلَى اللّهِ الْكَذِبَ وَهُمْ يَعْلَمُونَ) .

4– خوای گەورە لەئایەتی (78)ی سورەتی(البقرة)دا دەفەرموێت: (وَمِنْهُمْ أُمِّيُّونَ لاَ يَعْلَمُونَ الْكِتَابَ إِلاَّ أَمَانِيَّ وَإِنْ هُمْ إِلاَّ يَظُنُّونَ) .

سەرەتا با سەیری حاڵەتی یەکەم بکەین کە وشەی(ئوممی)یەو پێغەمبەری(ﷺ) پیّ وەسف دەکرێت, دەبینین ڕاڤەیەك کە زۆر پشتی پیّ دەبەسترێت لەلایەن ڕاڤەکارانی قورئانی پیرۆزو زمانەوانەکانەوە ئەوەیە کە لە(لسان العرب)دا هاتووە : موحەممەدی پەیامبەری خوا ﷺ بە(ئوممی) وەسف کراوە چونکە –الامە– ئوممەت یان نەتەوەی عەرەب خوێندنەوەو نووسینیان نەزانیوە جا خوای گەورە نێردراوێکی لە خۆیان بۆ ناردون کە نەدەنووسێتو نە دەشخوێنێتەوە, ئەمەش یەکێك بوو لە موعجیزەکانی بە شێوەیەك کە ڕاستەوخۆ لەوەحیەوە کتێبی خوای گەورەی بەسەردا دەخوێندەوە کە لە خوای گەورەو باڵادەستەوە بەبیّ هیچ گۆڕانکاریو زیادوو کەمییەك لە ووشەکانیدا پێیی ڕادەگەیاندن, لە کاتێکدا کە وتاربێژ لە عەرەبدا پشتی بە زیادکردنو لابردن دەبەست لە هەر وتارێکدا کە جارێکی تر دووبارەیکردایەتەوە وە دانایی خوای گەورەش ئەوە دەخوازێت کە کتێبەکەی بەپارێزراوی بمێنێتەوەو دەستێوەردانی پێغەمبەرەکەیی تێدانەبێت لەوەی کەلەلایەن خوای گەورە خۆیەوە دابەزیوەو هەواڵی ئەوانەی پیّ ڕاگەیاندووە کەپێش ئەو ناردوونی، ئەمەش ئەو واتە موحەممەد (ﷺ) لەوان جیادەکاتەوە, وە بەم بۆ نەیەشەوە ئەم وتەیەی خوای گەورەی بۆ دابەزیوە کە دەفەرموێت: (وَمَا كُنتَ تَتْلُو مِن قَبْلِهِ مِن كِتَابٍ وَلَا تَخُطُّهُ بِيَمِينِكَ إِذاً لَّارْتَابَ الْمُبْطِلُونَ) (العنكبوت : 48 ).

لەم گەواهی دانەوە بۆمان دەردەکەوێت کە:

1ـ سیفەتی (ئوممی) واتە ئەوەی کە ناخوێنێتەوەو نانووسێت.

2ـ لە وشەی (امە) واتە نەتەوە(ئوممەتەوە) هاتووە کەمەبەستی نەتەوەی عەرەبە کاتێك کە ئەو نەتەوەیە بەگشتی نەخوێندەواربوون, وە فەرهەنگی (لسان العرب) زیاتر جەخت لەسەر ئەم رایە دەکاتەوە کە دەڵێت: "عەرەبەکان بەنەخوێندەولر ناودەبران چونکە نووسین لە ناویاندا دەگمەن یان هەر نەبوو" وە بەفەرموودەیەکی پێغەمبەر(ﷺ) ئەم وتەیەی پشتڕاست دەکاتەوە کە فەرموویەتی: (بعثت الی امة أمیة) واتە (من بۆنەتەوەیەکی نەخوێندەوار نێردراوم).

3ـ واتایەکی دیکە کە (لسان العرب) بۆ وشەی (ئوممی)و (امیون) دەیهێنێتەوە ئەو واتایەیەکە زیاتر بەسەر (امم) واتە (نەتەوەکاندا) جێبەجێ دەبێت, واتە حاڵەتی دووەم کە پێشتر باسمان کرد, لێرەشدا پشت بە رایەکی زانای زمانناسی گەوەرە (ابی اسحاق الزجاج) دەبەستێت کە لە 923/9/25ی زایینیدا کۆچی دوایی کردوە, ئەبی ئیسحاق دەڵێت: (ئوممی کەسێکە کەچۆن لەدایك بووە, هەروا دەمێنێتەوە), واتە: نوسین فێر نەبووە لەبەرئەوە( ئوممییە) چونکە نوسین پیشەیەکی بەدەست هاتووە ئەوکەسەش لەم حاڵەتەدا چۆن لەدایك بووە هەروا ماوەتەوە جا ووشەی (ئوممی) لەووشەی (ام–دایك)ەوە هاتووە وە ئێمەش لێرەدا لەبەردەم دوو بنچینەی ئەم سیفەتی (ئوممی) یە داین.

بنچینەی یەکەم: (ئوممی) سەرچاوەکەی ئوممەتە (امة) .

بنچینەی دووەم: (ئوممی) سەرچاوەکەی (ام–دایك)ە.

هەردوو بنچینەکەش دەتوانرێت لە ڕووی بنەمای زمانەوانیەوە (نحو) پەسەند بکرێ, وەلەو لایەنەوە هیچ گرفتێك نییە, بەڵام لەلایەنی واتاوە جیاوازییەکی گەورەمان بۆ دروست دەبێت لەکاتی بەکارهێنانی بنچینەی یەکەم یان بنچینەی دووەم چونکە بنچینەی دووەمی وشەی (ئوممی) کەلە (ام–دایك)ەوە وەرگیراوە بواری ئەوەمان دەداتێ کە مەبەستمان بەوشەی (ئوممی) ئەوکەسەبێت کە ناخوێنێتەوەو نانووسێت, بەڵام بنچینەی یەکەمی وشەکە کەلە (ئوممەت–نەتەوە)وە وەرگیراوە ئەو بوارەمان ناداتێ کە بڵێین مەبەستمان لەو وشەیە ئەوەیە کەکەسێك خوێندنەوەو نوسین نەزانێت.

لەبەرئەوە ئەوانەی کەوا گومان دەبەن کە واتای وشەی (ئوممی) کە پێغەمبەری (ﷺ) پێ وەسف کراوە ئەوە بێت کە پێغەمبەر( ﷺ سەربە نەتەوەی عەرەبە ئەوانە خۆیان فریودەدەن چونکە شتێکی بێ مانایە ئەگەر بڵێین: نووسین لەناو عەرەبدا دەگمەن بووە یان هەر نەبووە, لەلایەکی دیکەشەوە زۆرێك لەنەتەوەکانی دیکە لەم حاڵەتەدا هەروەك نەتەوەی عەرەب وابوون.. ئیتر بۆچی ئەم سیفەتە تەنها بەسەر نەتەوەی عەرەبدا کورت بکرێتەوە بۆئەوەی بەتەنها ببێتە تایبەتمەندیەك بۆ ئەو نەتەوەیە, بەتایبەتیش کە دەتوانرێت ڕوویەڕووی ئەوە بوەستینەوە ئەویش بەپشت بەستن بەو ئایەتانەی کەوەك بەڵگە باسمان لێوەکردن لەو حاڵەتەدا کە ووشەی (ئوممی)و (امیون) بەشێوەیەك هاتوون مەبەست پێیان دەلالەت کردنە لە (ئوممەت–نەتەوەکان) لەکاتێکدا کە مەسەلەکە پەیوەندی بەنەتەوە گەلێکەوە هەیە کە جیاوازن یان هاورێکن لەگەڵ هەردوو ئوممەتەکەی (تەورات–یەهود) و (ئینجیل–مەسیحیەکان)دا, واتە بەشێوەیەکی گشتی نەتەوە خاوەن پەیامە ئاسمانییەکان.

## یەکەم : ڕای ڕۆژهەڵاتناسەکان

ئێستاش ڕای ڕۆژهەڵاتناسە ئەورووپییەکان دەربارەی واتای وشەی (ئوممی) و (ئوممیون) دەخەینەڕوو:

ئەو کەسانەی کە یەکەم جار باسیان لەم مەسەلەیە کرد(سبرنجر) بوو لەکتێبەکەیدا بە ناونیشانی (حیاة و عقیدة محمد) بەرلین ساڵی 1861ز, ئەوەش لەسێ گۆشە نیگاوە.

1 – لەبەشی یەکەمدا (لاپەڕە 301) دا دەڵێت: (کاتی خۆی دانیشتوانی دورگەی عەرەبی بەر لە هاتنی موحەممەد دابەشبووبوون بەسەر خاوەن کتێبەکانو بتپەرستەکاندا.. خاوەن کتێبەکانیش لە یەهوودو نەصاراو سابئیەکان

پێکهاتبوون و ئەمانەش ئەو هۆزانە بوون کە وەحی (سروش)ی دابەزێنراویان هەبوو لەکاتێکدا بتپەرستەکان هیچ شتێکی لەو شێوەیەیان نەبووە).

2- بەشی دووەم(لاپەڕە 224) دەڵێت: ئوممی واتە یاخود یەکسانە بە بتپەرست.

3- بەشی سێیەم (لاپەڕە 401-402) دەڵێت: (دەگوترێت ئوممی واتە ئەو مرۆڤەی کە دەتوانێت بخوێنێتەوە بەڵام ناتوانێت بنووسێت ئەم ڕایەش پشت بە ئایەتێك دەبەستێت کە بە هەڵە لێی تێگەیشتوون ئەویش ئەوەیە کە خوای گەورە دەفەرمویێت :(وَمِنْهُمْ أُمِّيُّونَ لاَ يَعْلَمُونَ الْكِتَابَ إِلاَّ أَمَانِيَّ وَإِنْ هُمْ إِلاَّ يَظُنُّونَ* فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ يَكْتُبُونَ الْكِتَابَ بِأَيْدِيهِمْ ثُمَّ يَقُولُونَ هَـذَا مِنْ عِندِ اللّهِ لِيَشْتَرُواْ بِهِ ثَمَناً قَلِيلاً فَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا كَتَبَتْ أَيْدِيهِمْ وَوَيْلٌ لَّهُمْ مِّمَّا يَكْسِبُونَ) (البقره: 87, 79 )، بەهەرحاڵ ئەم ئایەتە لەواتا ڕاستەقینەکەی خۆی لادراوە بەجۆرێك کە ئیبن ئیسحاق دەڵێت: ووشەی (ئوممیین) کە وەرگێڕانەکەی بەواتای خوێنەران نێت وشەیەکە لە زۆر ئایەتی دیکەی قورئاندا بەو مانایە نێتو واتای خوێندنەوەش دەگەیەنێت.. وەوای دادەنێت کە مانای ئەو ئایەتەی کە سبرنجر ئاماژەی پێداوە ( ومنهم اميون لايعلمون الكتاب الا أماني ) واتە ئوممییەکان ناتوانن بنووسن بەڵکو دەتوانن بخوێننەوە واتە (الاماني) بەمانای خوێندنەوە دێت . هەروەها دەبینین(بەغەوی) واتای (اماني)بە هاوماناکەی ڕاڤەدەکاتو دەڵێت: " أماني واتە فەرموودە دروستکراوەکان" وە ئەبو عوبەیدەش لە تەفسیرە کەیدا دوورتر بۆی دەچێتو دەڵێت: " الاماني" ئەو شتانەیەکەلە دڵدا لەبەردەکرێنو بەبێ کتێب دەوترێنەوە....، وە (فەراء) ووشەی ئوممی وا لێکدەداتەوە کە دەڵێت: "ئوممییەکان ئەو عەرەبانە دەگرێتەوە کەپەیامدار نەبوون" ئەو بەڵگانەی کە(سبرنجر) هێناو نیە تەوە ئەم تێ بینیانەی لای خوارەوە دەخوازێت:

1- بەڵگەی یەکەم نارەوایە چونکە (سبرنجر) پشتی بە هیچ دیکۆمێنتێك نە بەستووە.

خۆ ئەگەر دەقێکی سەردەمی جاهیلی بەر لە ئیسلاممان دەست بکەوتایە کە ئەو جیاوازی خستنە نێوانەی خاوەن پەیامەکانو ئوممیەکان (بتپەرستەکان)ی پشت ڕاست بکردایەتەوەو بیسەلماندایە ئەوا گرفتێك لە ئارادا نەبوو, بەڵام سبرنجر خۆی خستۆتە نێو بازنەیەکی داخراوەوە .

2- وتەی دووەم کەگوایا وشەی ئوممی بەواتای بتپەرست نێت، ئەوەش گریمانەیەکە هەریەکە لە ڤنسنكو هورفیتزو بلاشیرو رودی باریتو کەسانی دیکە ی جگە لە وانیش لەسەری ڕۆشتوون.

3- وتەی سێیەمیش کە پەیوەستە بەو ڕایەوە کە دەڵێت:

"ئوممی" ئەو کەسەیە دەخوێنێتەوە بەڵام نانووسێت, ئەوە ڕایەکە دەدرێتە پاڵ ئیمامی شیعەکان جەعفەری صادق. بڕوانە: المرجع فی المقال"ئوممی" لەکتێبی ئێدوارد ولیام -فەرهەنگی- عەرەبی ئینگلیزی- لەندەن أدنبره (1862-1893).

باپاش ئەمەش بگوێزینەوە بۆسەر هەردوو ڕۆژهەڵاتناس ڤنسنكو هور فیتز:

1- (ڤنسنك ) لە وتارێکیا کە گۆڤاری (الشئون الشرقية ) لەلاپەڕەکانی (2-19)دا بڵاوی کردۆتەوە جەخت لەسەر ئەو دەکات کە ووشەی (ئوممی) لە وەسفی ئەو کەسانەدا بەکاردەهێنرێت کە خاوەن پەیام نین, ئەوەش هەمان ئەو مانایەی هەیەکە سبرنجر بەزیاتر لە پەنجاساڵ پێش ئەو دیاری کردوە.. بەڵام ڤنسنك ئەوەی بۆ زیادکردوە کە ووشەی (ئوممی) لە (ئوممەت) واتە گەلێکی بتپەرستەوە وەرگیراوە کە لەگەڵ ووشەی (جويم)ی عیبری یەکدە گرێتەوە وە ڤنسنك هەمان ئەو ڕایەی خۆی لە کتێبی (العقيده الاسلاميه)-کمبردج (1932) لاپەڕە (60) دا دووبارە دەکاتەوە, وە ئەو شتەی کەلەلای ئەو نوێیە ئەو بەراورد کرد نەی نێوان وشەی عەرەبی (أمه) نەتەوەو وشەی یەهودی (جویم)ە.

وشەی (جویم) لە تەوراتدا هەیە (سفر التكوين)(1:14) لە دەستە واژەی (تدعال ملل جويم‌و تدعال كان أحد أربع ملوك شنوا الحرب ضد الملك برشاع فى وادى الاردن) واتە: تدعال پادشای جویم بوو وە تدعال یەکێك بوو لەو چوار پاشایەی کە جەنگیان لە دژی پادشا برشاع بەرپاکرد لە دۆڵی ئوردوندا..... وە پێدە چێت (تدعال) هەمان پادشای بەناوبانگ (هتيتى تودها)بێت, ، بەڵام مانای وشەی "جویم" بەسەر گەلانی ئیمپراتۆریەتی حیسیەکاندا دەبڕدرێت، هەروەها وشەی "جویم" بەسەر ناوچەی سەروی زابیشدا دەبڕدرێت، وە لەنووسینێکدا یەشوع یەکێك بووە لەو پادشا کەنعانیانەی کە ئەم بەسەریاندا سەرکەوتووەو ناوی پادشای (جويم جلجال)ە هەروەك لەوەرگێڕانی (الاخائيه)دا هاتووە بەناوی "ملك جلجال الغريب" فەرهەنگی ئینسکلۆپیدی بۆتە تەورات جویم تور نهدت –بریولس (1896ز) بەشێوەیەکی گشتی وشەی جویم لەزمانی عیبریدا واتە نەتەوەکان ، وەدەتوانرێت بکرێتە وەرگێڕدراوی وشەی ئەکادی "عومان"( بڕوانە ئینسکلۆپیدیا – موسوعە)ی یەهودی–جویم (683).

بەمشێوەیە دەبینین وشەی جویم لەلای یەهودییەکان ڕوون نییەو لای عەرەبەکان بەر لەهاتنی ئیسلامیش نەناسراوە لەبەر ئەوە گریمانەکەی ڤنسنك بە تەواوی گریمانەیەکی ساختەیە.

2ـ هەروەها هورفیتز لەبەرامبەر عیبرییەکی دیکەدا لێکۆڵینەوەیەکی کردووەو ئەو مەسەلەیەی لەدوو کتێبدا باسکردووە.

ـ "الاسماو اليهوديه و مشتقاتها فى القرآن" "ناوە یەهودییەکانو پێکهاتەکانیان لە قورئاندا" بەرگی دووەم –ئوهایو (1925ز) طباعه واوفست –هیلدشیم.

–"مباحث قرآنية" "باسە قورئانییەکان" بەرلینو لیبزج (1926ز).

وە هورفیتز کەزانایەکە بێلایەن نییەو نییەتی خراپی لەبەرامبەر ئیسلامدا هەیە بانگەشەی ئەوە دەکات کە "ئوممی" واتە "بتپەرست" جا لەبەرئەوە ئەو دەستەواژەی عیبری "أمه ها عولام" بە مانای "هەموو نەتەوەکانی جیهان لەبەرامبەر گەلی ئیسرائیل"دا وەردەگێڕێت.

بەڵام بەلامانەوە ئاسانە ئەم ڕا نادروستە بەدرۆ بخەینەوە چونکە "ئوممی" مانای بتپەرست ناگەیەنێت وە پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك مشتومڕ لەگەڵ یەهودییەکان دەکات خۆی بە پێغەمبەرێکی (ئوممی) وەسف دەکات وە ناکرێتو پێچەوانەی واقیعیشە کە پێغەمبەر(ﷺ) خۆی بە ئوممی وەسف بکات و مەبەستیشی (بێباوەڕ) یان ( بتپەرست )بێت چونکە ئەگەر بەو مانایە بێت ئەوا سیفەتی "ئوممی" جۆرێك لە سوکایەتی تێدایەو پێغەمبەریش چۆن بەوشێوەیە وەسفی خۆی دەکات؟.

ـ جگە لەوەش ئایا (فرانتس بول)ڕاستگۆبووە لەوەدا کە گوتوویەتی : "بەڕاستی مایەی سەرسوڕمانە کە موحەممەد وشەیەك لەزمانی یەهودییەکانەوە وەربگرێت کەمانای بەسووك سەیرکردن بگەیەنێت (حياه محمد –ترجمه المانيه هيلد برج, سنه 1955ز) وە بەپێی وتەی (بول) لێکدانەوەی "ئوممی" لە (ئوممەت)ەوە وەرگیراوە کەلەبەرامبەر زاراوەی یۆنانی( لایکۆس _علمانی)دا دێت, هەروەها (بول )وایدەبینێت کە موحەممەد هونەری خوێندنەوەو نووسینی زانیوە بەڵام لە کتێبە پیرۆزەکانی یەهودو نەسارا تێنەگەیشتووە, وە ئەم وتەیەش لەگەڵ واقیعدا یەکدەگرێتەوە, چونکە قورئان زیاتر لەجارێك ڕونی کردووەتەوە..,. لەڕاستیدا گێڕانەوەی پەرستشو چیرۆکە تەوراتییەکان لەلایەن موحەممەدەوە ئەو سوکایەتییانە ئاشکرا دەکات لەکاتێکدا ئەگەر موحەممەد بیتوانیایە نووسینی تەوراتی بخوێنێتەوە ئەوا زەحمەت بوو باسبکرانایە.

کەواتە (بول) وایدەبینێت کە موحەممەد خوێندنەوەو نووسینی زانیوە بەڵام ڕاستەوخۆ تەوراتی نەخوێندووەتەوە ئەگەرنا نەدەتوانرا بۆ چەندین جار لەکاتی گواستنەوە یان تۆمارکردنی گوزارشتو چیرۆکە تەوراتییەکاندا سوکایەتی پێبکرێت, وە بەپێی وتەی (بول) موحەممەد لەتەوراتو ئینجیلەکانی نەزانیوە تەنها لەڕێگەی ئەو کەسانەوە نەبێت کە فێریان کردووە.

وەتاوەکوئەوە ڕوون بکەینەوە کەچۆن ڕاڤەی وشەی "ئوممی" بەپێی ڕای (بول) بکەین کە ئەو وشەیە لە (أمە) واتە گەل –نەتەوە– وە وەرگیراوە, واتە بەمانەی بێدینی دێتو واتە: موحەممەد پیاوێك بووە نەشارەزا بووە بەکاروباری ئاینیو واتە: لەڕووی ئاینیو ئەوەی پەیوەیستە بە پێغەمبەرێکی دامەزرێنەری ئاینەوە نەزان بووە ، ئەم وەسف کردنەش مایەی گاڵتەپێکردنە, ئەگینا چۆن دەبێت موحەممەدی پێغەمبەر (ﷺ) لەبەردەم جولەکەو گاورەکاندا وا خۆی پێناسە بکات کە بەرامبەر بە پرسە ئاینییەکان پیاوێکی نەشارەزاو نەزانە, لەبەرئەوەیە دەبینین کە (بول) زیاتر لە (فنسنك)و (هورفیتز) شتەکانی بەبێ هودە تێکەڵو پێکەڵ کردووە.

ـ نللینو (Nallino) سەبارەت بەو بابەتە وتارێکی بچووکی نووسیوە کە پاش مردنی خۆیو لەمیانەی کۆکارەکانیدا (الاعمال والمخطوطات المنشوره وغیر المنشوره) لەبەرگی دووەمدا ساڵی 1940 لەڕۆما لەلاپەڕەی (60–65)دا لەژێر ناونیشانی (معانی المفردات القرآنیة) بڵاوکرایەوە, دەڵێت: "ئوممی" بریتییە لەو زاراوەیەی کەبەسەر موحەممەدو –ئومەمی–یان ئومیەکاندا دەسەپێت و ئەو ڕایە پەسەند دەکات کە دەڵێت ئومی لە (الامه االعربیه)وە وەرگیراوە, وە ئەمەش ئەو بۆچوونەیە کە لە (لسان العرب)ی (ئیبن منظور)ەوە دەستمان کەوتووە بەڵام ئەو بەکاڵو کرچی هێناویەتیو باسی کردووە بەبێ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە کە عەرەب بەشێوەیەکی گشتی نووسینو خوێندنەوەیان زانیوە, وە (نللینو) وای دەبینێت کە (ئوممی) ڕەهەندێکی دەمارگیرییانەی بۆ نەتەوە هەیە.

ناتوانرێت بەهیچ شێوەیەك ڕای (نیللینو)ش پەسەند بکرێت چونکە لەسەرگریمانەیەکی هەڵە دامەزراوە کە ئەوەیە گوایە موحەممەد بەتەنها نێردراوێکە بۆ نەتەوەی عەرەب هەروەك چۆن (موسا) نێردراوێك بووە بۆ بەنی ئیسرائیلو (عیسا)ش بۆ گەلی فەلەستینی, لەڕاستیدا هەڵەی ئەم گریمانە دەمارگیرییە زۆر ئاشکرایە ئەوەش چونکە:

أـ موحەممەد پێغەمبەر (ﷺ) لە ساڵی (628ز)دا نامەی نارد بۆ هەر چوار پادشاکەی جیهان کەلە سەردەمی خۆیدا بوون ئەوانیش بریتی بوون لە:

(هەرقلی دووەم) ئیمپراتۆری بیزەنتە, نەوشیروانی کیسرای فارس, مقۆقسی فەرمانڕەوای میسرو, هەروەها پادشای حەبەشە, ئەمەش زۆر بەڕوونی ئەوە دەردەخات کە موحەممەد (ﷺ) پەیامەکەی جیهانیو بۆ هەموو نەتەوەکانی جیهان بووە, ئەگەر بەتەنها نێردراوێك بوایە بۆ نەتەوەی عەرەب ئەوا بیری لەوە نەدەکردەوە ئەو چوار نامەیە ئاڕاستەی ئەو فەرمانڕەوایانەی جیهان بکات کەلەو سەردەمەدا ناسرابوونو داواشیان لێبکات خۆیانو گەلەکانیان بێنە ناو ئیسلامەوە.

ب ـ قورئانی پیرۆز بەڕوونی جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە موحەممەدی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ هەموو مرۆڤەکان نێردراوە, خوای گەورە دەفەرموێت (وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا كَافَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيراً وَنَذِيراً وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ) (سبأ : 28 ) هەروەها دەفەرموێت: (مَّا أَصَابَكَ مِنْ حَسَنَةٍ فَمِنَ اللّهِ وَمَا أَصَابَكَ مِن سَيِّئَةٍ فَمِن نَّفْسِكَ وَأَرْسَلْنَاكَ لِلنَّاسِ رَسُولاً وَكَفَى بِاللّهِ شَهِيداً) (النساء : 79 ).

دیسانەوە خوای گەورە دەفەرموێت: (قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُولُ اللّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعاً الَّذِي لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ لا إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ يُحْيِـي وَيُمِيتُ فَآمِنُواْ بِاللّهِ وَرَسُولِهِ النَّبِيِّ الأُمِّيِّ الَّذِي يُؤْمِنُ بِاللّهِ وَكَلِمَاتِهِ وَاتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ) (الأعراف : 158 ) کەواتە گومانی ناوێت کە موحەممەدی پێغەمبەر (ﷺ) نێردراوە لەلایەن خوای گەورەوە بۆ هەموو مرۆڤەکان بەبێ جیاوازی

ڕەگەزو نەتەوەو سنوورو زمانو ڕەنگ, لەڕاستیدا جیهانی بوونی پەیامی موحەممەدی حەقیقەتێکی جێگیرەو هیچ مشتومڕێکی تێدا نییە.

## دووەم: ڕاڤەی ئێمە

لەبەر ڕۆشنایی ئەو حەقیقەتە نەگۆڕەدا ڕاڤەی خۆمان بۆ وشەی (ئوممی) دەخەینە ڕوو کە بەرامبەر بە موحەممەدی پێغەمبەر(ﷺ)بەکار هاتوە.

وشەی (ئوممی) سیفەتێکە وەرگیراوە لە وشەی (امم)–نەتەوەکان– کە کۆی وشەی (امە) واتە نەتەوەیە، هەروەك لە زانستی (صرف)دا روونکراوەتەوە: بۆ ئەوەی وشەکە بدرێتە پاڵ ناوێکی کۆ پێویستە ئەو وشەیە (ئوممی) بگەڕێنینەوە بۆ ناوە تاکەکەی –أمە– لەبەرئەوە بەڕای ئێمە ووشەی –ئوممی– وەرگیراوە لە –امم–ەوە لە کۆیەکدا کە گەڕێنراوەتەوە بۆ –امە– لە ناوە تاکەکەیدا کە واتای جیهانیو چاکەخوازو ئاڕاستەکەر بۆ هەموو نەتەوەکان دەگەیەنێت.

کەواتە (النبي الامي) ئەو پەیامبەرە نێردراوو ئاراستەکەرەیە بۆ هەموو نەتەوەکان، بەواتایەکی ڕاستتر واتە پەیامبەرێکی جیهانی.

بەلاَم سەبارەت بە (الامیین) لە حاڵەتی کۆدا کە چوارجار لە قورئانی پیرۆزدا هاتوە[1] بەواتای مرۆڤەکان دێت لە نەتەوە جیاوازەکانەوە یان هەموو نەتەوەکانەوە.

وە لەبەر ڕۆشنایی ئەم ڕاڤەیەدا دەتوانین بەم شێوەیە لەو چوار شوێنە تێبگەین کە لەخوارەوە ڕوونمان کردۆتەوە:

1ـ خوای گەورە لە ئایەتی 78ی سوورەی **البقرة** دا دەفەرموێت: (وَمِنْهُمْ أُمِّيُّونَ لاَ يَعْلَمُونَ الْكِتَابَ إِلاَّ أَمَانِيَّ وَإِنْ هُمْ إِلاَّ يَظُنُّونَ) (البقره : 78 ) واتە: لەنێوان نەتەوەکاندا کەسانێك هەن لە قورئان تێناگەن بەشێوەیەکی قەڵبو لاوەکی نەبێت، خوای گەورە پەیامبەرێکی لە خۆیان ناردوە بۆ نەتەوەکان واتە مرۆڤێك لە خودی مرۆڤەکان خۆیان نەك خودا بێت و لەشێوەی مرۆڤدا بێت وەك گاورەکان دەڵێن، یان کەسێك بێت لە سەروو مرۆڤەکانەوە بێت وەك جولەکەکان دەڵێن، ڕاڤەکەمان بەتەواوی بەسەر هەر چوار شوێنەکەدا کە لە قورئانی پیرۆزدا زاراوەی (امیین)ی تێدایە جێبەجێ دەبێت. ڕاستەوخۆ بێئەنجامی ئەو ڕاڤەیەمان بۆ دەردەکەوێت کە وشەی (الامیین) بەواتای بتپەرست بۆ لێکدەدەنەوە (سبرنجر– فنسنك– بلاشیر...هتد) بەتایبەتیش کاتێك کە ئەو ئایەتە پیرۆزەی سوورەی البقرە دەخوێنینەوە (وَمِنْهُمْ أُمِّيُّونَ لاَ يَعْلَمُونَ الْكِتَابَ إِلاَّ أَمَانِيَّ وَإِنْ هُمْ إِلاَّ يَظُنُّونَ) لەبەر ئەوە ئەم ئایەتە دەبێتە ناواخنێکی بێ سوود چونکە نەخوێندەوارەکان لە کتێبە پیرۆزەکان نازانن, بۆیە لێرەوە ڕاست نیە لۆمەیان بکرێت لەسەر کارێکی لەو شێوەیە, ئەگەرنا دەمانتوانی سەرزەنشتی مەسیحیەك بکەین چونکە لە نووسراوە ـ بووزییەکان ـ نازانێت... بەم شێوەیە لە کۆتاییدا دەبینین وشەی (ئوممی) کەبەرامبەر موحەممەد پێغەمبەر(ﷺ) بەکار هاتووە واتای(جیهانی)و نێرراو بۆ هەموو نەتەوەکان دەگەیەنێتو وشەی (امیین)یش بەواتای نەتەوەکانو هەموو نەتەوەکان دێت.

لەوانەیە ئەوەش سوودبەخش بێت ئەگەر بەشوێن مێژووی ئەو وشەیەدا –ئوممی– بگەڕێینو لە چۆنیەتی بەکارهێنانی لەلایەن شاعیرو پەخشان نووسەکانەوە بکۆڵینەوە بەلای کەمیشەوە لە ماوەی ئەو پێنج سەدەیەی یەکەمی کۆچیدا، جا دەبینین تا چ ڕادەیەك (ئوممی) واتای ئەوەی گەیاندووە کە کەسێکە نووسینو خوێندنەوەی نەزانیبێت.

---

[1] سورەتی (البقرة) ئایەتی 78, آل عمران ئایەتی (20– 75)– الجمعة ئایەتی (29).

چەند سەدەیەکی زۆرە لێکۆڵینەوە بەردەوامە لە سەرچاوە تەوراتیەکانو ئەوانەی وەك تەورات وەهان لە قورئاندا کە بریتین لە (تەلمود ئەوەی پەیوەستە بە جوولەکەوەو ئینجیلەکان کە پەیوەستن بە مەسیحیەتەوە)، بەلأم سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم ئەو لێکۆڵینەوانە شێوازی تا ڕادەیەك زانستیان بەخۆوەگرتو چەندین کتێبو بلأوکراوە بۆ ئەو بابەتە تایبەت کران، لەوانەش هەیان بوو بەشێوەیەکی بەرفراوان بلأودەبوویەوەو هەشیان بوو بلأوبوونەوەکەیان سنوورداربوو، ئەو لێکۆڵینەوانەش دابەش دەکەین بە دوو بەشەوە:

یەکەمیان: ئەو کتێبو لێکۆڵینەوانەی کە ئاڕاستەیەکی یەهوودی یان پەیوەستن بە یەهوودیەتەوە.

دووەمیان: ئەو کتێبو لێکۆڵینەوانەی کە ئاڕاستەیەکی مەسیحی یان پەیوەستن بە مەسیحییەتەوە.

**ئەو کتێبانەی کە خواستێکی یەهوودییانەیان هەیە لەوانە:**

1ـ أبراهام جیجر: "ماذا أخذ محمد من النصوص الیهودیة؟" واتە: "موحەممەد چی لە دەقە یەهوودیەکانەوە وەرگرتوە؟" بۆن– ساڵی (1833ز) –چاپی دووەم– لیبزج ساڵی (1902ز)و ساڵی (1969ز) چاپ کرایەوە.

2ـ هیر شفیلد:1– العناصر الیهودیه فی القرآن "ڕەگەزە یەهوودیەکان لە قورئاندا"– بەرلین(1878ز).

ـ وتارێك لەڕاڤەی قورئاندا– لیبزج ساڵی (1886ز) – چەند لێکۆڵینەوەیەکی نوێ لە تێگەیشتنو ڕاڤەی قورئاندا– لەندەن ساڵی(1902ز).

3– سیدرسکی: أصل الاساطیر الاسلامیة في القرآن – واتە: "بنچینەی ئەفسانە ئیسلامیەکان لە قورئاندا" پاریس ساڵی (1933ز)

4– هاینریش سبرنجر: (چیرۆکەکانی ئینجیل لە قورئاندا) (قصص الانجیل فی القرآن) پاریس، چاپی 5– برلینو لیبزج ساڵی(1929ز)

5– هورفیتز: (بحوث قرآنیة) (لێکۆڵینەوە قورئانیەکان)، برلینو لیبزج ساڵی(1926ز).

ـ (الاسماء الیهودیة ومشتقاتها فی القران) (ناوە یەهودیەکانو وەرگێراوەکانیان لە قورئاندا) –ساڵانەکانی کۆلێجی عیبری، بەرگی یازدەهەم ساڵی (1925ز)، لاپەڕە (145–227)

6– أسرائیل شابیرو: (الحکایات التوراتیة فی اجزاء القران) (حیکایەتە تەوراتیەکان لە بەشەکانی قورئاندا) بەرلین ساڵی (1907ز).

**ئەو کتێبانەی کە ئاڕاستەیەکی مەسیحیان هەیە ناوی ئەمانەیان دێنین:**

1–ریچارد بیل: –اصل الاسلام فی بیئه المسیحیه–(بنچینەی ئیسلام لە ژینگە مەسیحیەکەیدا) لەندەن ساڵی (1926ز)و ساڵی (1968ز)چاپکراوەتەوە.

–مقدمه فی القران– (پێشەکیەك لە قورئان) اندنبرج ساڵی (1935ز)

2– تور اندریا: (اصل الاسلام و المسیحیه) (بنچینەی ئیسلامو مەسیحیەت) اوبسلو ساڵی(1926ز).

ئێستاش هەڵدەستین بە شیکردنەوەی میتۆدو ڕێبازی ئەم کتێبانە :

نووسەرانی هەموو ئەم کتێبانەی ناومان بردن جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە موحەممەد(ﷺ)بە ووتەی ئەوان کە دانەری قورئانە زۆربەی چیرۆکو ژمارەیەکی زۆر وێنەدەرخستەکانو هەروەها حوکمو نمونەکانی لە کتێبە پیرۆزەکان یان نیمچە پیرۆزەکانی یەهوودو نەسرانیەکانەوە وەرگرتوە.

بۆ ئەوەی گریمانەی ڕاستی ئەوەی کە وتراوە بکەین، پێویستە کە (موحەممەد) عیبریو یۆنانیو سریانی زانیبێت، وە پێویستە کتێبخانەیەکی گەورەی هەبووبێت کە هەموو دەقەکانی تەلمودو ئینجیلە مەسیحیەکانو هەموو جۆرە کتێبێکی وێردو بڕیارەکانی سەرجەم کەنیسەکانو مەزهەبە مەسیحیەکانی تێدابوبێت.

دە ئایا ئەم قسە نامۆیەی ئەم نووسەرانە کە هیچ بەڵگەیەکیان لەسەری نیە ڕێی تێدەچێتو عەقڵ قبوڵی دەکات؟

ژیانی پێغەمبەر (موحەممەد) (ﷺ) بەر لە دەرکەوتنی پەیامەکەیو دوای پەیامەکەشی هەرهیچ نەبێت ڕووکارەکانی دەرەوەی ژیانی لای هەمووان ئاشکرایەو نەزانراو نییە وە هیچ کەسێك نە لەکۆنو نە لە ئێستاشدا ناتوانێت ئەوە دوپات بکاتەوە کە موحەممەد (ﷺ) زمانی عیبری زانیبێت، ئیتر چۆن دەتوانێت وەك دەڵێن سوودی لەو سەرچاوانە وەربگرێت؟!

ڕەخنەیەکی ڕیسواکەری دیکەی ئەو نووسەرانە ئەوەیە کە پشت بەو قیژو هوڕە دەبەستێت کە دەڵێت لە قورئاندا لاسایی کردنەوە هەیە، ئەمەش کاتێك ڕوودەدات کە قورئان حەقیقەتێکی گشتی باسدەکات کە لە کتێبەکانی یەهوودیەتو نەسرانیەکاندا باسکراوە.

وەك ئەوەی تاوەکو قورئان بێتاوان بێت لە هەر لاسایی کردنەوەیەك دەبێت قسەگەلێك بکات کە پێچەوانەی زانستی گشتیو هۆشمەندی بێت.

لە هەموو جارێکیشدا ئەو نووسەرانە ووشەیەك یان دوو ووشە دەدۆزنەوە کە لە قورئانو هەر بەشێك لە بەشەکانی تەوراتدا لەیەك دەچنو دەست دەکەن بە بەرامبەریکردن لە نێوانیانداو لەوانەشە گەوجیو کەودەنی لەوە دوورتریشیان ببات...

(هیر شفیلد) بە مامۆستای ئەم ئاراستە نەزۆکو بیٚ ئەنجامە دادەنرێت.

**یەکەم: بۆچوونەکانی هیر شفیلد** (1854-1934ز)

هیرشفیلد وا دەبینێت کە چەند لێکچوونێك لە نێوان قورئانو تەوراتدا هەیە:

- ئایەتی (5) (الشَّمْسُ وَالْقَمَرُ بِحُسْبَانٍ) (الرحمن : 5 ).
- ئایەتی (6) (وَالنَّجْمُ وَالشَّجَرُ يَسْجُدَانِ) (الرحمن : 6 ).
- ئایەتی (7) (وَالسَّمَاءَ رَفَعَهَا وَوَضَعَ الْمِيزَانَ) (الرحمن : 7 ).
- ئایەتی (9) (وَأَقِيمُوا الْوَزْنَ بِالْقِسْطِ وَلَا تُخْسِرُوا الْمِيزَانَ) (الرحمن : 9 ).

سفر المزمور 136 (العهد القديم)

- ئایەتی (8) "الشمس لحکم النهار"
- ئایەتی (9) (والكواكب لحكم الليل).
- ئایەتی (5) (الصانع السموات بفهم).
- ئایەتی (6) (الباسط الارض على المياه)

من داوا لە خوێنەر دەکەم تێبینی هەردوو دەقەکە بکاتو ڕووە لێکچووەکانم بۆ ڕوون بکاتەوە کە لەنێوانیاندا هەیە.

لە ڕاستیدا هیچ لێکچوونێك لە نێوانیاندا نییە، قورئان لێرەدا باس لە شەقڵو هێمای بازنەیی جوڵانەوەی خۆرو مانگ دەکات، لەکاتێکدا (مەزمور) بەهیچ شێوەیەك باس لەوە ناکات، هەروەها قورئان جەخت لەسەرئەوە دەکاتەوە کە گژوگیاو داردرەخت کڕنۆش بۆ خوای گەورە دەبەن، بەڵام ئەم بیروڕایە بەتەواوەتی لە (مەزمور)دا وونە. هەروەها (مەزمور) باس لەو حیکمەتە دەکات کە خوای گەورە ئاسمانەکانی پێدروستکردوە، بەڵام قورئان جگە لەکاری خوای گەورە لە

بەرزکردنەوەی ئاسمانەکان زیاتر باس لە شتی تر ناکات. لەمیانەی ئایەتی ژمارە (9)دا قورئان جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە خوای گەورە زەوی بۆ بەرژەوەندی سەرجەم مرۆڤایەتی داناوە، لەکاتێکدا ئایەتی (6) لە مەزمور تەنها لەبارەی دیاردەیەکی جوگرافی سادەوە دەدوێت کە بریتیە لەوەی کە زەوی بەسەر ئاودا ڕاکشاوە.

کەواتە کوان ڕوخسارەکانی لێکچوون لە نێوان قورئانو مەزموورەکانی ئەم دەقەدا؟ چ گومانێك وای لە (هیرشفیلد) کردوە باوەڕی بە بوونی ئەو لێکچونانە یان تەنانەت لێوەرگرتنانەی لێرەدا هەبێت!

هەر هەمان ئەو گومانانە وایان لە (هیرشفیلد) کردوە کە باوەڕی بە لێکچوونی نێوان (سورەی النحل)و (مەزموری 104)دا هەبێت:

(2)

(أ)

سورەتی النحل

ئایەتی 2: (يُنَزِّلُ الْمَلآئِكَةَ بِالْرُّوحِ مِنْ أَمْرِهِ عَلَى مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ أَنْ أَنذِرُواْ أَنَّهُ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ أَنَاْ فَاتَّقُونِ) (النحل : 2 ).

مەزموری (104)

ئایەتی (4): (الصانع ملائكته رياحا وخدامه نارا ملتهبة).

قورئانی پیرۆز لە ئایەتی (2)ی سوورەی (النحل)دا باس لە ویستو دەسەڵاتی ڕەهای خوای گەورە دەکات لەوەدا کە لەناو مرۆڤەکانداو لەناو بەندەکانی خۆیدا کەسێك هەڵبژێرێت بۆ ئەوەی کاروباری پیرۆزی پێغەمبەرایەتی رابپەڕێنێت، وە خوای گەورە فریشتەیەکی وەك (جیبریل)(سەلامی خوای لێبێت) دەنێرێت بۆ ئەوەی لەو بارەیەوە فەرمانی خوای گەورەی پێ ڕابگەیەنێت، بە پێچەوانەشەوە (ئایەتی4) لە (مەزموری 104) جگە لە دیاردەکانی کەشو هەواو سروشتەوە لەبارەی هیچی ترەوە نادوێت!!

گەشتەکەمان لەگەڵ (هیرشفیلد)و ئەو لێکچوونانەی کە ئەو دەیانلێت لە نێوان (سوورەی النحل)و(مەزموری104)دا درێژە پێدەدەین:

(ب)

سورەتی النحل

ئایەتی (3) (خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ بِالْحَقِّ تَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ) (النحل : 3 ).

مەزموور (104) ئایەتی (2) (اللابس النور كثوب الباسط السموات كسفة).

ئایەتی (5) (المؤسس الارض على قواعدها).

جارێکی تریش زۆر بە سەرسوڕماویەوە لە خۆم دەپرسم، هیرشفیلد بوونی پەیوەندی نێوان ئەم دوو دەقەو هەڵسەنگاندنی نێوانیانی چۆن چۆنی بۆ دەرکەوتو پوختەی کرد؟

ئایەتە قورئانیەکە باس لە دانایىو دەسەڵاتی خوای گەورە دەکات لە درووستکردنی ئاسمانەکانو زەویدا لە گونجاندنێکی تەواودا بەبێ ئەوەی هیچ کامیان بکەون بەسەر ئەوی تریاندا، کە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هیچ پەرستراوێکی دیکە جگە لە خوای تاکو تەنهاو بێ هاوەڵ نییە. لە بەرامبەریشدا (مەزموور) جگە لە ساواگۆییەکی دەگمەن باسی هیچی تر ناکات، ئەویش ئەوەیە ئاسمانەکان وەك ڕاخەرنو زەویش لەسەر چەند پایەو بنەمایەکی جێگیر ڕاوەستاوە.

(ج)

سورەتی النحل

ئایەتی (10) (هُوَ الَّذِي أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً لَّكُم مِّنْهُ شَرَابٌ وَمِنْهُ شَجَرٌ فِيهِ تُسِيمُونَ)

مەزموورى (104) (المسقف علالية بالمياه الجاعل السحاب مركبة الماشي على أجنحة الريح).

زۆر ئاشكرايە كە هەردوو دەقەكە لە دووشتى جياواز دەدوێن، قورئان باس لەو نيعمەتە گەورەيە دەكات كە بەخشراوەتە مرۆڤەكان بۆ ئەوەى خۆيانو ئاژەڵەكانيان پێى بژينو ئەو نيعمەتەش بارانە كە خواى گەورە لە ئاسمانەوە دەيبارێنێت، لەكاتێكدا (مەزموور) باس لەو شوێنو هۆكارانە دەكات كە خواى گەورە بەكاريان دێنێت.

كەواتە هيچ پەيوەندييەك لەنێوان ئەو دوو بابەتە باسكراوەدا نييەو لەلايەكى ديكەشەوە ئايەتەكەى (مەزموور) بەرجەستەو ماديىەو مەحاڵە دەنگدانەوەى لە قورئاندا هەبێت، چونكە وێنەيەكى ناشيرينو جياوازە لەگەڵ تێگەيشتنى ئيسلامىو قورئانيدا بۆ خواى گەورە.

(د)

سوورەتى النحل

ئايەتى (11) (يُنبِتُ لَكُم بِهِ الزَّرْعَ وَالزَّيْتُونَ وَالنَّخِيلَ وَالأَعْنَابَ وَمِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَةً لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ)

مەزموورى (104) (المنبت عشبا للبهائم وخضرة لخدمة الأنسان لاخراج خير من الارض).

ئايەتى (15) (وخمر تفرح قلب الأنسان لا لماع وجه أكثر من الزيت وخبز يسند قلب الانسان).

قورئانى پيرۆز باس لە باران دەكات كە بە هۆيەوە دانەوێڵەو زەيتوونو خورما سەوز دەبن، بەڵام (مەزموور) ڕاستەوخۆ لە خواى گەورە دەدوێتو نيعمەتى ئارەقو شەراب دوادەخات، لەكاتێكدا بەهيچ شێوەيەك قورئان باس لەو ئارەقو شەرابە ناكات كە دڵەكان زيندوودەكاتەوەو دەمووچاوەكان دەگەشێنێتەوە، ئەمەش قسەيەكە بە تەواوى پێچەوانەى ئەو فەرموودەيەى خواى گەورەيە كە لە سوورەى (البقره) ئايەتى (219)ى قورئانى پيرۆزدا فەرموويەتى (يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَا أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا وَيَسْأَلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ الْعَفْوَ كَذَلِكَ يُبيِّنُ اللّهُ لَكُمُ الآيَاتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ)

هەروەها لە ئايەتى (91)ى سوورەى المائدە:

(إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاء فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ اللّهِ وَعَنِ الصَّلاَةِ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ) .

كەواتە بەواتايەكى ڕاستتر هەردوو دەقەكە هيچ پەيوەندييەك لە نێوانياندا نييە.... بەڵكو هەردووكيان بە تەواوەتى لە يەكتر جياوازن، لە سەروو ئەوەشەوە (مەزموور) بەشێوەيەكى گشتگير لە ڕووەكەكان دەدوێت، لەكاتێكدا قورئان باس لە چەند ڕووەكێكى دياريكراو دەكات كە زەيتوونو خورماو ترێيە.

(هـ)

سوورەتى النحل

ئايەتى (14) (وَهُوَ الَّذِي سَخَّرَ الْبَحْرَ لِتَأْكُلُواْ مِنْهُ لَحْماً طَرِيّاً وَتَسْتَخْرِجُواْ مِنْهُ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا وَتَرَى الْفُلْكَ مَوَاخِرَ فِيهِ وَلِتَبْتَغُواْ مِن فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ) (النحل: 14 )

مەزموورى (104)

ئايەتى (25) (هذا البحر الكبير الواسع الأطراف هناك دبابات بلا عدد صغار حيوان مع كبار).

ئايەتى (26) (هناك تجري السفن لوياثان هذا خلقته ليلعب فيه).

هەردوو دەقەكە لە دەريا دەدوێن بەڵام بەشێوەيەكى تەواو جياواز، قورئانى پيرۆز لە بارەى ئەو بەخششانەوە دەدوێت كە پەيوەنديان بە دەرياوە هەيە وەك ماسييەكان وبەو بەخششانە دەيانژمێرێت كە خواى گەورە بەخشيونيەتە مرۆڤەكان،

لەکاتێکدا(مەزموور) بە گاڵتەوە باس لە وەسفکردنی دەریا دەکات بەوەی کە دەڵێت خوا تیمساحی درووستکردووە بۆ ئەوەی لە دەریادا یاری بکات.

(و)

سورەتی النحل

ئایەتی (38) (وَأَقْسَمُواْ بِاللّهِ جَهْدَ أَيْمَانِهِمْ لاَ يَبْعَثُ اللّهُ مَن يَمُوتُ بَلَى وَعْداً عَلَيْهِ حَقّاً وَلـكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لاَ يَعْلَمُونَ) (النحل : 38).

ئایەتی (65) (وَاللّهُ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاء مَاءً فَأَحْيَا بِهِ الأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَةً لِّقَوْمٍ يَسْمَعُونَ) (النحل : 65 ).

ئایەتی (70) (وَاللّهُ خَلَقَكُمْ ثُمَّ يَتَوَفَّاكُمْ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَى أَرْذَلِ الْعُمُرِ لِكَيْ لاَ يَعْلَمَ بَعْدَ عِلْمٍ شَيْئاً إِنَّ اللّهَ عَلِيمٌ قَدِيرٌ) (النحل : 70).

مەزموور (104) ئایەتی (29) (تحجب وجهك فترتاح تنزع أرواحها فتموت والى ترابها تعود).

چ بۆچوونێکی خەیاڵاوییە پاڵی بە (هیرشفیلد)ەوە ناوە بڕوای وابێ ئەم چوار ئایەتە دەوڵەمەندە بە چەندین فیکرو بیری قوڵەوە دەنگدانەوەی ئەو ووشە کەمانەی ئایەتی (29)ی (مەزمور)ی (104)بن؟

قورئانی پیرۆز لێرەدا باس لەمەسەلەی زیندووبوونەوەی مردووەکان دەکاتو ڕایدەگەیەنێت کە ئەوە دەبێتو دەکرێت مادام زەوی لە پاش مردنی بەهۆی بارینی بارانەوەو بە ویستی خوای گەورە زیندوو دەبێتەوەو دەبوژێتەوە بەڵام (مەزموور) جگە لەباسکردنی (با) یەك کەخوای گەورە دەینێرێت و مرۆڤەکان دەمرێنێت باسی هیچی دیکە ناکات.... قورئانی پیرۆز باس لە زیندووبوونەوەی مردووەکان دەکات، لەکاتێکدا مەزموور بە ڕەهایی باس لە مردن دەکات کەواتە قورئانو مەزموور لێرەدا بەگشتیو تەواوەتی لەیەکتر جیاوازنو بەلای کەمیشەوە هەریەکەیان باس لە شتێك دەکات بەتەواوی لە یەك جیاوازن.

(ز)

سورەتی النحل

ئایەتی (42) (الَّذِينَ صَبَرُواْ وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ) (النحل : 42 ).

مەزموور (104)

ئایەتی (27) (كلها إياك تترجى لترزقها قوتها فى حينه)

هەردوو دەقەکە باس لە هەمان شت ناکەن... چونکە قورئانی پیرۆز باس لە خۆڕاگریو ئیمانو پشت بەستن بە خوای گەورە دەکات، بەڵام (مەزمور) باس لەو هیوایە دەکات کە مرۆڤەکان هەیانە بۆ ئەوەی لە هەرکاتێکدا بیانەوێت خوای گەورە خۆراکیان پێببەخشێت، وە قورئان باس لە نموونە باڵاو چاکەکان دەکات کە پێویستە باوەڕداران خۆیانی پێ برازێننەوە،بەڵام (مەزمور) جگە لەپێویستیەکانی ورگ باس لە شتی تر ناکات.

(ح)

سورەتی النحل

ئایەتی (49) (وَلِلّهِ يَسْجُدُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ مِن دَآبَّةٍ وَالْمَلآئِكَةُ وَهُمْ لاَ يَسْتَكْبِرُونَ) (النحل : 49 ).

مەزموور (104)

ئایەتی (33) (أغنى للرب فى حياتى أرنم لالهى مادمت موجودا).

هیچ پەیوەندییەك لە نێوان دوو دەقەكەدا نییە، چونكە قورئانی پیرۆز لێرەدا باس لە هەموو دروستكراوەكان دەكات لە ئاسمانەكانو لە زەویدا هەروەها لە فریشتەكانیش وە جەخت لە سەرئەوە دەكاتەوە كە ئەوانە هەموویان كڕنووش بۆ خوای گەورەو بالآدەست دەبەن، لە مەزموردا تەنها تاكە كەسێك خۆی ستایشی خوا دەكات...

بەلآم لە قورئاندا سەرجەم درووستكراوەكان ستایشی خوای گەورە دەكەن...ئای لەو تاقانەییەی كە لە مەزموردا هەیەو ئای لەو جیهانبینیەش كە لە قورئاندا هەیە.

(ط)

سورەتی النحل

ئایەتی (50) (يَخَافُونَ رَبَّهُم مِّن فَوْقِهِمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ) (النحل : 50 ).

مەزموور (104)

ئایەتی (34) (فیلذ له نشيدي وأنا أفرح بالرب).

هەمان خۆپەرستی لە (مەزمور)وملكەچیو گوێڕایەڵیو بێ فیزیش لە قورئاندا.

(ی)

سورەتی النحل

ئایەتی (61) (وَلَوْ يُؤَاخِذُ اللّهُ النَّاسَ بِظُلْمِهِم مَّا تَرَكَ عَلَيْهَا مِن دَآبَّةٍ وَلَكِن يُؤَخِّرُهُمْ إلَى أَجَلٍ مُّسَمًّى فَإِذَا جَاء أَجَلُهُمْ لاَ يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلاَ يَسْتَقْدِمُونَ) (النحل : 61 ).

مەزموور (104)

ئایەتی (35) لتبد الخطاة من الارض والأشرار لايكونوا بعد باركي يا نفس الرب).

لێرەدا قورئانی پیرۆز ئەوە ڕووندەكاتەوە كە بۆچی خراپەكاران لە دونیادا سزا نادرێن، بەلآم مەزمور بە پێچەوانەی ئەوەوە داوا دەكات كە گوناهكاران لەسەر زەویدا بەدیار نەكەونو بێ باوەڕانیش یەكسەر لەناوبچن، لەڕاستیدا بەدواداچوونی قورئان بەتەواوی لەو بەدواداچوونەی مەزمور جیاوازە.

(ك)

سورەتی النحل

ئایەتی (79) (أَلَمْ يَرَوْاْ إِلَى الطَّيْرِ مُسَخَّرَاتٍ فِي جَوِّ السَّمَاء مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلاَّ اللّهُ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ) (النحل : 79 ).

مەزموور (104)

ئایەتی (12) (فوقها الماء طيور السماء تسكن).

ئایەتی (17) (حيث تعيش هناك العصافير أما اللقلق فالسرو بيته).

قورئانی پیرۆز لێرەدا باس لەنیشانەیەك لە نیشانەكانی خوای گەورە دەكات كە بریتیە لەوەی كە باڵندە لەناو بەرگە هەوای ئاسماندا بەهۆی تواناییو دەسەلآتی ڕەهای خوای گەورەوە مەلەدەكات بە پێچەوانەی یاسای ڕاكێشانی زەویەوە، بەلآم مەزمور ئەوە ڕووندەكاتەوە كە باڵندەكان نزیك بە سەرچاوەی ئاوەكان بەیەك دیاردەكەونو لە نێوان گەلآی دارەكاندا دەژین بەبێ ئەوەی ئاماژە بەو توانایەی خوای گەورە بدات كە باڵندەكان لە ئاسماندا ئاراستە دەكات.

ئەم نموونانە بەسن بۆ ڕوونكردنەوەی ئەو شێوازو ڕێگەیەی كە(هیرشفیلد) مامەڵەی پێكردوەو تێی گەیشتوە لە كتێبەكەیدا بەناوی (بحوث جديدة فی فهم و تفسیر القران) (چەند لێكۆڵینەوەیەكی نوێ لە تێگەیشتنو ڕاڤەی قورئاندا)

–لەندەن ساڵی (1902ز)–... وای نیشانداوە کە چەند ڕوویەکی چوون یەکو هاوشێوە هەیە لەنێوان قورئانی پیرۆزو مەزموردا بەڵام لە ڕاستیشدا هیچ شتێکی لەو جۆرە بوونی نییە.

ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێت کە ناویراو بوەتە قوربانیی نەخۆشی سەرلێتێکچوونو هۆکەشی ئەو دەمارگیریە کوێرانەیە کە تێکەڵە بە لەخۆڕازیبوون ولە خۆبایی بوون...ئەو کاتێك بڕیار دەدات کە قورئان ئەو دەقە نوسراوەی ئیسلام شتێك نییە جگە لە هەڵگێڕانەوەیەکی تەورات نەبێت دەگاتە کۆتایی بێمانابیەکەی، (سەرچاوەی پێشوو)–پێشەکی– لاپەڕە (11).

ئێمە دیسانەوە ئەم نەخۆشییە کوێرانەیە لە وتاری (العناصر اليهودية في القران)دا هەست پێدەکەین هەروەها لە کتێبەکەیدا بەناوی (مساهمات حول تفسير القران) ليبزج (1886ز) لەبەرئەوە ئەم کتێبانە شیاوی ئەوە نین دیراسەیان بکەین.

ئێستاش ڕای هەندێك لە زانایان دەربارەی کارەکانی (هیرشفیلد) دەخەینەڕوو:

أ- (سیدرسکی) دەڵێت: پاش ئەوەی ناونیشانی کتێبەکانی (هیرشفیلد) خرانە ڕوو، "بەداخەوە ئەو زانایە هیچ شتێکی زیادنەکردوە کە شایەنی باس بێت لەوەی کە پەیوەستە بە بنەچەی داستانە قورئانیەکان"(اصول الاساطير الاسلامية) پاریس (1933)لاپەڕە(2) ژمارە (1).

ب - لەبەشی دووەمی کتێبەکەیدا (القران تعليق و تحليل)(شتوتگارت) (1971ز)لاپەڕە (12) (ڕودی باریت) لە کتێبەکەی (هیرشفیلد)(بحوث حديثة) لاپەڕە(101–103) ئەو پیتانەی لەسەرەتای هەندێك سوورەتدا هاتوون دیاری دەکات، بەڵام سەرچاوەکەی وردنییە چونکە لە لاپەڕە (141–142)دایە نەك لاپەڕە(101–103)لە کوێدا کە(هیرشفیلد) مەسەلە ڕیشەییەکانی وەرگرتووە، وە باس لە ڕایەکی دیکەی (هیرشفیلد)دەکات کە پەیوەستە بە وشەی (حطة) لە سوورەی (البقرة)ئایەتی(58) (و أذ قلنا أدخلوا هذه القرية......)

هیرشفیلد دەڵێت: لەوانەیە وشەی (حطة) لە شێوازی دانان بە گوناهدا وەرگیرابێت کە دەگەڕێتەوە بۆ (مشناه) بەڵام (باریت) لەبارەی ئەم ڕایەی هیرشفیلدەوە کە ڕایەکی هەڵەیە هیچ ناڵێت، چونکە لەو بابەتەدا کە (هیرشفیلد) شایەتی لەبارەوە دەدات وشەی (حطة) یان وشەیەك بەهەمان واتاو دەربڕین یان نزیك بێت لێیەوە لە (مشناه)دا نییە، ئەمەش جارێکی تر ئەوە دووپات دەکاتەوە کە هیرشفیلد بەبێ بەڵگەو دیکومێنتێك کە پشتی پێ ببەسترێت هەموو شتێك دەڵێت، وە (باریت) لە لاپەڕە (19–20)ی کتێبەکەی (القران تعليق و تحليل) چەند ڕایەکی دیکەی (سبییر) دەخاتە ڕوو کە پەیوەستن بە ڕاڤەی وشەی (حطة)وە کە بەردەوام ئەوە دەخوازن کە ئەوە وشەیەکی عیبریە یان لە ووشەیەکی عیبرییەوە وەرگیراوە.

لە ڕاڤە ئیسلامیەکاندا وشەی (حطة) بە پێی ئەوەی کە عەرەبیە واتای (لە گوناهەکانمان خۆش بە) دەگەیەنێت یان (گوناهەکانمان لە کۆڵ بکەرەوە) هەروەك (بلاشیر) بەبێ دوو دڵی بە وشەی (لێبوردن) وەریگێڕاوە.(سبییر) دەڵێت وشەی (حطة) وەرگیراوی وشەی عیبری (حطنو) یە لە ئایەتی (40)ی کتێبی چوارەمی موسا (سفر العدد) لەو شوێنەدا کە دەڵێت:"سبەینێ بەیانی زوو دەکەونە ڕێ بەرەو لوتکەی چیاکەو دەڵێن ئێمە ئامادەین بەرەو ئەو شوێنە بڕۆین کە خوا بۆمانی دیاری کردووە چونکە ئێمە گوناهمان کرد" لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەم ئایەتە لەگەڵ ئەو واتا مەبەست دارەدا دەگونجێت، کەچی (سبییر) دەڵێت:"موحەممەد گومانی وابووە کە ئەو یەهوودیانەی ئامادە نەبوون بچنە ناو زەوی پیرۆزەوە لەوانەیە مەبەستیان مانایەکی لاوەکی بێت بەپێی ئەوە ڕای پێشوویان پشت ڕاست دەکەنەوە (ارسی حطة) واتە (الارض الحنطة) کەواتە دەکرێت ئیسرائیلیەکان بڵێن حطانوا بەڵام بەبێ ئەوەی مەبەستیان واتا ڕاستەکە بێت بەڵام مەبەستیان میوەی ئەو زەویە پیرۆزە بێت نەك فەرمانی خوا، (سبییر) (الخطابات التوراتية في القران) لاپەڕە (733).

بەلآم ئەم ڕاڤەیەی (سبییر) سەرلێتێکدەرانەو ئالۆزەو زەحمەتە ڕاڤەیەکی حەقیقی بێت ئەو پشت بەو وتەیە دەبەستێت کە ئیسرائیلیەکان ئەو کاتە ڕووبەڕووی زەوی پیرۆز بوون... موسا چەند کەسێکی نارد تاوەکو زانیاری لەسەر ئەو ولآتە بزانن‌و پەی پێ بەرن وە لە کاتی گەڕانەوەیان لە جێ بەجێ کردنی ئەرکەکەیان ستایشی ئەو ولآتەیان کرد پاشان هەستیان بە گوناە کرد لە بەرامبەر ئەو درۆیانەدا.

"لە سبەینێداو لەبەیانی زوودا بەرەو لووتکەی چیاکە بەڕێدەکەون‌و دەڵێن ئێمە ئامادەین بۆ ڕۆیشتن بەرەو ئەو شوێنەی کە پەروەردگار دەیەوێت، چونکە ئێمە هەڵەمان کرد (حطانو)" بەلآم لەجیاتی ئەوەی نیازیان بەو وشەیە واتا حەقیقیەکەی بێت بە واتایەکی دیکە بەراوردیان کرد بەگوێرەی سەرزەنشتی (محمد) وەك (سبییر)دەڵێت وە بیریان لە ووشەی (حطة) بەواتای (حنطة) گەنم کردەوە ... ئای کە ڕاڤەکردنێکی گونجاوو شیاوە ئەوەی وای دادەنێت کە (موحوممەد) زانایەکی نایاب‌و شارەزابووە بە زمانی عیبری، ئەگینا لە کوێوە توانی سەرزەنشتی ئیسرائیلیەکان بکات؟

ئەگەر لە یەهوودیەکانی شاری (مەدینە)وە وەری گرتبێت کەواتە چۆن ئەو سەرزەنشتەمان لە ئەدەبی یەهوودیدا بۆ ڕووندەکاتەوە ! وە ئەم هەموو لێهاتنە درۆیینە لە پێناوی ڕوونکردنەوەی گریمانەیەکی هەڵەدایە کە بریتیە لەوەی گوایا ووشەی (حطة) بنچینەیەکی عیبری هەیە.

ئەو درۆ دادەتاشێتو دەبێتە قوربانیی ئەو درۆیە چونکە ناچارە کە بە هەموو شێوەیەك حەقیقەتی درۆ داتاشراوەکەی ڕوون بکاتەوە. ئا ئەوە هەڵسوکەوتی زانا گومانبردووەکانە بەلآم دەرەنجامێکی لۆژیکی یە بۆ ئەو بیرورا کالۆکرچانە کە لێکۆڵیارە یەهوودیەکان دەیخەنە ڕوو لە هەوڵێکدا بۆ دۆزینەوەی ئاسەواری عیبری لە قورئانی پیرۆزدا.

تەنانەت (هورفیتز) لە کتێبی (الاسماء الیهویة الحقیقیة)لاپەڕە(54)دا دان بەوەدا دەنێت کە ئەو ڕاڤەیەی (هیرشفیلد)و (سیدرسکی) دەیخەنە ڕوو بەس نییە.

لە کۆتاییدا دووپاتی دەکەینەوە کە ئەو سێ لێکۆڵینەوەیەی (هیرشفیلد) کە تایبەتی کردوون بە پەیوەندی لە نێوان قورئانی پیرۆزو کتێبی پیرۆزی یەهوودیدا هیچ بەهاو ئەرزشێکی نییە چونکە لەسەر چەند لایەنێکی نیمچە گریمانەیی‌و بیروڕای کرچوکالۆ چەند پێشەکییەك کە هیچ بناغەیەکیان نییە دامەزراون، وە بەشێوەیەکی گشتی لە ڕووی تێگەیشتنەوە لاوازن، وە خەلآتو پاداشتەکەی لە بەرامبەر ئەو خاسیەتانەدا ئەوە بوو لە ساڵی (1924ز) دا هیرشفیلد کرایە مامۆستای زانکۆی لەندەن.

**دووەم: كلیر مون جانو**

لە یەكچوونی نوور– (سوورەتی نوور ئایەتی 35)

ئێستا ڕوویەڕووی چەند ڕوویەكی دیكەی لێكچواندن دەبینەوە كە كۆمەڵێك لە زانا ڕۆژهەلاتناسەكان شوێنی كەوتوون:

ـ د.ب–ماكدونالد: مادة–الله (موسوعه الاسلام) چاپی یەكەم.

ـ ر–بیل: (جذور الاسلام) لاپەڕە (115).

ـ كلیر مون جانو: (المصباح و شجرة الزيتون في القران) گۆڤاری مێژوی ئایینەكان ژمارە (81) ساڵی (1920ز) لاپەڕە (209–213).

ـ سبییر: (القصص الانجيلية في القران) لاپەڕە (62–66–430).

ـ فر–بهل سبییر: دەربارەی بەراوردو لێكچوونەكان لە قورئاندا (المجله الشرقيه) ژمارە (2)ساڵی (1924ز)لاپەڕە (1–11).

وە ئەو ئایەتانە باس لە نموونەی ئەو (نوور)ە خواییە دەكەن كە لە سوورەتی )(نوور) ئایەتی (35)دا وەسفی دەكاتو خوای گەورە دەفەرموێت: (اللَّهُ نُورُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ مَثَلُ نُورِهِ كَمِشْكَاةٍ فِيهَا مِصْبَاحٌ الْمِصْبَاحُ فِي زُجَاجَةٍ الزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوْكَبٌ دُرِّيٌّ يُوقَدُ مِن شَجَرَةٍ مُّبَارَكَةٍ زَيْتُونِةٍ لَّا شَرْقِيَّةٍ وَلَا غَرْبِيَّةٍ يَكَادُ زَيْتُهَا يُضِيءُ وَلَوْ لَمْ تَمْسَسْهُ نَارٌ نُّورٌ عَلَى نُورٍ يَهْدِي اللَّهُ لِنُورِهِ مَن يَشَاءُ وَيَضْرِبُ اللَّهُ الْأَمْثَالَ لِلنَّاسِ وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ) (النور : 35 ).

لە ڕاستیدا ئەم ئایەتە سەرچاوەی زۆربەی سۆفییە موسڵمانەكانەو بناغەی هەموو مەزهەبەكانی ئیشراقە لە ئیسلامدا.

چۆنیەتی ڕاڤەكردنی ئەو زانایانەی لەپێشەوە ناویان هات بۆ ئەو ئایەتەو بەپێی وتەی خۆیان دەخەینە ڕوو:

(أ) ماكدونالد: دەڵێت بەپێی ئەو بەدواداچوونە وا دەردەكەوێت كە لە ئایەتەكەدا لێوەرگرتنێك لە دابو نەریتە مەسیحییەكان لەناو كەنیسەو دێرەكاندا هەبێت ، لەم حاڵەتەشدا وێنەكە لەو پەیكەرەوە وەرگیراوە كە بە نوور داپۆشراوە، بەم شێوەیەش گوزارشتە قورئانییەكان پەیوەستن بە (نور العالم) (نووری جیهان) لە ئینجیلو (نورالنور) (نووری نوور)لە گەواهی ئیمانو دڵنیایی بە سروشتی مرۆڤو ئەوەی مانای ئەو بگەیەنێت، ئەم ڕاڤە كردنەش چەند پارێزێك دەخوازێت.

1– ئەو نوورانەی لە كەنیسەدا بەسەر پەیكەرەوەن زۆرن بەڵام ئایەتە قورئانییەكە جگە لە نوورێكی گەورە كە زەوی‌و ئاسمانەكانی پڕكردووە باس لە هیچ نوورێكی تر ناكات.

2–لە ڕاگەیاندنی عەقیدەدا كە ماكدونالد باسی كردووە نووسیویەتی (ان الله نور من نور) (خوا نوورێكە لە نوور) بەڵام لە قورئانی پیرۆزدا ئایەتەكە دەفەرموێت :(نور على نور) (نوورێك بەسەر نوورەوە) واتە نوورێكی پوختو بێگەرد، بەم شێوەیە واتای هەردوو دەقەكە جیاوازن.

3–شاعیرەكانی سەردەمی جاهیلی وەك (امرو القيس) لە وەسفی چرای ڕاهیبەكاندا كە نووری لێ هەڵدێت وەك ئەوەی لە یەكە یەكی گۆشە نشینی‌و تەنیاییەوە دزەبكات شیعریان نووسیوە، پێغەمبەر(موحەممەد)ﷺ نەكراوە ئەو لێكچواندنە بخوازێت كە لەو كاتەدا باوبووەو وەسفی نووری خوایی بكات ، چونكە شتی لەوجۆرە لە ئاستی كوفركردندایە.

–لەبەر ئەم سێ هۆیە دووپاتی دەكەینەوە كە دەرهاویشتەكەی ماكدونالد هەڵەیە.

(كلیر مون جانو)ش وای بۆ دەچێت لێكچوون لە نێوان ئەم ئایەتەو پارچەیەك لە كتێبەكەی زەكەریا (العهد القديم) (4\1–3)دا هەیە لەو شوێنەدا كە دەڵێت : (ملك لم يتكلم عاد الى ليو قضني كما لو كان شخص ينبه شخصا من نومه (2) وسألني ماذا ترى؟ فأجبته "عندي رؤية, رايت مشكاة من الذهب بخزانة في الجزء العلوي وفي أعلاه سبع مصابيح وسبع أسنة لهذه المصابيح (3) ومن جانبها زيتونتان الأولى عن يمين الخزان والأخرى عن يساره (4) وواصلت كلامي سائلا الملك الذي كان

يكلمني مانا يعني ذلك؟ ثم قلت: لا يا إلهي, فقال لي (هذه المصابيح السبعة تعني عيون الرب التي تكلأ الأرض" ثم سألته مانا تعني الزيتونتان على يمين وشمال المشكاة؟, فقال "هؤلاء الرجلان الموكلان بالزيت".)

واته: "فريشتەیەك بەبێدەنگ گەڕایەوە بۆلام بۆ ئەوەی ڕام چڵەكێنێ وەك ئەوەی كەسێكی تر لە خەوەكەی ئاگاداری بكاتەوە" وەلێی پرسیم چی دەبینی؟ وەڵامم دایەوە "خەوێكم بینی, چرایەكم بینی لە ئاڵتونو لەناو گەنجینەیەكدا لەبەشی سەرەوەیداو لەسەرەوە حەوت گڵۆپو حەوت پاڵپشت بۆ ئەو گڵۆپانە(3) وە لەملولایانەوە دوو زەیتونو یەكەمیان لەلای ڕاستی گەنجینەكەوەو ئەوی تریان لەلای چەپیەوە(4), بەردەوام بووم لە قسەكانمو لە فریشتەكەم پرسی كە قسەی لەگەڵدا دەكردم ئەوە مانای چییە؟ پاشان وتم: نا ئەی خوای من, وە پێی وتم: "ئەو حەوت گڵۆپە واتە چاوەكانی خوا كە زەوی ڕووناك دەكاتەوە" پاشان لێم پرسی دوو زەیتوونەكە كە لەلای ڕاستو چەپی چراكەوەن مانایان چییە؟ (4) وتی: ئەوانە ئەو دوو پیاوەن كە چەورییەكەیان پێ سپێردراوە".

بەڵام ئێمە بەڕاستی پەیوەندیو لێكچوون لەنێوان پارچەكەی كتێبی زەكەریاو ئایەتە قورئانییەكەدا نابینین.

لە كتێبەكەی زەكەریادا پارچەكە باس لە چرایەكی ئاڵتونی دەكات كە بەسەر هەڵگرێكەوە بەرزكراوەتەوە كە حەوت گڵۆپی هەیەو دوو زەیتونیش یەكێكیان لەلای ڕاستەوەو ئەوی تریان لای چەپەوە, لەكاتێكدا هیچ وشەیەك لەو قسەیە لە ئایەتە قورئانییەكەدا نییە, بەتەنها قسەكردن لە حەوت گڵۆپ بە گشتی نڕۆ پێچەوانەیە لەگەڵ واتای ئایەتە قورئانییەكەدا, كەتەنها باس لەیەك گڵۆپ دەكات, چونكە خوا یەكێكە نەك حەوت, وە باس لەیەك زەیتون دەكات, نەك دوان, ئەو زەیتونەش نە ڕۆژهەڵاتییەو نە ڕۆژئاوایی, چونكە زەیتونێكی ڕۆحانییەو شوێنو ئاڕاستەیەك سنوردارو دیاری ناكات.

پاش ئەوە "كلیرمون جانو" هەستی بە جیاوازییەكی گەورەكرد لەنێوان پارچەكەی زەكەریاو ئایەتە قورئانیەكەدا, بۆیە هەوڵیدا ئەو لێك نزیككردنەوە نارەوایە هێواشتربكاتەوە كە وای بۆچوویوو لەنێوان دوو دەقەكەدا هەیەو ئەوەش بەپێی ئەو قسەیەی كە دەڵێت: "ئەگەر لەوانە بێت كە محەممەد لەنواندنەكەیدا شێوازی یەهودیو مەسیحی خواستبێت, پێدەچێت ئەو دوور بووبێت لەو شێوازی شوێن كەوتنەی كە پەیوستە بە شێوەی سەرچاوەی تیشكەكەوە كەلەلای ئەو پلەو پایەیەكی گرنگی لە شیكرنەوەدا دەستكەوتووە, چونكە ئەو چرا حەوت گڵۆپییەی لە خەوەكەی زەكەریادا هەیە دیار نەماوە" (سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە (236), بەڵام ئیتر چی دەمێنێتەوە لەحەوتگڵۆپەكەی ناو خەوەكەی زەكەریا؟ هیچ شتێك جگە لەناوهێنانی گڵۆپ وە بەتەنها ناوهێنانی گڵۆپ بەڕەهایی بەس نییە بۆ گریمانەكردنی پەیوەندییەكەی خواستراو لەنێوان پارچەكەی زەكەریاو ئایەتە قورئانییەكەدا.

پاشان ئەم قسەو گوتە نەزۆكانەی كە (كلیر مون جانو) شوێنیان دەكەوێت لە بابەتی سەرچاوەكانی (نور) كە لە پەرستگە قیبتییەكانو كەنیسەكانی (بیت المقدس)دا هەن (لاپەڕە 238) هیچ بەڵگەیەكی لەسەر نییە چونكە هەرخۆی دان بەوەدا دەنێت كە موحەممەد وەك میوانێك یان حاجییەك پێی نەناوەتە ناو (بیت المقدس) لاپەڕە 243), وە لەبەرئەوەی بەڵگەی نییە نێتو پشت بەو قسەیە دەبەستێت كە (تەمیمداری) دابو نەریتەكانی كەنیسەی مەسیحی فێری موحەمەد كردووە، وە بۆ ئەوەی ئەم مەسەلەیە بسەلمێنێت دەڵێت كە (تەمیمداری) كاریگەری لەسەر دەروونو كردەوەكانی موحەممەد هەبووە (لاپەڕە 247), وە (تەمیمداری) بەبێ شك یەكێك بووە لەو مامۆستایانەی كە موحەممەد پشتی پێ بەستوون بۆ ئەوەی نەك تەنها عەقیدە بەڵكو خو نەریتو چۆنێتی خزمەتكردنی كەنیسەو كەشە پەیوەستەكانی بە مەسیحییەتی ڕۆژهەڵاتییەوە بۆ باس بكات, (لاپەرە 248).

(كلیر مون جانو) پشتی بە چ شتێك بەستووە تا ئەم بۆچوونە خەیاڵاویانە بخاتە ڕوو؟ بێگومان بەهیچ, چونكە ئەو هیچ سەرچاوەیەكمان ناداتێو هیچ بەلگەیەكی لۆژیكیش ئاشكراناكات, ئەوەی كە (جانو) دەیانڵێت بە تەنها لێكچونێكن كە خەیاڵێكی وێڵو سەرگەردان دروستی كردوون.

**سێیەم: (هورفیتز 1874 – 1931)**

1ـ "أيام الله"

ـ خوای گەورە لە ئایەتی (5)ی سورەتی (ئیبراهیم)دا دەفەرموێت: (وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَى بِآيَاتِنَا أَنْ أَخْرِجْ قَوْمَكَ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ وَذَكِّرْهُمْ بِأَيَّامِ اللّهِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَاتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ) (إبراهيم : 5 ).

ـ لە ئایەتی (14)ی سورەتی (الجاثية)دا دەفەرموێت: (قُل لِّلَّذِينَ آمَنُوا يَغْفِرُوا لِلَّذِينَ لا يَرْجُون أَيَّامَ اللَّهِ لِيَجْزِيَ قَوْماً بِما كَانُوا يَكْسِبُونَ) (الجاثية : 14 ).

بەرامبەرییەکی دیکە کە (هورفیتز) لە کتێبی "دراسات قرآنية" لاپەڕە (22)دا دەیکات لەنێوان (أيام الله عبارە يا حوا) "سفر العدد 21 ئایەتی 14",دا و دەڵێت: وەك سورەتی ژمارە (110) باسی دەکاتو ئایەتی (19) بەو زانیارییەنانەی کە (شوعەیب) لەوانەی پێش خۆی وەری گرتوون, ئایەتی (5)ی سورەتی ئیبراهیمیش فەرمان بە موسا دەکات کە (أيام الله) وە بیر نەتەوەکەی بخاتەوە, (أيام الله) گوزارشتێکە بە پێی هاتنەکەی واتای نیعمەتەکانو سزاکانی خوا دەگەیەنێت, ئەم دەربڕینەش تا ڕادەیەك داستانی (يا حوا) لە "سفر العدد" (142) دەینوێنێت, ئەوەش گوزارشتێکە لە شێوەی "أيام العرب".

(هورفیتز) چۆن چۆنی بەم بەرامبەر کردنە گەیشت؟ کەس نازانێ وە خۆیشی باسی ئەوەی نەکردووە!

ئەمەش پارچەیەکی (سفر العدد)ە (لەبەرئەمە لە مێژووی جەنگەکانی خوادا داستانی یاهوامان بیرهێنایەوە).

پوختەی ئەو پارچەیەش کە ماوە بریتییە لەدەقە داستانە یەهودییەکان.

ئەم پارچەیەش یارمەتیمان دەدات بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوەی دەمانەوێت باسی بکەین,. ئایەتی (5), بۆ زانیاری ئارون نوێنەرایەتی سنوورەکانی مەملەکەتی موئاب دەکات لە باکورەوە, وە هیچ جەنگێکی خواش ناگرێتەوە.

کەواتە پارچەکە لە (يوم)ێکی تاك لە (أيام الله) نادوێت.

کەواتە چۆن موحەممەد (ﷺ) دەتوانێت ئەو پارچەیە بەپێی گریمانەکەی (هورفیتز) لە زاراوەو بیرۆکەی "أيام الله"وە وەربگرێت؟ ئایا موحەممەد زانیاری هەبووە لەسەر ناوەرۆکی مێژووی جەنگەکانی خوا لەکاتێکدا کە هیچ زانایەکی یەهودی هیچی لەبارەوە نازانن وە جگە لەم پارچە سادەیەش لە ئایەتی (14) بەشی (21)ی سفر العدد هیچی تری لێ نەماوەتەوە؟ ئای لەم لەڕاستی لادانو گومڕاییە, بەڵام هورفیتز هەمیشە بە مامۆستای ئەم گومڕاییە ماوەتەوە!

لە کتێبەکانی ڕاڤەو فەرهەنگە عەرەبییەکاندا (ايام الله) واتە شەڕو ململانێو جەنگەکان.

سەبارەت بەم واتایە دەوترێت: زانایەکی ڕۆچوو لە ڕۆژەکانی عەرەبدا، واتە ئەو جەنگەکانی عەرەب دەناسێت و دەیانزانێت، بەڵام (أيام الله) لە ئایەتی (5)ی سورەتی (ئیبراهیم)دا (وذكرهم بأيام الله) واتە بەخششەکانی خوای گەورەیان بیربخەرەوە کە خوای گەورە لەهەندێك ڕۆژدا پێی بەخشیون, وە بەو نارەحەتیو نەهامەتیانەی خوای گەورە بۆ سزادانیان دایبەزاندووەتە سەریان وەك ئەوەی بەرامبەر بە نەتەوەکانی نوحو عادو سەمود کردی.

(فەراء) دەڵێت: "ئەوە واتە بیانترسێنەو ئەوەیان بیربخەرەوە کە بەرامبەر بەنەتەوەکانی عادو سەمودو نەتەوەکانی دیکەش ڕوویدا تاوەکو ئاگاداربن لەو سزایەی کەسانی دیکەی گرتەوەو با داوای لێخۆشبوون بکەن".

لەکاتێکدا (موجاهید)یش ئەم ئایەتە بەم شێوەیە ڕاڤە دەکات "هیوایان بە بەخششەکانی خوا نەبوو, کەواتە (أيام الله) لێرەدا واتە بەخششەکانی خوا"، (ئوبەی کوڕی کەعب) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە "وذكرهم بأيام الله" ئەو (أيام الله) یە بریتییە لە بەخششەکانی خوا".

كەواتە گۆڕینی أيام الله لەلای زانایانی فەرهەنگە عەرەبییەکان پەیوەندی نییە بە (أيام العرب) –جەنگو ململانێکان– ەوە ،(أيام الله) لای عەرەبەکان واتە بەخششو نەهامەتی کە خوای گەورە وەك ڕۆژەکان هەڵیاندەگێڕێتەوە کەواتە هیچ لێکچوونێك لێرەدا نییە لەبەر بەدوای یەکدانەهاتن لەهەردوو حاڵەتەکەدا بۆ ڕۆژە گەردوونییەکان لەلایەکو بەخششو سزاو تووڕەبوونی خوای گەورە لەلایەکی ترەوە.

ئەمەش ڕاڤەیەکی ڕوونو سادەیە ئیتر بۆچی بەشوێن بنچینەکەیدا بگەڕێین لە کتێبێکی ونبووی ناونەهێنراو لە "سفر العدد"دا؟

2ـ وشە وەرگیراوەکان:

لە بڵاوکراوە بچووکەکەیدا کە لە (83) لاپەڕە پێکهاتووە لە ژێر ناونیشانی "أسماء الاعلام اليهودية والاشتقاقات في القرآن" (ناوی زانا یەهودییەکانو باسە وەرگیراوەکان لە قورئاندا).

هورفیتز هەوڵ دەدات بیسەلمێنێت کە وشە قورئانییەکانی (المؤتفكات, أمر. أمانة, بارك, تبارك, بهيمة, مثاني, خلاق, درس, رب العالمين, سكينة, صدقة, أزر, قيوم, كفارة, ماعون, منهاج, جبار, أحبار, ربانين, سفك الدماء, قدوس, سورة, نبوة, بعير, عبادة, بور, صديق, جنات عدن, عليون, تزكى).

وشەگەلێکن لە عیبرییەوە وەرگیراون, وە موحەممەد لە یەهودییەکانی مەککەو بە تایبەتیش یەهودییەکانی مەدینەوە فێریان بووە.

بەڵام ئێمە بە پێچەوانەی ئەم هەڵهێنجانە هەڕەمەکییەوە تێبینی دەکەین:

أـ هەریەکە لە عەرەبیو عیبری دوو زمانی سامینو لە ئاکامی ئەمەشدا زۆر دیاردەی گشتیو لەیەکچوو لەنێوانیاندا هەیە. لەبەر ئەوە بوونی چەند وشەیەك لە قورئانی پیرۆزدا کە هاوبەشن لەنێوان زمانی عەرەبیو عیبریدا ئەو پابەندییە ناسەلمێنێت کە موحەممەد (ﷺ) ئەو وشانەی لە یەهودییەکانی سەردەمی خۆیەوە وەرگرتبێت.

بەڵکو لەوانەیە ئەو وشانە بەر لەسەردەمی گەورەمان موحەممەدەوە (ﷺ) بەکاتێکی دوورودرێژتر لەزمانی عەرەبیدا هەبووبن, وە بوونەتە بەشێکی بنەڕەتی لە سامانی زمانی عەرەبی.

ب ـ ئەگەر بڵێین: مێژووی زمانی عەرەبی بەر لە ئیسلام تا ڕادەیەك نەزانراوبووە, بەهۆی نەبوونی دەقە ئەدەبییە پێشکەوتووەکانەوە, ئەوەش ئەستەمە ئەوە دیاری بکەین کە ئەو وشانە کێ لەوی ترەوە وەری گرتوون عەرەب یان عیبری؟

لەبەرئەوەی لە چاخەکانی بەر لە ئیسلام لە چەند قەسیدەیەك زیاتر لەبەر دەستمانا نییە کە ئەوانیش مشتومڕ دەربارەی ڕاست بوونیان دەوروژێنن ئەوە ئەگەر گومانیشیان تێدا نەبێت, وە هەندێك نووسراوی زۆر کورت نەبێت کە باس لە چەند بابەتێك دەکات و ئەوانیش پشتییان پێنابەسترێت، لەبەرئەوە پێویست ناکات بڵێین: کە موحەممەد (ﷺ) ئەم وشە هاوبەشانەی ڕاستەوخۆ لە یەهودییەکانی سەردەمی خۆیەوە وەرگرتووە.

ئەم دوو بەڵگەیەش بەسن بۆ ئەوەی کە باوەڕمان وابێت هەوڵەکەی (هورفیتز) هەوڵێکی شکست خواردووە.

ئێستاش هەندێك لەو وشانە دەخەینە بەردەست بۆ ئەوەی ڕوونی بکەینەوە تا چ ڕادەیەك ئەو وتەیەی کە دەڵێت ئەوانە وەرگیراوی زمانی عیبرین تا چ ڕادەیەك ڕاڤەیەکی نارەوایە.

**یەکەم "خلاق = نصيب" –بەش–:**

خوای گەورە لە ئایەتی (20)ی سورەتی (البقرە)دا دەفەرموێت: (فَإِذَا قَضَيْتُم مَّنَاسِكَكُمْ فَاذْكُرُواْ اللّهَ كَذِكْرِكُمْ آبَاءكُمْ أَوْ أَشَدَّ ذِكْراً فَمِنَ النَّاسِ مَن يَقُولُ رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا وَمَا لَهُ فِي الآخِرَةِ مِنْ خَلاَقٍ) (البقرة : 200 ).

هەروەها لە ئایەتی (77)ی سورەتی (آل عمران)یشدا دەفەرموێت: (إِنَّ الَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللّهِ وَأَيْمَانِهِمْ ثَمَناً قَلِيلاً أُوْلَـئِكَ لاَ خَلاَقَ لَهُمْ فِي الآخِرَةِ وَلاَ يُكَلِّمُهُمُ اللّهُ وَلاَ يَنظُرُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلاَ يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ) (آل عمران: 77 ).

هیرشفیلد) وای بۆ دەچێت کە ئەم نمونەیە لە (مەشنا)ی (EN LAHEM HELEQ LAOLAM)دا هەیە (أبحاث جديدة لاپەڕە 114).

هیرشفیلد ئەوەش زیاد دەکات "لەگەڵ ئەوەدا وشە عیبرییەکە سەرنج ڕاکێشە, ئەلفی درێژی وشەکە ئەگەری ئەوەی هەیە ئەو وشەیە زیاتر لە زمانی ئارامییەوە وەرگیرابێت نەك لە عیبرییەوە, لەواقیعیشدا ئارامیی ئەو وشەیەی لە شێوەی HULAQدا ناسیوە لەبەرئەوە گریمانەی ئەوە دەکرێت کە موحەممەد یەکەمجار وشەکەی لەشێوە ئاوێتەییەکەیدا ناسیبێت وەك (HULAQ ALMD DETE) تارجوم ئیسترا (25 – 34).

(HULAKA BE A LMAHADEN –V- BE ALINADE ATA) لە ئاکامی ئەمەداو لەڕێگەی ڕاسپێر –وسیط–ێکی یەهودیەوە گوێزراوەتەوە لەواقیعیشدا مەسیحیە فەلەستینییەکان وشەی (HALAQ)یان بەواتای (نصیب) واتە (بەش) ناسیوە, بەڵام وشەکە کاتی خۆی بەکارنەهاتووە تاوەکو هیچ پەیوەندییەك بە ژیانی دوا ڕۆژەوە بگەیەنێت "هورفیتز – أسماء الاعلام اليهوديه" لاپەڕە (198–199) = لاپەڕە (54 = 55)ی (ناخدروك).

بەپێی وتەی (هیر شفیلد) موحەممەد (مەشنا)و پاشان عیبریشی زانیوە, وە بەپێی وتەی (هورفیتز) دەبێت موحەممەد (تارجوم)و پاشانیش ئارامی زانیبێت!! ئایا ئەمە گونجاوە؟

ئەوەندە بەسە چاوێکی خێرا بگێڕین بە لسان العرب مادە (خلق)دا تا بزانین وشەکە واتە پشك یان بەخت وە لەلای (حەسانی کوڕی سابت) بەرلەوەی کە پێغەمبەر موحەممەد (ﷺ) بناسێت قەسیدەکانی داناون‌و وشەی (خلاق –بەش)یش وشەیەکی عەرەبی باو بووە لەپێش ئیسلامدا ئەو بەکاری هێناوە .

ئیتر لەبەرچی دوور بڕۆین تاوەکو بەدوای وشەکەدا بگەڕێین لە زمانی عیبریداو لە (مەشنا)دا یان لە زمانی (ئارامی)و لە (تەرجوم)دا مەسەلەکە لەمانەی خوارەوەدا کورت دەبێتەوە:

وشەی عیبری HELEQو وشەی عەرەبی (خلاق – بەش) بنچینەیەکی هاوبەشیان هەیە بە واتای (بەش) دێت و ئەمەش هەموو ئەوەیە کەلە مەسەلەکەدا هەیە.

**دووەم (بعیر – وشتر):**

خوای گەورە لە ئایەتی (65)ی سورەتی (یوسف)دا دەفەرموێت: (وَلَمَّا فَتَحُواْ مَتَاعَهُمْ وَجَدُواْ بِضَاعَتَهُمْ رُدَّتْ إِلَيْهِمْ قَالُواْ يَا أَبَانَا مَا نَبْغِي هَـذِهِ بِضَاعَتُنَا رُدَّتْ إِلَيْنَا وَنَمِيرُ أَهْلَنَا وَنَحْفَظُ أَخَانَا وَنَزْدَادُ كَيْلَ بَعِيرٍ ذَلِكَ كَيْلٌ يَسِيرٌ) (یوسف: 65 ).

هەروەها لە ئایەتی (72)ی هەمان سورەتدا دەفەرموێت: (قَالُواْ نَفْقِدُ صُوَاعَ الْمَلِكِ وَلِمَن جَاء بِهِ حِمْلُ بَعِيرٍ وَأَنَاْ بِهِ زَعِيمٌ) (یوسف : 72 ).

ئەمەش هەمان حاڵەتە سەبارەت بە وشەی (بعیر –حوشتر) سورەتی یوسف ئایەتەکانی (65 – 72), (نڤوراك)ی ڕۆژهەڵاتناس لە کتێبەکەیدا (تقارير الاجتماعات الأكاديمية فی ڤينا – قسم الفلسفه والتأريخ بەرگی (109) لاپەڕە (522)دا دەڵێت: وشەی (بعیر – حوشتر) لەوشەی عیبری (بعیر)ی ناو سفر التكوين (17:45)وە وەرگیراوە, (هورفیتز)یش بۆی زیاد دەکات‌و دەڵێت "بینا لەسەر ئەو ڕایە ئەو وشەیە لە دەقی عیبری یان ترجوم یاخود مەشنادا هەیە, بەرگوێی موحەممەد کەوتووەو لەبیرەوەریدا ماوەتەوە, بەڵام ئەو لەمیانەی ئەو پڕۆسەیەدا واتای عەرەبی پێ بەخشیوە (بعیر) بەواتای (جمل) لەجیاتی ئەوەی وشەی (جمل) یان (ناقە) بەکاربهێنێت لە قورئاندا... بەکارهێنانی (بعیر) لە جیاتی(جمل) بە پێچەوانەی بۆ نمونە (گوێدرێژ)ەوەیە, چونکە بەپێی ئەم بۆچوونەی لای خوارەوە ڕاڤەکردنی ئاسانترە.

ئەویش ئەوەیە کە (گوێدرێژ) لەدیدی عەرەبەوە شوێنو پایەی وڵاخی سواربوونی پێ نەدراوە وەك ئەو وشترانە" لاپەڕە (191–192) = (48–49) تاخدرون.

لە سفر التكوين (45:17)دا فیرعەون بە یوسفی وت: "بڵێ بە براکانت کۆڵەکانیان بخەنە سەر وڵاخەکانیانو بیبەن بۆ سەر زەوی کەنعان" "قل لاخوتك أن يضعوا الأحمال على دوابهم ويذهبوا بها الى أرض كنعان"، سەبارەت بە وشەی (دوابهم) بنچینە عیبرییەکەی (بعيرهم)ە واتە حوشترەکانیان.

لەکاتێکدا لە (لسان العرب)دا لە ژێر وشەی (بعير)دا دەبینین وشەکە ئەم مانایانەی هەیە:

أـ الجمل القوی: واتە حوشتری بەهێز.

ب ـ واتای گوێدرێژی هەیە.

وەلەبەدواداچوونی ئەم بابەتەدا مشتومڕێك لەنێوان فەیلەسوفی گەورە (ئیبن خالویە)و دژکارە –بەربەرەکان–ەکەیدا شاعیری گەورە (موتەنەبی)دا هەیە بە ئامادەبوونی (ئەمیر سیف الدولە) ، (إبن خالويە) لە (موتەنەبی) دەپرسێت وشەی (بعير) لە قورئانی پیرۆزدا چییە؟ (موتەنەبی) داما, لێرەدا (ابن خالويە) ڕاڤەی وشەی (بعير)ی کردو وتی: "وشەی (بعير) واتە گوێدرێژ چونکە یەعقوبو یوسفی کوڕی لەزەوی کەنعاندا دەژیانو لەزەوی کەنعانیشدا حوشتر نەبووە, وە ئەوان کۆڵەکانیان بە گوێدرێژ هەڵدەگرتو باریان دەکرد, لەبەرئەوە خوای گەورە فەرموویەتی: قَالُواْ نَفْقِدُ صُوَاعَ الْمَلِكِ وَلِمَن جَاء بِهِ حِمْلُ بَعِيرٍ وَأَنَاْ بِهِ زَعِيمٌ) (يوسف : 72 ).

"حمل بعير" واتە "حمل حمار" باری گوێدرێژێك, لەبەرئەوە (مقاتل بن سليمان) لەڕاڤەکەیدا دەڵێت: لە فەرمودەکانی (داود)دا (بعير) بەشێوەیەکی گشتی بە واتای هەموو وڵاخێکی سواربوون هاتووە, لە گێڕانەوەیەکی جابردا هاتووە: پێغەمبەر (ﷺ)شەوی حوشترەکە بیستو پێنج جار داوای لێخۆشبوونی بۆ کردم کاتی شەو بوو ئەو کاتەی کە پێغەمبەر (ﷺ) لەکاتی گەشتێکیاندا حوشترێکی لە جابر کڕی.

(مقاتل بن سليمان) ساڵی (115ك – 767ز) کۆچی دوایی کردووە تەفسیرێکی بۆ قورئان نووسیوە لەنیوەی یەکەمی سەدەی دووەمی کۆچیدا, وا دیارە دەستنووسێکی هەیە لەمۆزەخانەی بەریتانیا بە ژمارەی (6333) ڕاڤەی وشەی (بعير – حوشتر)ی بە (حمار – گوێدرێژ کردووە.

لەلایەکی دیکەشەوە (لسان العرب) باس لە دێڕە شیعرێکی یەکێك لە دزەکانی بیابان لەسەردەمی خەلیفەی سێیەم عوسمانی کوڕی عەفاندا (23–35ك) دەکات کەناوی یەزید کوڕی سەقیلی عوقەیلی بووەو لەو دێڕە شیعرەدا وشەی (بعير) بەشێوە (جمع – کۆ)ەکەی باس دەکات, لەلایەنی سێیەمیشەوە وتەکەی جابر (ليله البعير – شەوی حوشترەکە) وشەی حوشتر دەگرێتەوە, ئەم سێ بەڵگە ئەدەبیە جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کە وشەی (بعير) وشەیەکی عەرەبییەو بەر لە ئیسلام هەبووەو زۆر بەناوبانگیش بووە ماناکەشی واتە: (جمل, حمار) (وشتر یان گوێدرێژ) لەبەر ئەوە چ سوودێکی هەیە بانگەشەی ئەوە بکەین کە موحەممەد (ﷺ) لە سفر التكوين (45:17)ەوە وەریگرتبێت؟

بێگومان موحەممە (ﷺ) یەکەم کەسێك نییە لەناو عەرەبدا کە ئەو وشەیەی بەکارهێنابێت.

**سێیەم : ئاژەڵ ( بهيمة )**

خوای گەورە لە ئایەتی (1)ی سورەتی (المائدە)دا دەفەرموێت: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَوْفُواْ بِالْعُقُودِ أُحِلَّتْ لَكُم بَهِيمَةُ الأَنْعَامِ إِلاَّ مَا يُتْلَى عَلَيْكُمْ غَيْرَ مُحِلِّي الصَّيْدِ وَأَنتُمْ حُرُمٌ إِنَّ اللّهَ يَحْكُمُ مَا يُرِيدُ) (المائدة : 1 )

هەروەها لە ئایەتی (28)ی سورەتی (الحج)دا دەفەرموێت: (لِيَشْهَدُوا مَنَافِعَ لَهُمْ وَيَذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ فِي أَيَّامٍ مَّعْلُومَاتٍ عَلَى مَا رَزَقَهُم مِّن بَهِيمَةِ الْأَنْعَامِ فَكُلُوا مِنْهَا وَأَطْعِمُوا الْبَائِسَ الْفَقِيرَ) (الحج : 28 ).

وه له ئایەتی (34)ی هەمان سورەتدا دەفەرموێت: (وَلِكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنسَكاً لِيَذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ عَلَى مَا رَزَقَهُم مِّن بَهِيمَةِ الْأَنْعَامِ فَإِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ فَلَهُ أَسْلِمُوا وَبَشِّرِ الْمُخْبِتِينَ) (الحج : 34 ).

(هورفیتز) له کتێبی (الأسماء اليهودية) لاپەڕە (193– 194)دا "ناخدرون" دەڵێت: پێدەچێت کە وشەی (بهیمە–ئاژەڵ) لەوشەی عیبری (بهیمه)وە وەرگیرابێت, وە پێدەچێت ئەو وشەیە لە شیعری جاهیلیدا نەبووبێت.

بە پێچەوانەی ئەم گریمانانەوە تێبینی ئەمەی خوارەوە دەکەین:

أ- وشەی (بهیمة–ئاژەڵ) هەمیشەو هاوکات لەگەڵ وشەی (الانعام–مالآت)دا دێت, حۆ ئەگەر وشەی (بهیمة) بەمانای (الانعام–مالآت) لە عیبریەوە وەرگیرابێت ئەوکاتە ئەوە دوبارە کردنەوەیەکی بێ سوودو بێکەلکە, بەلام لەڕاستیدا وشەی (بهیمە–ئاژەڵ) لەزمانی عەرەبیدا واتە ئاژەڵێکی یەك ڕەنگ نەك تێکەڵ بە ڕەنگێکی تر, وە دەکرێت ئەو ڕەنگە ڕەش یان سپی بێت وشەکە بەشێوەیەکی گشتی بەسەر ئەو مالآتانەدا دەبرێت کە ڕەنگیان ڕەشە, بڕوانە (لسان العرب).

هەروەها وشەکە بەخوازراوی –استعارە– بەواتای (خالص) –پوخت– بەکاردێت وەك لەزۆر قسەکردنو گفتوگۆدا (لسان العرب) بەدوایدا چووە.

ب - تەنانەت ئەگەر ئەو وشەیە لەناو شیعری جاهیلیشدا نەبێت ئەوە شتێکە هێشتا لێکۆڵینەوەمان لەبارەیەوە نەکردووە, بەدلخەوە فەرهەنگەکەی( فیشر) هێشتا بەهۆی هەڵەی نەزانو گێلەکانەوە کە تا ئێستاش ئەندامی کۆمەڵەی زمانی عەرەبین لە قاهیرە چاپ نەکراوە, هەرچۆنێك بێت تازە ئەوە سوودی نییە, وە ئەو وشەیە زۆر جار لە فەرموودەکانی پێغەمبەردا (ﷺ) بەواتای (پوخت) یان یەك ڕەنگ بەکارهاتووە, واتە ئەو وشەیە سیفەتە (صفه) نەك (موصوف–وەسفکراو).

**چوارەم: سورەت ( سورة )**

خوای گەورە لە ئایەتی (64)ی سورەتی (تەوبە)دا دەفەرموێت: (يَحْذَرُ الْمُنَافِقُونَ أَن تُنَزَّلَ عَلَيْهِمْ سُورَةٌ تُنَبِّئُهُمْ بِمَا فِي قُلُوبِهِم قُلِ اسْتَهْزِئُواْ إِنَّ اللّهَ مُخْرِجٌ مَّا تَحْذَرُونَ) (التوبة: 64).

له ئایەتی (68)ی هەمان سورەتدا دەفەرموێت: (وَإِذَا أُنزِلَتْ سُورَةٌ أَنْ آمِنُواْ بِاللّهِ وَجَاهِدُواْ مَعَ رَسُولِهِ اسْتَأْذَنَكَ أُوْلُواْ الطَّوْلِ مِنْهُمْ وَقَالُواْ ذَرْنَا نَكُن مَّعَ الْقَاعِدِينَ) (التوبة: 86 ).

هەروەها لە ئایەتی (124)ی هەمان سورەتدا دەفەرموێت: (وَإِذَا مَا أُنزِلَتْ سُورَةٌ فَمِنْهُم مَّن يَقُولُ أَيُّكُمْ زَادَتْهُ هَـذِهِ إِيمَاناً فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُواْ فَزَادَتْهُمْ إِيمَاناً وَهُمْ يَسْتَبْشِرُونَ) (التوبة : 124 ).

له ئایەتی (127)ی هەمان سورەتدا فەرمویەتی: (وَإِذَا مَا أُنزِلَتْ سُورَةٌ نَّظَرَ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ هَلْ يَرَاكُم مِّنْ أَحَدٍ ثُمَّ انصَرَفُواْ صَرَفَ اللّهُ قُلُوبَهُم بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لاَّ يَفْقَهُون) (التوبة : 127 ).

له ئایەتی (1)ی سەرەتای (النور)دا دەفەرموێت: (سُورَةٌ أَنزَلْنَاهَا وَفَرَضْنَاهَا وَأَنزَلْنَا فِيهَا آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ لَّعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ) (النور : 1 ).

خوای گەورە لە ئایەتی (20)ی سورەتی (محمد)دا دەفەرموێت: (وَيَقُولُ الَّذِينَ آمَنُوا لَوْلَا نُزِّلَتْ سُورَةٌ فَإِذَا أُنزِلَتْ سُورَةٌ مُّحْكَمَةٌ وَذُكِرَ فِيهَا الْقِتَالُ رَأَيْتَ الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ نَظَرَ الْمَغْشِيِّ عَلَيْهِ مِنَ الْمَوْتِ فَأَوْلَى لَهُمْ) (محمد : 20 ).

(نولدکە) "تأريخ القرآن" لاپەڕە (24), "مساهمه جديده" لاپەڕە (26).

(نولدکە)ی ڕۆژهەلآتناس یەکەم کەس بوو بانگەشەی ئەوەی کرد کە وشەی (سورة–سورەت) لەوشەی عیبری (شوره) (shura)وە وەرگیراوە, بەلآم ئەم وشەیە واتە: (نووسین, ڕێکخستن, دێڕ, ڕیز یان هێڵ) وە مانای بەشێك لەکتێب ناگەیەنێت.

لەبەرئەوە گریمانەکەی (نولدکە) بەهەموو شێوەیەك ساختەو خەیاڵیە.

گریمانەیەکی دیکەش هەیە کە گریمانەی (هیرشفیلد)ە (أبحاث جدیدة) لاپەڕە (2) تێبینی (6) وە لاپەڕە (113) تێبینی (8), کە بانگەشەی ئەوە دەکات (سورە) واتە (قراءة, خوێندنەوە) هەڵگێڕاوەی وشەی ئارامی (سیدرا sidra)یە, ئەوەش گریمانەیەکە (هورفیتز) بەخۆی وەریناگرێتو دەیداتەدواوە بەوەی کە دەڵێت: "ناکرێت ئەوە بەڕاست بزانرێت" لەوێدا جیاوازییەك هەیە لەنێوان زانایانی زمانی عەرەبیدا دەربارەی بنچینەی وشەی (سورە –سورەت).

ـ هەیانە وتویانە (سورة) واتە (فاصل–ناوبڕ).

ـ هەیانە دەڵێن (سورة–سورەت) واتە (شوێنگە یان پلەو پایەیەکی بەرز) بەڵام هەموو ئەم ڕاڤەکردنانە بەس نین, بەم شێوەیە گرفتەکە بەبێ چارەسەر لەلایەن زانا ئەورووپییەکانو زانا عەرەبە کۆنەکانەوە دەمێنێتەوە.

**پێنجەم: (مثانی)**

خوای گەورە لە ئایەتی (87)ی سورەتی (الحجر)دا دەفەرموێت: (وَلَقَدْ آتَيْنَاكَ سَبْعاً مِّنَ الْمَثَانِي وَالْقُرْآنَ الْعَظِيمَ) (الحجر: 87 ).

وە لە ئایەتی (23)ی سورەتی (الزمر)دا دەفەرموێت: (اللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ الْحَدِيثِ كِتَاباً مُّتَشَابِهاً مَّثَانِيَ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ ذَلِكَ هُدَى اللَّهِ يَهْدِي بِهِ مَنْ يَشَاءُ وَمَن يُضْلِلْ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ) (الزمر: 23 ).

بەهەمان شێوە وشەی (مثاني) گرفتەکەی بەبێ چارەسەر دەمێنێتەوە, ڕۆژهەڵاتناس (د. هـ. مولر) لە کتێبەکەیدا (الأنبياء وأوجه مصداقيتهم) لاپەڕە (42,46), لە تێبینی دووەمیدا وا دەڵێت کە "(مثاني) بریتییە لە داستان وە (السبع المثاني) حەوت داستانەکەی (موساو ئیبراهیمو نوحو صالحو لوط و شوعەیبە".

بەڵام تێبینی پێچەوانەی ئەم گریمانە ئەوەیە کە قورئانی پیرۆز لەزۆر چیرۆك پێکهاتووە دەربارەی پێغەمبەرە پێشینەکان, ئیتر (مولر) بۆچی تەنها بە چیرۆکی ئەم پێغەمبەرانەوە دەبەسترێتەوە؟ تەنانەت (نولدکە) خۆیشی ئەم ڕاڤەکردنە دەداتە دواوەو ڕای ئەو لەگەڵ ڕاڤەکردنە باوەکەی ڕاڤەکارە مسوڵمانەکاندا دەگونجێت کە بریتییە لەوەی (السبع المثاني) واتە حەوت ئایەتەکەی سورەتی (الفاتحە) (إضافات وتنقيحات) لاپەڕە (261).

(گیگر) لە بنچینەی وشەی (مثاني) کۆڵیوەتەوە لەوشە یەهودیەکەیدا (مثینا) بەواتای ((سنە–سوننەت) لە حاڵەتی کۆدا بەپێی زمانی عەرەبی, بەڵام ئەو ڕاڤەی (السبع المثاني ) ناگەیەنێت تاوەکو بتوانێت لەگەڵ ڕای (د.هـ.مولر)دا بگونجێت کە پێشتر ناڕاستییەکەیمان ئاشکراکرد.

هیچ کۆڕاییەك لەنێوان ڕاڤەکارە مسوڵمانەکاندا نییە دەربارەی مانای یان وەرگرتنی وشەی (مثاني).

(لسان العرب) ئەو ڕایانە بەم شێوەیەی خوارەوە کورت دەکاتەوە: "مثاني لە قورئاندا ئەوەیە جار لەدوای جار دووبارە ببێتەوە, هەروەها دەوترێت: بریتییە لە سورەتی الفاتحە کە لەحەوت ئایەت پێکهاتووە, وە پێی وتراوە (مثاني) چونکە لەهەموو ڕکاتێکی نوێژدا دووبارە دەبێتەوە.

هەروەها دەوترێت: (مثاني) بریتییە لەحەوت سورەت یەکەمیان (البقرة)یەو دواهەمینیشیان (التوبة)یە, هەروەها وتراوە: ئەو سورەتانە دەگرێتەوە کە لە (200) ئایە ت کەمتر پێکهاتوون, وە دەوترێت (المثاني) بریتییە لەهەموو قورئان, دێڕە شیعرێکی (حەسانی کوڕی سابت)یش ئەمە دەسەلمێنێت:

فمن للقوافي بعد حسان وابنه

ومن للمثاني بعد زيد بن ثابت

واتە: کێ هەیە بۆ شیعر لەدوای حەسانو کوڕەکەی, وە کێ هەیە بۆ قورئان لە پاش زەیدی کوڕی سابت.

مەبەست لەوەیە بەباشیو شارەزاییەوە بیلێیتو لێی تێبگات, وە (أبو عبید) دەڵێت: (مثاني) لە قورئانی خوای گەورەدا سێ شتە:

1ـ خوای گەورەو بالادەست هەموو قورئانی بە (مثاني) ناوناوە لەم ئایەتەدا (اللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ الْحَدِيثِ كِتَاباً مُّتَشَابِهاً مَّثَانِيَ...).

2ـ وە سورەتی (الفاتحة) دەستپێکی قورئانی بە (مثاني) ناوناوە لەم ئایەتەدا (وَلَقَدْ آتَيْنَاكَ سَبْعاً مِّنَ الْمَثَانِي وَالْقُرْآنَ الْعَظِيمَ) (الحجر : 87 ).

3ـ قورئانی بە (مثاني) ناودەبرێت چونکە چیرۆکەکانو هەواڵەکان دووجار تیایدا دووبارە دەبنەوە, هەروها قورئان بە (مثاني) ناودەبرێت لەبەرئەوەی هەموو ئایەتێکی بەزەیی بەشوێنیدا ئایەتێك لە ئایەتەکانی سزادان دێت. "لسان العرب, مادەی (ثني)".

بەم شێوەیە دەبینین ئەو ڕاڤەکردنانەی ڕاڤەکارانی قورئانو زانا مسوڵمانە زماناسەکان چەند جیاوازن.

لەم بارەیەوە ئاماژە بۆ ڕاستییەکی پێشنیازکراوی (نولدکە) کراوە بۆ نیوەدێڕێکی (أبو الأسود الدؤلي) لەو قەسیدەیەیدا کە تیایدا ئیمامی عەلی دەلاوێنێتەوە "نولدکە zdng بەرگی (18) لاپەڕە (236), ئەویش ئاڕاستەکردنێکی هەڵەیە,

نیوەدێڕەکەش: "ومن قرأ المثاني والمئينا". نولدکە پێشنیازی ڕاستکردنەوەی وشەی کۆتایی دەکات بۆ (مبینا) ، پێشنیازەکەی بە شێوەیەکە بۆ هەموو ئەو ئایاتەنانەی کە وشەی (مثاني)یان تێدایە, بەڵام وەك بینیمان لەو ئاماژانەی کە لە (لسان العرب)دا بەدوایانداچووین قسەکرنەکە لەسەر (مئین) ە نەك (مبین) وە هەموو ڕاڤەکردنە پەیوەستەکان بە وشەی (مئین)ەوە واتای (مائن–ناڕاست) دەگەیەنێت .

چوارەم: (هاینریش سبییر): (هاینریش سبییر ) قوتابی (جوزیف هورفیتز) بووەو ویستوویەتی درێژە بە لێکۆڵینەوە قورئانییەکانی مامۆستاکەی بدات, چونکە ئەو هەستی بەوە کردبوو کە قورئان زیاتر لەوەی کە دەبێت باوەڕی پێبکەیت پێکهاتووە ئەوەش لەبەرگێکدا بەناونیشانی (المقدمە).

لەبەر ئەوە هەستا بە دیراسەکردنێکی بەرفراوان لە دووتوێی (509) لاپەڕەدا بەناونیشانی "القصص الإنجيلية في القرآن– چیرۆکە ئینجیلییەکان لە قورئاندا), چاپی یەکەم ساڵی (1931ز), وە چاپی دووەم ساڵی (1961ز) لەوێدا وتوویەتی "ئێمە تەنها ئەو بابەتەی کۆتاییمان بەلاوە گرنگە.

دەبێت بەدواداچوونی هەندێك لەو گریمانانەی (سبییر) لەوبارەیەوە بکەین تاوەکو ڕوون ببێتەوە تا چ ڕادەیەك لەڕاستییەوە دوورەو پشت بەزیادەڕۆیی دەبەستێتو بەتەواوی ئەویش وەك (هارفیج هیرشفیلد)کەم وردبین و لاوازە.

أ- مثل الجنتين – نمونەی دوو باخەکە:

خوای گەورە لە ئایەتەکانی (32–43)ی سورەتی (الکهف)دا دەفەرموێت: (وَاضْرِبْ لَهُم مَّثَلاً رَّجُلَيْنِ جَعَلْنَا لِأَحَدِهِمَا جَنَّتَيْنِ مِنْ أَعْنَابٍ وَحَفَفْنَاهُمَا بِنَخْلٍ وَجَعَلْنَا بَيْنَهُمَا زَرْعاً* كِلْتَا الْجَنَّتَيْنِ آتَتْ أُكُلَهَا وَلَمْ تَظْلِمْ مِنْهُ شَيْئاً وَفَجَّرْنَا خِلَالَهُمَا نَهَراً* وَكَانَ لَهُ ثَمَرٌ فَقَالَ لِصَاحِبِهِ وَهُوَ يُحَاوِرُهُ أَنَا أَكْثَرُ مِنكَ مَالاً وَأَعَزُّ نَفَراً* وَدَخَلَ جَنَّتَهُ وَهُوَ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِ قَالَ مَا أَظُنُّ أَن تَبِيدَ هَذِهِ أَبَداً* وَمَا أَظُنُّ السَّاعَةَ قَائِمَةً وَلَئِن رُّدِدتُّ إِلَى رَبِّي لَأَجِدَنَّ خَيْراً مِّنْهَا مُنقَلَباً* قَالَ لَهُ صَاحِبُهُ وَهُوَ يُحَاوِرُهُ أَكَفَرْتَ بِالَّذِي خَلَقَكَ مِن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ سَوَّاكَ رَجُلاً* لَّكِنَّا هُوَ اللَّهُ رَبِّي وَلَا أُشْرِكُ بِرَبِّي أَحَداً* وَلَوْلَا إِذْ دَخَلْتَ جَنَّتَكَ قُلْتَ مَا شَاء اللَّهُ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ إِن تُرَنِ أَنَا أَقَلَّ مِنكَ مَالاً وَوَلَداً* فَعَسَى رَبِّي أَن يُؤْتِيَنِ خَيْراً مِّن جَنَّتِكَ وَيُرْسِلَ عَلَيْهَا حُسْبَاناً مِّنَ السَّمَاءِ فَتُصْبِحَ صَعِيداً زَلَقاً* أَوْ يُصْبِحَ مَاؤُهَا غَوْراً فَلَن تَسْتَطِيعَ لَهُ طَلَباً* وَأُحِيطَ بِثَمَرِهِ فَأَصْبَحَ يُقَلِّبُ كَفَّيْهِ عَلَى مَا أَنفَقَ فِيهَا وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَى عُرُوشِهَا وَيَقُولُ يَا لَيْتَنِي لَمْ أُشْرِكْ بِرَبِّي أَحَداً* وَلَمْ تَكُن لَّهُ فِئَةٌ يَنصُرُونَهُ مِن دُونِ اللَّهِ وَمَا كَانَ مُنتَصِراً).

(سبيير) جەخت لەسەر ئەوە دەكاتەوە كە بنچينەی ئەم نمونەيەی لەبەشێك لە كتێبی (تەلمود)ی پەيوەست بە (سفر اللاوين سفری سێيەم لەكتێبەكەی زەكەريا)دا دۆزيوەتەوە, بۆ ئەوەی بيسە لمێنێت كە هيچ پەيوەنديەك لەنێوان ئەم دەقە قورئانييەو (ميدراش)ی ناوبراودا نييە, دەقی تەواوی ئەمەی كۆتاييتان دەخەينە بەردەست وەك ئەوەی لەوەرگێڕانە ئينگليزيەكەيدا هاتووە "Midrash Rebbah Leviticus, trper judeh. J Slatki, London- Soncino press, 1951, pp 293–294.

"الربی عزريا ر.جودا إبن سيمسون" وتويەتی: دەبێت ئەمە بەرامبەر بكەين بەو پادشايەی كە باخێكی هەبووە لەناويدا ڕيزێك درەختی هەنجيرو ڕيزێك ترێو ڕيزێك هەنارو ڕيزێك سێو هەبووە, داويەتی بەكرێ بە پياوێكو ڕۆيشتووە, پاش ماوەيەك پادشاكە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی سەردانی باخەكەی بكاتو خۆشحاڵ بێت بە بەرووبوومی باخەكەی كە هێناويەتييە بەرهەم, دەبينێت دڕكو داڵ دايپۆشيوە ... برەڕێكی ئامادەكرد تاوەكو ئەو هەموو دڕكو داڵە لاببات, لەم كاتەدا گوڵێكی ڕەنگ پەمەيی دۆزييەوە بۆنی كردو هێور بووەوە, پادشا وتی: لەسايەی ئەم گوڵەوە باخەكە ڕزگاری دەبێت" هەروەك چۆن هەموو جيهان لەسايەی تەوراتدا ڕزگاری دەبێت.

پاش (26) نەوە خواناسەكە سەيری باخەكەی كرد تاوەكو ببينێت چ بەرويومێكی بەرهەم هێناوە هيچی نەبينی جگە لە ئاوێك لە ئاوی چيای (ئينشۆن) كە لە ئاودا بوو, وە چيای "طوفان" كە ئاويوو لەناو ئاودا, چيای (الشتات) كە ئاو بوو لەناو ئاودا, ئەمجارەش برەڕێكی هێنا بۆ برينی وەك وتراوە: "خودانەكە لە تۆفان دانيشتو ئەو خودانە بۆ هەميشەيی بە پادشايی دادەنيشێت" گوڵێكی پەمەيی بينی, ئيسرائيل گوڵەكەی هەڵگرتو بۆنی كردو دە (وەسيەت– ڕاسپاردە)كەی دايەو كاتێك وتيان "هەموو ئەوەی خودا وتويەتی جێبەجێی دەكەينو گوێی بۆ ڕا ئەدێرين" هێور بوويەوە . الخروج 7:24, خودان –خوا– وەڵامی دايەوەو وتی "باخەكە ڕزگاری دەبێت وە لەپێناوی تەوراتو ئيسرائيلدا جيهان ڕزگاری دەبێت".

وەك دەبينين بەهيچ شێوەيەك پەيوەندی نييە لەنێوان نمونە قورئانييەكەو ئەم (ميداراشەدا) نە لە گوزارشت كردنو نە لە ناوەرۆكيشدا وە نە لەو سوودو كەڵكەدا كە لێيانەوە هەڵی دەهێنجێنين.

تاكە ڕەگەزێكی هاوبەش لەنێوان هەردووكياندا وشەی (جنە–بستان) باخەكەيەو پاشماوەی دوو دەقەكە بەتەواوی لەيەكتر جياوازن.

بەڕاستی بێهودەييە گريمانەی ئەوە بكەين كە پێغەمبەر موحەممەد (ﷺ) لە دەقێكەوە شتی وەرگرتبێت كە جەخت لەسەر ئەوە دەكات كە جيهان لە سايەی تەوراتو ئيسرائيل –إسحاق– دا پارێزراوە.

دەقە قورئانييەكە جەخت لەسەر متمانەبوونی ڕەها دەكاتەوە, چونكە ئيمانداری ڕاستەقينە پێويستە باوەڕی بە قەزای خوا هەبێتو ملكەچی بێت, لەكاتێكدا گەلەكەی ئيسرائيل –ئيسحاق– ئەوە دەڵێن كە ئيسرائيل گەلەكانی ديكەی جيهان دەپارێزێت.

چ ڕاڕاييەك پاڵی بە (هاينريش سبير)ەوە ناوە بۆ دۆزينەوەی لەيەكچوون يان بەواتايەكی ڕاستر لێوەرگرتن لەنێوان دوو دەقەكەدا؟ ديارە حاڵەتەكەی ئەويش وەك حاڵەتی (هيرشفيلد) پێويستی بە چارەسەری دەروونی هەيە, وە لەسەر هەمان شێوازو ڕێباز دەڕوات لەويەشەدا كە تايبەتە بە نموونەكان لە قورئاندا لاپەڕە (426–438).. (فرانس پول)يش خۆشبەختتر نەبووە لەهەڵدانەوەی لاپەڕەكانی ئينجيلی (لوقا الاصحاح الثاني عشر, (16), بۆ ڕوونكردنەوەی سەرچاوەی نواندنە قورئانييەكان.

بەڵام چی لە ئينجيلی (لوقا)دا هەيە ؟ئەم نمونەيەی خوارەوە بەرچاو دەكەوێت :

"پياوێكی دەوڵەمەند هەبوو زەوييەكەی بەفرەيی چاند (17)و لە خۆی پرسی دەبێت چی بكەم؟ ئا ئەمە دەكەم, دەبێت ئەم پەرستگايانە بڕوخێنمو لە جێگايانددا پەرستگای گەورەتر بنيات بنێم وە دەبێت هەموو سەروەتو سامانەكەم

کۆبکەمەوە (19) وە بەخۆم دەڵێم: ئەی نەفسەکەم خاوەنی سەروەتێکی زۆریتو بەشی چەندین ساڵت دەکات, هێور بەرەوە نەفسەکەم بخۆو بخۆرەوەو ئاهەنگ بگێڕە (20) پەروەردگار پێی وت: ئەی گێل لەم شەوەدا دەبێت پرسیار لەخۆت بکەیتەوەو دەربارەی هەموو ئەوەی کۆت کردووەتەوە بلێیت بۆ کوێ دەڕوات (21) بەم شێوەیە لەجیاتی ئەوەی لە پێناوی پەروەردگاردا کۆی بکاتەوە ماڵو سامانی بۆخۆی کۆکردەوە".

لەم نمونەیەی ناو ئینجیلدا نەباخی تیایەو نە ئاماژەی بۆ کراوە, هەتا لە ئایەتی کۆتاییشدا نمونەکە ئیدانەی ڕژدیو کۆکردنەوەی ماڵو سامان دەکاتو هانی خێرو چاکە دەدات, وە ئەوە لە واتای نمونە قورئانییەکەدا بەرچاوناکەوێتو بوونی نییە, لەبەرئەوە پێویستە بپرسین لەبەرچی کەسانێکی وەك هێرشفیلد یان سبیر یان پۆڵ گریمانەی ئەو لێك نزیکبوونە دەکەن کە ساختەییەکەی بەڕوونی دیارە بۆ ئەو کەسەی لەنزیکەوە بیخوێنێتەوە؟

هەروەها هەندێك نمونەی دیکە دەخەینە ڕوو لەسەر ئەو قسە پوچو بێ مانایانەی (هاینریش سبیر):

ب ـ سورەتی فاطر:

خوای گەورە لە ئایەتەکانی (19–22)ی سورەتی فاطردا دەفەرموێت: (وَمَا يَسْتَوِي الْأَعْمَى وَالْبَصِيرُ* وَلَا الظُّلُمَاتُ وَلَا النُّورُ* وَلَا الظِّلُّ وَلَا الْحَرُورُ* وَمَا يَسْتَوِي الْأَحْيَاء وَلَا الْأَمْوَاتُ إِنَّ اللَّهَ يُسْمِعُ مَن يَشَاءُ وَمَا أَنتَ بِمُسْمِعٍ مَّن فِي الْقُبُورِ), تاوەکو سەرچاوەیەکی بۆ دژایەتی ئەو ئایەتە قورئانییە دەست بکەوێت سبیر شوێن نۆ ئایەتی (العهد القديم)و پێنج ئایەتی (العهد الجديد) کەوتووەو وشەی (من–کێ)ی هەڵگرتووەتەوە, هەموو ئەو چواردە ئایەتە بەتەواوی لەسەرچاوەکانیدا جیاوازنو زۆر لەیەکترەوە دوورن, هەموویانی کۆکردووەتەوە تاوەکو پێکهاتەیەك پێك بهێنێت بۆ ئەو شتەی کەوای دەردەخات ئەو بنچینەیە! ناکرێت لەوە زیاتر گەوجێتیو بێ مانایی هەبێت.

ئەی ئەو ئایەتە ئینجیلیانەی ئاماژەی بۆ کردوون چی دەڵێن:

ـ سفر التكوين, الاصحاح8, ئایەتی 22 "ماوەی هەموو ڕۆژەکانی سەرزەوی چاندنو دروێنەو سەرماو گەرماو هاوینو زستانە, وە شەوو ڕۆژە هەتا ئێستاش"

ـ سفر الخروج, الإصحاح4, ئایەتی (11) "پەروەردگار پێی وت کێ دەمی بۆ مرۆڤ دروستکردووە یان کێ لاڵ یان کەڕ یان بینا یان نابینا دروست دەکات, ئایا ئەوە منی پەروەردگارنیم".

ـ سفر المزامير, الإصحاح15, ئایەتی (17–18) "مردووەکان تەسبیحاتی پەروەردگار ناکەن, بەهەمان شێوە ئەوکەسەش کە دەگەڕێتەوە بۆ زەوی بێدەنگو خامۆش (18) بەڵام ئێمە لەزەوییەوە بۆ ڕۆژگار پیرۆزی دەکەین".

ـ سفر يوئيل, الإصحاح الثاني, ئایەتی (31 "خۆر دەگۆڕێت بۆ تاریکی, مانگیش بۆ خوێن, پێش ئەوەی ڕۆژە گەورەو ترسێنەرەکەی پەروەردگار بێتە پێشەوە".

ـ سفر إشعياء, الإصحاح5, ئایەتی (20) "وەیل بۆ ئەوکەسانەی بەشەڕ دەڵێن خێرو بەخێر دەڵێن شەڕ ئەوانەی تاریکی دەکەنە ڕوناکیو ڕوناکی دەکەنە تاریکی".

(سبیر) وشەگەلێکی پرژوبڵاوی لەم نۆ پارچەیەوە کۆکردووەتەوە کە بریتین لە (الظلمات)– تاریکییەکان) (النور–ڕوناکی) (الاموات– مردووەکان) (الاحياء– زیندووەکان)، وە باوەڕی وا بووە بەمە گەیشتووەتە ئایەتی (19ی سورەتی (فاطر), ئای لەم نەفامیەو لەم سوکایەتیکردنە ئازاراوییە بەزانست و زانیاری!

ج ـ سورەتی (الزمر):

خوای گەورە لە ئایەتی (29)ی سورەتی (الزمر)دا دەفەرموێت: (ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلاً رَّجُلاً فِيهِ شُرَكَاء مُتَشَاكِسُونَ وَرَجُلاً سَلَماً لِّرَجُلٍ هَلْ يَسْتَوِيَانِ مَثَلاً الْحَمْدُ لِلَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ) (الزمر : 29 ).

(سبیر) دەگەڕێتەوە بۆ (مەشنائابوت) (الآباء) (11و13و14):

"هاتە قسەو پێی وتن: بڕۆنو ببینن چ ڕێگایەکی ڕاست پێویستە کە مرۆڤ بیگرێتەبەر, یوسنا وتی هاوڕێی باشو یوشەع وتی: دراوسێی باش, ئینجا پێی وتن: بڕۆن یان ببینن چ ڕێگەیەکی وێڵ پێویستە کە مرۆڤ لێی دوورکەوێتەوە, یوسنا وەڵامی دایەوە هاودەمی خراپ, یوشەعیش وەڵامی دایەوە: دراوسێی خراپ".

بەڵام لێرەدا ئەم دوو دەقە پەیوەندییان بەیەکەوە نییە!

نموونە قورئانییەکە واتە "ئەو پیاوەی کە چەند خوداوەندێك دەپەرستێت لەو بارەیەوە لێی تێك دەچێت, ئایا دەکرێت ئەو کەسە بەراورد بکەین بە ئیماندارێك کە تەنها خوای تاکو تەنیا دەپەرستێت" ئەمە (بلاشیر لە ترجمة القرآن–پاریس, 1957ز, لاپەڕە (492)دا ڕوونیکردووەتەوە".

لەبەرئەوە نموونە قورئانییەکە جیاوازییەکی جەوهەری نێوان ئیماندارێکی یەکتاپەرستو کەسێك کە باوەڕی بەفرەیی خواوەندەکان هەیە دەخاتە ڕوو.

لەکاتێکدا ئەو پارچە وەرگیراوە لە (الآباء) (11–13–14)وە باس لە ڕەوشت دەکاتو پەیوەندی بە بنچینەکانی ئاینەوە نییە, لەبەرئەوە هیچ پەیوەندییەك لەنێوان نمونە قورئانییەکەو دەقە (مەشناییە)کەدا نییەو پێدەچێت (سبیر) بەهیچ شێوەیەك لەواتای قورئانیی تێنەگات.

د ـ لەکۆتاییدا ئاماژە دەکەین بۆ ئەو مشتومڕە وروژێنراوە دەربارەی دەستەواژەی (محمد هو خاتم النبیین– موحەممەد کۆتاو دواهەمینی پێغەمبەرەکانە):

خوای گەورە لە ئایەتی (40)ی سورەتی (الاحزاب)دا دەفەرموێت: (مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَكِن رَّسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ وَكَانَ اللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيماً) (الأحزاب : 40 )

تاوەکو دەستەواژەی (خاتم–کۆتا) ڕاڤە بکات (هیرشفیلد) دەگەڕێتەوە بۆ (إصحاح سفر حجی الآصحاح (2), ئایەتی (23), لە تەفسیرەکەیدا لە پلەی بیستو دووهەمین (242) (أبحاث جدیدة) لاپەڕە (23)دا دەڵێت : (سفری 2، ئایەتی 23 چی دەڵێت؟

"لەم ڕۆژەدا ئەخزەك خوای سەربازان دەڵێت: ئەی زربابلی بەندەمو کوڕی سەئلتیئیل, پەروەردگار دەڵێت دەتکەم بە دواهەمینو کۆتا, چونکە من هەڵمبژاردووی, خوای سەربازان دەڵێت".

هیرشفیلد بۆی زیاد دەکاتو دەڵێت وشەی (خاتم–کۆتا) بەهەمان شێوە لە (سفر الملوك الأول)داو لە إصحاحی 21 ئایەتی (8)دا هاتووە "پاشان بەناوی ئاخابەوە نامەم نووسیو بە مۆرەکەی ئەو مۆرم کردو کۆتاییم پێ هێنا"[1] بەڵام لە (سفر التكوين الآصحاح 38 ئایەتی 8, ئەو مۆرە کەلەسەرەوە ناوی هاتووە بەواتای مۆرێك کەبە چاودێرییەوە بە سنگەوە هەڵواسرابێت, هەروەها لە (سفر إرمیا الآصحاح 22 ئایەتی 24 ئەو مۆرە بەواتای مۆرێك دێت کە لە دەستدا هەڵدەگیرێت ئەوەش لەبەر زۆر بەتەنگەوە بوونیەتی.

"تەنانەت من, پەروەردگار دەڵێت: ئەگەر (کنیاهو)ی کوڕی (یەهو یاقیم) پادشای (یەهوزا) مۆرێك بوایە لەسەر دەستی ڕاستم من لەوێدا لام دەبردی" ئەوەش هەمان واتاو ناوەڕۆکی ئەوەی هەیە کە لە (سفر حجی)دا هاتووە, مەبەست بە وشەی (خاتم) ئەوەیە کە خودا بە (حجی) دەڵێت: ئەو (زربابل)ی وەك خزمەتکارێکی بەڕێز هەڵبژاردووە".

[1] "ثم كتبت رسائل باسم آخاب وختمتها بخاتمه" (خاتمه) واتە (مۆرەکەی).

هورفیتزلە کتێبەکەیدا (دراسات قرآنیة) لاپەڕە (53)دا وا باس دەکات کە دەستەواژەی (خاتم النبیین) واتای "المصدق للنبیین–پەسەندکەری پێغەمبەران" دەگەیەنێت وەك ئەو (خاتم–مۆر)ەی کە گەواهی لەسەر ڕاستو دروستی نووسراوێك یان دیکۆمێنتێك (بڕوانامەیەك) دەدات.

بینا لەسەر ئەم تەفسیرە ئەرکی موحەممەد وەك بڕواپێکەرێك پەسەندکردن بووە.. تەنها ڕاستی پەیامە نێرراوەکان بۆ سەر ئەو پێغەمبەرانەی پێش ئەو هاتوون پەسەند بکاتو گەواهیان لەسەر بدات.

باشە لەم حاڵەتەدا موحەممەد چۆن چۆن دەتوانێت قایل بێتو گەواهی بدات بۆ پێغەمبەر گەلێکی جیاوازو کتێبە پیرۆزە جیاوازەکانو هەندێ جاریش لادراوو گۆڕراوەکان؟

لەگەڵ ئەوەشدا (سبیر) ڕاکەی پێشووی (هورفیتز) پەسەند دەکات (سبیر) "الخطابات التوراتیة" لاپەڕە (422–423).

بەڵام هەردوو تەفسیرەکە (بەرزبن) و (گەواهی دراوین) هەر ناپەسەندو نەشیاون.

تاکە ڕاڤەیەك کە پەسەندو گونجاو بێت لەگەڵ بەکارهێنانی زمانی عەرەبیدا ئەوەیە کە (خاتم) واتاکەی (دواهەمین)ە دەڵێین: (خاتم القوم أو ختیم) واتاکەی دواهەمینە, وە کۆتایی لەهەموو شتێکدا کۆتایی بەشەکانیەتی "لسان العرب, مادە ختم".

یەکێك لەناوەکانی پێغەمبەر (ﷺ) (خاتم)ە واتە ئەو کۆتا پێغەمبەرە, ئەوانەی کە نێرراون, هەروەها پێویستە وا بڕوانینە پێغەمبەر موحەممەد (ﷺ) کە بەهەموو بڕواو متمانەیەکەوە جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە: (إِنَّ الدِّينَ عِندَ اللّهِ الإِسْلاَمُ..) (تاکە دینێك لای خوا پەسەند بکرێت ئاینی ئیسلامە) ئایەتی (19) سورەتی (آل عمران).

(وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الإِسْلاَمِ دِيناً فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ..) (هەرکەسێك جگە لە ئیسلام ئاینێکی دیکەی بوێتو داوای بکات بەهیچ شێوەیەك لێی وەرناگیرێت) ئایەتی (85) سورەتی (آل عمران).

لەبەرئەوە شتێکی لۆژیکییە موحەممەد (ﷺ) بە کۆتا پێغەمبەر لەقەڵەم بدرێت چونکە ئیسلام لەلای خوای گەورە ئاینی حەقو ڕاستییە.

ئەو زانراوەی بڕیاری ئەوە دەدات کە موحەممەد (ﷺ) پێغەمبەری ئیسلامو پەیامەکەشی کۆتایی پەیامەکانە فەرموودەگەلێکی جیاواز بڕیاری لەسەر دەدەنو جەختی لەسەر دەکەن کەئەو دواهەمینی پێغەمبەرەکانە کاتێك (درودو سڵاوی خوای لەسەر بێت) بەخۆی دەفەرموێت "أنا خاتم النبیین– من دواهەمینی پێغەمبەرەکانم":

- بوخاری – کتاب المناقب – فەرموودەی 18.
- موسلیم – کتاب الفضائل – فەرموودەی 22.
- ئەبوداود – کتاب الفتن.
- الترمذي – کتاب الفتن– فەرموودەی 43.
- الدارمی – کتاب المقدمە – فەرموودەی 8.
- ابن حنبل –الباب الثاني –(398–412) وە الباب الثالث (79–248) وە الباب الرابع (81–84–127–128)وە الباب الخامس (278).

فەرموودەیەك کە زۆرتر لەنێوان ئەو فەرمودانەدا لەڕووی شێوەوە هاویەشە ئەوەیە "مثلي ومثلي الأنبیاء من قبلي کمثل رجل بنی بیتا فأحسنه وجمله الا موضع لبنة فجعل الناس یزورونه ویعجبون به ویقولون لو وضعت هذه اللبنة, فأنا اللبنة وأنا خاتم النبیین".

واته "نمونەی من و نمونەی پێغەمبەرەکانی پێش خۆم وەك وێنەی ئەو پیاوە وایە خانویەك دروست بکات و باش دروستی کردبێت و جوانی کردبێت تەنها جێگای خشتێکی مابێت، وای لەخەڵکی کردووە سەردانی بکەن و پێی سەرسام بن لەو کاتەدا دەڵێن خۆزگە ئەو خشتەش دادەنرا، دەی ئەو خشتە منم و من دواهەمینی پێغەمبەرانم"

لەبەرئەوە دەربارەی موحەممەد (ﷺ) خۆی هیچ گومانێکی تێدا نییە کە ئەو بەکۆتا پێغەمبەر دادەنرێت و وە پێغەمبەر لەدوای ئەوە نایەت چونکە کۆشکی پێغەمبەرایەتی بەو تەواوکراوە.

وشەیەکی دیکەیە لە وشەکانی قورئانی پیرۆز، زۆرێك لە عەرەبناسە لایەنگرەکانی نژ بە ئیسلام هەوڵیان داوە ئەوە بسەلمێنن وشەی (فرقان) کە شەش جار لە قورئانی پیرۆزدا باسکراوە بنچینەیەکی یەهودیو مەسیحی هەیە.

وشەی (فرقان) شەش جار لەم ئایەتانەی خوارەوەدا هاتووە:

1- خوای گەورە لە ئایەتی (53)ی سورەتی (البقرە)دا دەفەرموێت: (وَإِذْ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ وَالْفُرْقَانَ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ) (البقرة : 53 ).

2- هەروەها لە ئایەتی (185)ی هەمان سورەتدا دەفەرموێت: (شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِيَ أُنزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِّنَ الْهُدَى وَالْفُرْقَانِ..).

3- لە ئایەتەکانی (3و4)ی سورەتی (آل عمران)دا فەرمویەتی: (نَزَّلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقاً لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَأَنزَلَ التَّوْرَاةَ وَالإِنجِيلَ* مِن قَبْلُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَأَنزَلَ الْفُرْقَانَ إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ بِآيَاتِ اللّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَاللّهُ عَزِيزٌ ذُو انتِقَامٍ).

4- لە ئایەتی (42ی سورەتی (الانفال)یشدا خوای گەورە دەفەرموێت: (وَاعْلَمُواْ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَيْءٍ فَأَنَّ لِلّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ إِن كُنتُمْ آمَنتُمْ بِاللّهِ وَمَا أَنزَلْنَا عَلَى عَبْدِنَا يَوْمَ الْفُرْقَانِ يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ وَاللّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) (الأنفال : 41 ).

5- هەروەها خوای گەورە لە ئایەتی (48)ی سورەتی (الانبیاء)دا فەرمویەتی: (وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى وَهَارُونَ الْفُرْقَانَ وَضِيَاء وَذِكْراً لِّلْمُتَّقِينَ) (الأنبياء : 48 ).

6- خوای گەورە لە ئایەتی (1)ی سورەتی (الفرقان)دا دەفەرموێت: (تَبَارَكَ الَّذِي نَزَّلَ الْفُرْقَانَ عَلَى عَبْدِهِ لِيَكُونَ لِلْعَالَمِينَ نَذِيراً) (الفرقان : 1 ).

(بلاشیر) وشەی (فرقان)ی لەو شەش ئایەتەدا بە واتای (إنقاذ–ڕزگارکردن) وەرگێڕاوە, وە سێ ڕۆژهەڵاتناسی یەهودیش هەن ئەوانیش:

(گیگر) لە کتێبەکەیدا (ماذا إقتبس محمد من اليهودية– موحەممەد چی لە یەهودیەتەوە وەرگرتووە) لاپەڕە (99), ساڵی (1902ز), هەروەها (هیرشفیلد) لە کتێبەکەیدا (بحوث جديدة في القرآن– لێکۆڵینە نوێیەکان دەربارەی قورئان) لاپەڕە (68) ساڵی (1902ز), (هورفیتز) لەکتێبەکەیدا (بحوث القرآن– لێکۆڵینەوەکانی قورئان) لاپەڕە (76–77) ساڵی (1926ز) ئەم سیانە وایانخەیاڵیان کردووە کە وشەی (فرقان) بریتییە لەوشەی عیبری بەعەرەبیکراوو بنچینەکەی (بیرکی)یە (مرجلیوث)یش لەکتێبەکەیدا (موسوعە الدين والأخلاق– ئینسکلوپیدیای ئاینو ئەخلاق)دا جەخت لەسەر ئەوە دەکات کاتێك کە دەڵێت: (بیرکی) –أبوت– وەرگیراوە لە کتێبی (الآباء) ئەویش کتێبێکە لە (مەشنا)و پێکدێت لە پەندو دانست –حیکمەت–ی ئاینیو مۆراڵی دانشمەندو زانا یەهودییەکان, (الآباء) هی سەردەمی (سمعون العادل)ە لە نزیکەی ساڵی (330پ.ز)وە هەتاوەکو کتێبەکەی (مەشنا)لە (220ز)دا (إبراهام المالح– فەرهەنگی نوێی تەواو/ عیبری– فەرەنسی".

کتێبی (الآباء) لە پێنج بەش پێکهاتووەو بەشی پێنجەمی لەشێوازو ناوەڕۆکدا لە چواربەشەکەی تری جیاوازە.

ئەو (دانست– حیکمەت)انەی کە تیایدایە نووسەرەکەیان نەناسراون, جگە لە پارچەکانی کۆتایی, لەکاتێکدا لە چوار بەشەکەیدا دانستەکان دەبینین ناوی بێژەرەکانیانی پێوەیە, گەورەترین شتێك کە لەو وتارانەدا هەیە ئەوەیە بەشێوەیەکی ڕوونو ئاشکرا لە یەهودیەت دەدوێت و لە حەقیقەتێکەوە سەرچاوەی گرتووە کە پێکدێت لە کتێبی (الصلوات القديم– درودە کۆنەکان) وەك بەشێك لە دروشمەکانی خزمەتکرینی خوا لە پاش نیوەڕۆی ڕۆژانی شەممەداو لە میانەی مانگەکانی هاویندا (الموسوعه اليهوديه– ئینسکلۆپیدیای یەهودی) بەرگی یەکەم لاپەڕە (81–82) نیویۆرکو لەندەن ساڵی (1901ز).

لەمیانەی ئەم زانیاریانەدا ئەوەمان دەستدەکەوێت و ڕوونیشە ئەستەمە وشەی (فرقان) بەواتای ئەو حیکمەتو پەندانە بێت کە بە (بیرکی) ناو دەبرێن ئەوەش لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە:

أ- دانەری ئەو پەندانە بەناو ناسراون و لەناویاندا نە موساو نە هارون هیچ کامیانی تێدا نییە, ئیتر چۆن موحەممەد (ﷺ) توانی ئەم (بیرکی – پەند)انە لەموساو هارونەوە هەڵبگرێتەوە ؟

ب - ناوەرۆکی (بیرکی) هەرگیز ناکرێت بە کتێبێکی پیرۆزی وەك تەوراتو ئینجیل لە قەڵەم بدرێت یان قورئانێکی شایستە ترو لەپێشتر.

ج - دانپێدانانی هورفیتز خۆی ئەوەیە ئەگەر وشەی (بیرکی) بگونجێتو بسەپێت بەسەر ئایەتەکانی (1–4)دا ئەوا بەسەر چوار ئایەتەکەی تردا جێبەجێ نابێت وە لەبەرئەوە هەرکەسێك بڕوای وابێت کە وشەی (فرقان) واتە (بیرکی) ئەوا ئەو کەسانە گێلیەکی دەگمەن و نەخۆشییەکی شێتی وای لێکردوون خەیاڵی ئەوە بکەن کە ئەو وشەیە لە عیبرییەوە یان یەهودییەتەوە هاتووە.

ئێستاش هەندێك لەو ڕۆژهەڵاتناسە مەسیحیانە دەخەینە ڕوو کە باسیان لەم مەسەلەیە کردووە, لەنێوان ئەوانەشدا:

- نولدکە لە کتێبەکەیدا (اسهامات جدیده فی العلوم اللغویه السامیه) لاپەڕە (10) ساڵی (1910).

- لیدسبارسکی لە (z.s) لاپەڕە (90–92) ساڵی (1922).

- شفالی لە (z.d.m.e) لاپەڕە (134) ساڵی (1898ز.هەروەها کتیبی (تأریخ القرآن ) لاپەڕە (34) تێبینی ژمارە (1).

- أ.ی. فنسنك لە (دائره المعارف الاسلامیه) چاپی یەکەم.

- ر.بیل (أصول الاسلام في بیئته المسیحیة) لاپەڕە (118), ساڵی (1926ز, وە (مدخل الی القرآن) لاپەڕەکانی (225و 229) ساڵی (1938ز.

- آرثر جیفري (الألفاظ الأجنبیة في القرآن) –باردوا– لاپەڕەکانی (225–229) ساڵی (1935ز.

خاڵی هاوبەش لەوەرگێڕانەکەیاندا ئەوەیە کە وشەی (فرقان) بریتییە لە شێوە عەرەبییەکەی وشەی سریانی (فرقانا)و وشەی یەهودی ئارامیی (فرقان) کەبەواتا مەسیحییەکەی مانای (انقاذ – ڕزگاربوون ) دەگەیەنێت, (بلاشیر) خۆشی وا وەریگێڕاوە کە وشەی (فرقان) واتە (إنقاذ– ڕزگارکردن) هەروەها (رودی باریت) لە وەرگێڕانەکەیدا بۆ قورئان (القرآن– شتودگارت) ساڵی (1926ز) بەواتای (إنقاذ) وەرگێڕاوە.

بەسوودیشە ئەگەر تێبینی بکەین (ر. بیل) لە تێبینییەکەیدا دەربارەی وشەی (فرقان)کە لە کتێبەکەیدا بەناونیشانی (مدخل الی القرآن) بڵاوی کردەوە ، لە لاپەڕەکانی (136و 138) أدنبرگ ساڵی (1953ز) لەوێدا تێکەڵیەك دروستدەکات لەنێوان ئەو تەفسیرەی کە ڕاڤە کارە مسوڵمانەکان بەدوایداچوون و ئەوەیە کە (فرقان) واتە (تفرقه– دووبەرەکی) وە لە نێوان تەفسیری ئەو کتێبە مەسیحییەی کەبانگەشەی ئەوە دەکات گوایا وشەی (فرقان) لەوشەی سریانی (فرقانا)وە هاتووە واتە (إنقاذ– ڕزگارکردن), وە ئەم تێکەڵکردنە نەشیاوە لێکۆڵینەوەکەی دووچاری لێڵی و ناڕیاری کردووە لەوێدا کە دەڵێت "لەوانەیە سەرچاوەی وشەکە وەرگیرابێت لە سەرچاوە مەسیحییەکانەوە بەڵام موحەممەد پێویست بوو نێوانی وشەکەو ڕەگە عەرەبییەکەی (فرق) بەیەکەوە ڕێکبخات وە واتاکەی بە سانایی واتە دووبەرەکی لەنێوان کۆمەڵی خواناسان و بێ باوەڕاندا وە کارەکە لە دۆخەکانی وەحیشدا هەروەها بووە کە بۆ یەهودییەکان تەوراتو بۆ مەسیحییەکانیش ئینجیل, هەروەها بۆ مسوڵمانەکانیش کتێبەکەیان کە بریتییە لە قورئان" لەبەر ئەوەشە کە ئایەتی (41)ی سورەتی (الفرقان)ی بەم شێوەیە ڕاڤەکردووە: سەرکەوتن لە شەڕی (بەدر)دا بەتەنها ڕزگاری نەبوو بۆ تاقمێکی کەم لەمسوڵمانان ئەوانەی لەگەڵ موحەممەد دەرچوون بۆ ڕێگرتن لەکاروانەکە وە ڕووبەڕوو خۆیان لەگەل سوپادا بینییەوە, بەڵام دووبەرەکییەکی کۆتایی

بوو لەنێوان شوێنکەوتوانی موحەممەدو بی باوەڕەکانی مەککەدا, لەبەرئەوە هەردوو تیپەکە (کۆمەڵەکە) پاش خوێن ڕشتن بوونە دوژمن.

بێهودەییو گاڵتەجاڕی ئەم تەفسیرە لەوەدایە کە بانگەشەی ئەوە دەکات گوایا پێغەمبەر موحەممەد (ﷺ) وشەی سریانی (بورکانا)ی خواستووەو واتاکەی گۆڕیوە بۆ وشەی عەرەبی (فرق– دووبەرەکی), ئەی بۆچی ڕاستەوخۆ لە سەرچاوە عەرەبییەکەوە وەری ناگرێت ئەگەر مەبەستی بێت؟ پاشان ئایا لێرەدا هیچ دیکۆمێنتێك هەیە ئەوە ڕون بکاتەوە کە وشەی سریانی(بورکانا) لەو ناوەندەدا کە پێغەمبەر موحەممەد (ﷺ) تێیدا ژیاوەو تێکەڵاوی کردووە ئەوەندە ناسراوو بەناوبانگ بوو بێت تاوەکو بیخوازێتو واتاکەی بگۆڕێت بۆ شێوازی ئاخاوتنی عەرەبی بەشێوەیەك کە لەوتندا لەیەك بچن؟

بەڕاستی ئەم هۆیانە بەسن بۆ بەرپەرچدانەوەو پوچەڵکردنەوەی دەرهاوێشتەکەی (ریچارد بیل)ی ڕۆژهەڵاتناسو هەڵەی ئەو کەسانەی کە شوێن ڕێگەکەی کەوتن, م.وات (محمد فی المدینه) لاپەڕە (160) (رودی باریت) (موسوعه الاسلام) چاپی دووەم.

**ڕاڤەی ئێمە**

یەکەم: گێلیەتییە وشەی (فرقان) بدرێتە پاڵ وشەی عیبری (بیرکی) کە بە واتای –فصول– جیابوونەوە دێت.

دووەم: ئەو ڕایانەی وشەی (فرقان) دەگێڕنەوە بۆ وشەی سریانی (بورکانا) واتە (ڕزگارکردن) ئەویش بەجۆرێك لە گێلیەتی دەژمێردرێت.

ماوەتەوە ئەو واتاو لێوەرگرتنە لەبەرچاوبگرین کە ڕاڤەکارانی قورئانو زانایانی فیقهو زمان لە عەرەبە مسوڵمانەکان لەسەری ڕێککەوتوون, لەبەرئەوە (کازیمیرسکی) پاش موتالاکردنی فەرهەنگە عەرەبییەکان ڕای ئەو زاناو ڕاڤەکارانەی لەمەی خوارەوەدا کورت کردووەتەوە:

(فرقان):

1- سەرچاوەی کردارەکە: (فرق–جیاوازی).

2- هەموو ئەوەی مانای جیاوازی دەگەیەنێت, جیاوازی نێوان چاکەو خراپە, نێوان کاری شیاوو نەشیاو, وە ڕۆژی فرقان (یوم الفرقان) ڕۆژی جیابوونەوەیە, ئەو ڕۆژە ڕۆژی جەنگی (بەدر)ە, یەکەم سەرکەوتنی موحەممەد (ﷺ) بەسەر کافرو بێ باوەڕەکاندا.

3- واتە کتێبی پیرۆزی (خاوەن پەیامەکان) وەك ئینجیل بەتایبەتیش قورئان, وە بەپشت بەستن بەمانە پێشنیازی ئەم ڕاڤەیەی خوارەوە دەکەین:

کە (فرقان) سەرچاوە (چاوگی) کرداری (فرق)ەو واتاکەی:

جیاکرنەوە لەنێوان خێرو شەڕدا, لەنێوان کاری شیاوو نەشیاودا, بەو پێودانگەش دەبینین وشەی (فرقان) دەلالەت لەسەر سەنگی جیابوونەوەی نێوان خێرو شەڕ دەکات, لە کۆتاییدا کتێبی پیرۆز ئەو سەنگو پێوانەیەیەو گوزارشتی لێدەکات.

کەواتە ئەگەرئەم تەفسیرە جێبەجێ بکەین بەسەر شەش ئایەتە قورئانیەکەدا ئەمەی خوارەوەمان دەست دەکەوێت:

یەکەم: لە ئایەتەکانی (53)ی(البقره)و (48)ی (الأنبیاء) وشەی (فرقان) دەلالەت لە جیاکرنەوەی نێوان خێرو شەڕو حەڵاڵو حەرام دەکات.

دووەم: مەبەست لەوشەی (فرقان) لە ئایەتی (4)ی (آل عمران)و ئایەتی (1)ی سورەتی (الفرقان) قورئانە.

سێیەم: مەبەست لە ئایەتەکانی (185)ی (البقرە)و (41)ی (الأنفال) جیاکردنەوەیە لەنێوان خێرو شەڕو حەقو ناحەق لە ئایندا.

بەمشێوەیە ئەوە ڕەد دەکەینەوە کە ئەم وشەیە تەفسیرێکی دیکەی بدرێتە پاڵ لەجۆری (الانقاذ– ڕزگارکردن)، یان ئەوەی هاوشێوەی ئەوە لە زمانەکانی دیکەدا وەك (Rettung) بەزمانی ئەڵمانی.

(دیڤید صموئیل مارجلیوس) ئاشکرایە هەرسێ ناوەکە ناوی یەهودین, ئەم پیاوە لە خێزانێکی یەهودییەوە هاتووە, وشەی (مارجلیوس) بە عیبری واتە قسە دەکات, وە لە کۆنترین ئەندامە ناسراوەکانی ئەم خێزانە (یعقوب فون ریتسبورگ)ە یەکێك بووە لە حاخام –پیاوە ئاینییەکانی– ریتسبۆرگ, ئێستا (راتیسبون)ە ، لە ئەڵمانیا (صاموئیل)ی کوڕی لەلایەن (سیجسمنود)ی یەکەمەوە بە سەرۆکی کۆمەڵگای یەهودی لە پۆڵۆنیا دیاریکرا.

(دیڤد صاموئیل مارجلیوس) ساڵی (1858ز) لەدایکبووەو منداڵی یەکەمی (خرقیال مارجلیوس) بووە کە ئاینی مەسیحی وەرگرتووەو بووەتە قەشەیەکی مەسیحی, لەبەرئەوەی (داڤید)یش وەك باوکی دەبێتە مەسیحیو لە ساڵی (1899ز)دا دەبێتە قەشە, بەڵام بەدڵو بە گیان هەربە یەهودی مایەوەو بەهەمان شێوە گرنگیدا بە لێکۆڵینەوە یەهودییەکان کەلەناویدا ناوی چەند کتێبێکیان دێنین:

1- ڕاڤەی کتێبی (دانیال)ی نووسەر (یافث بن عەلی) بڵاوکردنەوەو وەرگێڕانی (دایڤید صاموئیل مرجلیوس) ساڵی (1899ز).

2- (مکانه الاكليرية في الأدب السامى) ساڵی (1890ز).

3- (أصل العبرية فى الاكليروس) ساڵی (1899ز).

4- (العلاقات بين العرب وبني إسرائيل قبل ظهور الاسلام) ساڵی (1921ز, ساڵی (1924ز) چاپکرا.

(مارجلیوس) بەدرێژایی تەمەنی خۆی بۆ دژایەتیکردنێکی سەرسەختانەی دژ بە ئیسلام ئامادەکرد.

ئەم دەمارگیرییە توندوتیژەی پاڵی پێوەنا قسەو قسەڵۆکی زۆر سەرسوڕهێنەر بخاتە ڕوو کە جگە لە هێرشکردنە سەر پێغەمبەری خوا (ﷺ)و بەکەم نیشاندانی پەیامەکەی هیچ مەبەستێکی تری لەو قسانە نەبووە.

پێویستە لێرەدا هەندێك لەو قسەڵۆکانە ئاشکرابکەین کە قبوڵکردنیان لەلایەن ڕۆژهەڵاتناسەکانی دیکەوە ڕەدکراونەتەوە.

**یەکەم: بنچینەی وشەی مسلم**

یەکێك لەو بانگەشەکردنە نامۆو سەرسوڕهێنەرانە ئەو بانگەشەیە بووە کە دەڵێت وشەی (مسلم) لە بنچینەدا واتە یەکێك لە شوێن کەوتووانی (موسەیلەمە) موسەیلەمە ئەوکەسەی کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی کردووە و لە سوننەتی پیرۆزی پێغەمبەردا بە (درۆزن) ناسراوە, (مارجلیوس) ئەم( ڕا) دەمارگیرییەی لەوتارێکدا دەربڕیوە کە لە گۆڤاری (المجمع الملكي الآسيوي) لەلەندەن و لە لاپەڕە (476)دا بڵاویکردوەتەوە, لەبەرئەوە (چارلز. ج. لیل) کە عەرەبناسێکی ئینگلیزی گەورەیە لەهەمان گۆڤارو لەلاپەڕە (771)ی ساڵی (1903ز)دا بەرپەرچی دەداتەوە.

(چالز ڕاکەی (مارجلیوس) بەدرۆ دەخاتەوەو وەڵامێکی توندو تیژی وەهای دەداتەوە بەشێوەیەك ئیتر (مارجلیوس) ئەم ورێنانەی لە کتێبەکانی داهاتویدا دووبارە نەکردەوە, من پرسیاری ئەوەدەکەم چۆن دەبێت (مارجلیوس) کەلەتەمەنی (45 ساڵیدایە لەو کاتەدا هەڵەیەکی لەو شێوەیە ئەنجامبدات, ئایا هەرگیز قورئانی نەخوێندۆتەوە؟ ئایا سەربوردەی ژیانی پێغەمبەرایەتی نەخوێندووەتەوە؟ ئەی هیچ کتێبێکی دەربارەی مێژووی ئیسلام نەخوێندووەتەوە؟ چۆن دەبێت سیفەتی (اسم فاعل) (مسلم) لەناوی (موسەیلەمە)وە وەرگیرابێت, ئەگەر کەمترین شتی لە زمانی عەرەبی بزانیایە ئەوەی دەزانی کە درانە پاڵی وشەی (موسەیلەمە) (موسەیلەمی)یە نەك (مسلم) بەڵام دەمارگیرییەکەی کوێری کردووە.

**دووەم: (فرقان)و (پیرکی أبوت Pirke Abbot)**:

لەبەشی ڕابردوودا بێهودەیی وەك یەکبوونی نێوان وشەی (فرقان)و (پیرکی)مان بینی, لەبەرئەوە (مارجلیوس) بووەتە قوربانی هاوڕابوونی (هیرشفیلد)ی پێشینەی خۆی کە لە کتێبەکەیدا (بحوث جديدة في فهم وتفسير القرآن) لەندەن

–1902ز– وا خەیاڵی کردووە کە وشەی (فرقان) لەبەرامبەر وشەی (پیرکی)دا دێت پیرکی ناونیشانی کۆمەڵێك (پەندە) کە حاخامە یەهودییەکان دایانناون.

**سێیەم: دەربارەی ئیبراهیم**

لەوتارێکدا لە ژێر ناونیشانی (محمد– موسوعة الأدیان والاخلاق) بەرگی (8) لاپەڕەکانی (871و880) أیدنبرگ ساڵی (1915ز)دا کە (مارجلیوس) شوێن ژمارەیەك لە حوکمی کزو لاواز کەوتووە کە پشت بە هیچ دیکۆمێنتێکی مێژوویی نابەستن یەکەمجاریش ئەوەی پەیوەندی بە (ئیبراهیم)ەوە هەیە دەخەینە ڕوو.

أ- دەڵێت ناگونجێت کەناوی (ئیبراهیم) لەمەککەدا ناسراوبووبێت بەرلەوەی کە موحەممەد بیڵێت.

ئەمە وانیە کە دەیڵێت, لەبەرئەوە سەری خۆی داوە لە دیوار, چونکە خودان پەیامەکان کە جولەکەو گاورەکانن لەسەر ئەوە ڕێك نەبوون کە پەیوەندی هەبووە لەنێوان ئیبراهیمو هۆزەکانی باکووری نیمچە دوورگەی عەرەبیدا, بەڵام بەوەی کە یەهودیو مەسیحی بەر لە ئیسلام لەمەککەدا هەبوون وەك (مارجلیوس) خۆشی دان بەوەدا دەنێت ئیتر چۆن دەبێت یەهودو گاورەکان بەر لەهاتنی ئیسلام ناوی ( ئیبراهیم ) یان نەبردبێتە ناو شاری مەککەوە, وە بۆچی چاوەڕێی هاتنی موحەممەدیان کرد (ﷺ) تاوەکو ناوی ئیبراهیم لەمەککەدا بناسێنێت؟ بەڕاستی بێهودەیی ئەم گریمانەیەی (مارجلیوس) زۆر بەڕوونی دەکەوێتە بەرچاو.

ب- هەروەها وای دەرخستووە کە گەلەکەی ئیبراهیم لای (صابئە)کانی (حەڕان) ناسراوبووە, زیاد لەوەش دەڵێت "وا دیارە کە حەڕانییەکان بەبت پەرستەکان ناوبراون, وە ئەوانەش کە بەم ناوەوە ناساندوونی دراوسێ گاورەکانیان بوون, لەوانەیە ئەمە ڕاڤەی نادیاری وشەی (حنیف– ڕاستگۆ) بکات کە قورئان بەسەر ئاینەکەی ئیبراهیمدا بڕیویەتی, وە بە هاومانای وشەی (مسلم) لەقەڵەمی داوە".

ئەم دوو گریمانەیە هیچ بنەمایەکی ڕاستیان نییە کە بریتین لە:

1- خوا پەرستی ئیبراهیم لە (حەران)دا بووە.

2- گاورەکان ناوی (حنفاء)یان بەسەر حەرانییەکاندا بڕیوە, (مارجلیوس) ئەم بانگەشانە فڕێدەدات بەبێ ئەوەی پشت بە هیچ سەرچاوەیەك ببەستێت, لەلایەکی دیکەشەوە هیچ سەرچاوەیەك هیچ کام لەم دوو گریمانەیە ناسەلمێنن کە خەیاڵی نەخۆشی (مارجلیوس) خولقاندوونی.

**چوارەم: نوێژی مسوڵمانەکان لەکاتی جەنگەکانداو مێژووی فاتحە**

أ- (مارجلیوس) بەشێوەیەك تێکەوتووە کەمایەی پێکەنینە, کاتێك بانگەشەی ئەوەی کرد گوایە دروشمەکانی نوێژی مسوڵمانان پەیوەستە بە مەشقە سەربازیەکانەوە کە بەر لەدەرکەوتنی سوپا نەناسراو بوون.

ب- (مارجلیوس) بەمە دەگاتە ئەوەی (فاتیحە) کە پێویستە لە هەموو نوێژێکدا بخوێندرێت لە پاش کۆچ دابەزیوە, لەکاتێکدا بەر لەکۆچ موحەممەد سوپای دانەمەزراندبوو.

بەڵام ئەم بانگەشەکردنە منداڵانەو بی ئەنجامە, منداڵانەیە چونکە گەوجێتیە وا بزانین دروشمەکانی نوێژ وەك مەشقکردنە سەربازییەکانە ، بێ ئەنجامیشە چونکە ئەوەی کە دەڵێت (فاتیحە) سورەتێکی (مەدەنی)یە واتە گەورەمان موحەممەد (ﷺ)و هاوەڵەکانی بەرلەکۆچکردن بۆ مەدینە نوێژیان نەکردووە, لەکاتێکدا ئەوە لەکتێبەکانی فەرمودەدا جێگیرکراوە کە پێغەمبەر (ﷺ) جەختی لەسەر ئەوە کردووە کە نوێژ دروست نییە بۆ کەسێك سورەتی (فاتیحە) نەخوێنێت "بڕوانە بوخاری –باب الآذان– فەرمودەی ژمارە (93), وە (ترمذي, باب الصلاة, فەرمودەی ژمارە (63), (النسائی, إفتتاح, فەرمودەی ژمارە (24), (ئیبن ماجە, کتاب الصلاة, باب إفتتاح القراءة, فەرمودەی (2).

جا لەبەرئەوە لەسەرچاوە ئیسلامییەکاندا جەخت لەسەر ئەوە کراوەتەوە کە (فاتیحە) لەکۆنترین سورەتە قورئانییەکانە, ئەگەر بەڕەهایش لەهەموویان کۆنتر نەبێت "الدیاربکری, (الخامس), السیوطي, (الاتقان) لاپەڕە (54)".

بەڵام (مارجلیوس) بەمێژوویەکی درەنگ وەختی سورەتی (فاتحە) گەیشتووە, ئەویش بەپشت بەستن بە تەفسیرێکی هەڵە بۆ ئایەتی کۆتایی ئەم سورەتە, کە بریتییە لەوەی گوایا (المَغضُوبِ عَلَیهِمْ) جولەکەکانن‌و (والضالین)یش گاورەکانن.

بەوەی کە جەنگەکانی موحەممەدو یەهود تا پاش کۆچ دەستیان پێنەکرد, هەروها دوژمنایەتیشی لەگەڵ گاورەکاندا تا ساڵانێکی پاش کۆچ دەستی پێنەکرد, لەبەرئەوەیە (مرجلیوس) لە سەرچاوەی پێشوودا لاپەڕە (875)دا دەڵێت: کە (فاتحە) لەسەردەمێکی درەنگوەختی سەردەمی پێغەمبەرایەتیدا دابەزیوە. ـ واتە وەك ئاماژەمان پێدا پشتی بەڕاڤەکردنە هەڵەکەی (المَغضُوبِ عَلَیهِمْ)ء (الضالین) بەستووە. –وەرگێڕ–.

هەروەها (بلاشیر)یش لەوەرگێڕانەکەیدا بۆ قورئان‌و لەلاپەڕە (29)دا ئەوەی ڕونکردووەتەوە.

ئەم تەفسیرە لەبەربوونی نەفی لەدەستەواژەی (ولاالضالین)دا پشتی پێنابەسترێت, وە لە حەقیقەتدا بابەتەکە بەشێوەیەکی گشتی پەیوەستە بە هەموو ئەو کەسانەوە کە ئیماندارن".

تەنانەت (روودی پاریت) لە کتێبەکەیدا (القرآن تعلیق وشرح) لەلاپەڕە (12)دا جەخت لەسەر ئەوە دەکات ئەم وەرگێڕانەی کە گوایە (المَغضُوبِ عَلَیهِمْ – غەزەب لێگیراوەکان– یەهودییەکانن‌و (والضالین –گومڕاکانن) گاورەکان بن دیاری کردنێکە بیانوو _بەڵگە– هێنانەوە بۆی زەحمەتە.

هەروەها (س.د.گواتین) لە دیراسەکردنەکەیدا (الصلاة في الاسلام– دراسات في التأریخ والتعالیم الاسلامیة) لاپەڕە (82و84) لیدن (1966ز) ئەویش جەخت دەکاتەوە کە (فاتیحە) بەهەموو دەقەکەیەوە لەهەموو نوێژێکداو بەکاتێکی زۆر بەرلەکۆچ لەهەموو نوێژێکدا بەکارهاتووە, هەروەها لەم بارەیەوە تێبینی ئەوەدەکەین کە ئەوەی (گوڵدتسهیر) وا باسی دەکات گوایە (فاتیحە) کۆ نوێژێکی گاورانەی (أبوی) بووە لەلای مسوڵمانەکان بەهەموو شێوەیەك وتەیەکی درۆیە, چونکە هیچ پەیوەندییەك نییە لە نێوان هەردوو شێوازەکەدا ئەوە ئەگەر هەریەکەشیان دژو پێچەوانەی ئەوی تریان نەبێت .

أـ فاتیحە جەخت لەسەر هەژموونی خوای گەورە دەکات بەسەر جیهان‌و بەسەر ڕۆژی دواییدا, لەکاتێکدا (قداس الأبوي) کۆ نوێژی گاورەکان بەبەرزڕاگرتنی ناوی خوا واز دەهێنێت . ب ـ فاتیحە جەخت لەسەر تاقانەیی‌و تەنیایی خوا دەکات لەکاتێکدا کۆنوێژی گاورەکان جەخت لەسەر باوکایەتی خوا دەکات.

ج ـ فاتیحە جەخت لەسەر ملکەچبوونی مرۆڤو کڕنووشبردنی دەکات چونکە پێویستی بە یارمەتی خوای گەورە هەیە, لەکاتێکدا کۆنوێژی گاورەکان (قداس) فەرمان بەسەر خودا دەداتو دەڵێت:

"ئەمڕۆ ئەو نانەمان بدەرێ کە پێویستمانەو لەو گوناهانەمان خۆش بە کەبەرامبەر تۆ کردوومانە, هەروەك چۆن ئێمە لەگوناهو هەڵەی ئەوکەسانە خۆش بووین کە هەڵەیان لەبەرامبەرماندا کرد" ئای لەو لەخۆبایی بوونە لەهەمبەر مافی خوادا, ئەوانە بەجۆرێك قسەی لەگەڵ دەکەن وەك ئەوەی لەگەڵ خوادا یەکسان بن, بۆ نمونە دەڵێن "دووچاری گومڕایی‌و سەرگەردانیمان مەکە" ئایا ئەمە نوێژە یان یان فەرمانکردن یان ئاگادارکردنەوە؟.

پێچەوانەبوونی گیانی فاتیحە ئاشکرایە لەگەڵ گیانی کۆنوێژە ئەبەویەکەی مەسیحیدا, کەواتە لەکوێوە (گوڵدتسهیر)و ئەوانەی وەك (بلاشیر) بەبێ بیرکردنەوە شوێن هەنگاوەکانی کەوتوون توانیان جەخت لەسەر ئەوە بکەن کە (فاتیحە) بریتییە لەکۆنوێژی ئەبەوی گاورەکان لە ئیسلامدا, بەڕاستی (مارجلیوس) پێچەوانەی حەقیقەت دەجوڵێتەوەو فێڵ دەکات کاتێك دەڵێت "ئەو نزایەی کە لەگەڵ کۆنوێژی ئەبەویدا یەکدەگرێتەوە فاتیحەیە".

**پێنجەم: ڕۆژوو، حەرامکردنی جۆرەکانی ئارەق**

له ئاكامی كەوتنە كاریگەری فیكری سیستمی سەربازییانەیەوە (مەرجلیوس) ویستویەتی ڕێنماییەكان و شتە یاساغكراوەكان لە ئیسلامدا بەو بیرۆكەیەی خۆی ڕاڤە بكات.

بەڕای ئەو ڕۆژوو لەڕەمەزاندا سیستمێكی سەربازییە, لەلایەكەوە جەنگاوەرەكان لەسەر خۆڕاگری لەبەرامبەر نەبوونیدا ڕادەهێنێتو لەلایەكی دیكەشەوە لەسەر گۆڕینی شەو بەڕۆژ ڕایان دەهێنێت "سەرچاوەی پێشوو".

بەڵام ئەگەر ئەو هۆیە وای كردبێت كە موحەممەد لەپێناویدا یاسای ڕۆژوو دابنێت ئەی بۆچی ڕۆژووی بەسەر كەسانێكی ناجەنگاوەریشدا فەرزكردووە وەك ژنانو منداڵان؟!

هەروەها (مارجلیوس) بانگەشەی ئەوە دەكات و دەڵێت: كە حەرامكردنو یاساغكردنی ئارەق لە قورئاندا (يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَا أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا وَيَسْأَلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ الْعَفْوَ كَذَلِكَ يُبيِّنُ اللّهُ لَكُمُ الآيَاتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ) (البقرة : 219 ). (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالأَنصَابُ وَالأَزْلاَمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ) (المائدة : 90 ).

وا دەردەكەوێت دەگەڕێتەوە بۆ سیستمێكی سەربازی وە ئەمەش ڕاستی بیرۆكەكەی (و. ج بلگریف) دەسەلمێنێت كە لە كتێبەكەیدا بەناوی (شرق ووسط الجزیرة العربیة) لاپەڕە (428) لەندەن (1865ز), وە ئەم ڕەفتارە یاساغكراوەش بەبێگومان دژ بە مەرامو نیازی مەسیحییەتە "سەرچاوەی پێشوو".

بەڵام هەردوو ڕاكە ڕای (مەرجلیوس)و ڕاكەی (بلگریف) حساب بۆ پلە بە پلەو یەك لەدوای یەكهاتنی یاساغكردنی ئارەقو ئەو بارودۆخە ناكەن كە مسوڵمانە ڕاڤەكارەكانی قورئان زۆر بەڕوونو ئاشكرایی ڕاڤەیان كردووە, وە هەندێك لە كتێبە فیقهییەكان كە باسیان لەو یاساغكردنو بارودۆخە كردووە كە نە سیستمی سەربازیو نە پێچەوانە بوونی مەسیحیەتی لەخەیاڵدا نەبووە, ئەوەندەش بەسە كە بگەڕێینەوە بۆ ئەو تەفسیرانەو ئەو كتێبە فیقهیانە.

**شەشەم: یاساغكردنی تایبەت بە خواردەمەنی**

لەوەی كە پەیوەندی بە یاساغكردنی هەندێك خواردەمەنییەوە هەیە (مەرجلیوس) جەخت لەوە دەكات كە موحەممەد لەجیاتی سیستمی پەسەندكراوی خواردەمەنیە یاساغكراوەكان یاساغكردنی بەرازو گۆشتی مرۆڤی لە ئەستۆ گرتووە, ئەو سیستەمەش لە شەریعەتی موسادا پلەو پایەیەكی بەرچاوو دیاری دراوەتیو "ئەنجومەنی ئۆرشەلیم–قودس"یش پەسەندی كردووەو پشتی پێبەستووە, وە موحەممەد بنەمای ئەم یاساغكراوانەی لەوانەوە وەرگرتووە كە لەو ڕێنماییانەدا هەن "سەرچاوەی پێشوو, لاپەڕە 6–875".

بەڵام ئەم وتەیە ورد نییە، ئەگەر بروانینە ئەوەی كە كتێبی "وقائع الحواريين" لاپەڕەكانی (215, 220) دەڵێت و سەیری بڕیاری ئەنجومەنی ئۆرشەلیم بكەین، لەوێدا كە (پۆلسو بەرنانا) لەلایەكو ئەو حەوارییانەی لە ئۆرشەلیمدا بوون لەلایەكی ترەوە ئامادەن, دەقی ئەم بڕیارەمان دەست دەكەوێت: " دوورە پەرێز بن لە گڵاوییەكانی بتەكانو زیناو خنكاوو خوێن" تەنانەت كاتێك لاپەڕەكانی دەقی ئەم وتارە هەڵدەدەینەوە هیچ كەسێك وشەی (خوێن)ی بەو شێوەیە وەرنەگێڕاوە بەو واتایەی كە دەیبەخشێتو ئەویش واتە مرۆڤ كوژ, (العهد الجدید 5–2) وەرگێڕانی (مسكونیە) لاپەڕە (3–4) ساڵی (1979ز), دەڵێت "كە یاساغكراو لەو دەقەدا تەنها گیانلەبەری خنكاوو خوێنی ئاژەڵەكانە" ئایا دەقە سەرەكییەكە گۆشتی بەرازی گرتووەتەوە؟, لەبەرئەوە (مەرجلیوس) ئەم وتەیەی داتاشیوە تاوەكو خزمەت بەمەسەلەی خۆیو مەسەلەی یەهود بەشێوەیەكی گشتی بكات.

تەنانەت لەگەڵ ئەم جیاوازییەشدا, هێشتا ئەوەش خزمەتی ئەوە ناكات كەببێ بەڵگە جەختی لەسەر كردووە ، چونكە قورئان یاساغكراوەكانی دیاری كردووە بەوەی خوای گەورە دەفەرموێت: (حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالْدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنْزِيرِ وَمَا أُهِلَّ

لِغَيْرِ اللّهِ بِهِ وَالْمُنْخَنِقَةُ وَالْمَوْقُوذَةُ وَالْمُتَرَدِّيَةُ وَالنَّطِيحَةُ وَمَا أَكَلَ السَّبُعُ إِلاَّ مَا ذَكَّيْتُمْ وَمَا ذُبِحَ عَلَى النُّصُبِ وَأَن تَسْتَقْسِمُواْ بِالأَزْلاَمِ ذَلِكُمْ فِسْقٌ...) (المائدة : 3 ).

لەبەرئەوە دەبينين ليستى گۆشتە ياساغكراوەكان لە قورئاندا لەهەردوو حاڵەتەكەدا كە ئەنجومەنى ئۆرشەليم ياساغيانى كردووە زياتر درێژەی پێدراوە.

هەروەها ئەوەشى كە ئاشكرايە ئەوەيە كە ليستى ئەو گۆشتانەی قورئان ياساغى كردوون جياوازە لەوەی كەلەلای مەسيحييەكان ياساغن يان باشترە لەوەی موسا ياساغى كردووە كە بريتييە لە حوشترو كەروێشكو هەموو نينۆكدارێكو ماسييەكى بێ توێكڵ لەكاتێكدا ئيسلام ئەوانەی حەڵاڵ كردووە.

وە چاوپۆشى لەو بڕيارە خۆيىو نابابەتييانە دەكەين كە (مەرجليوس) لەهەمان وتارى (موسوعه الدين والاخلاق)دا دەرى بڕيوون, چونكە ئەوە لەو چوارچێوەيە دەردەچێت كە ئێمە لەبارەيەوە دەدوێين, واز لەوەش بێنە كە ئەوانە دەمارگيرييەكى كوێرانە ئاشكرا دەكەن.

ئیجناس گولدتسیهر (1850–1920ز) له (الموسوعة الیهودیة– ئینسکلۆپیدیای یههودییهت)دا بهشی شهشهم لاپهڕهکانی (651و 659) نیویۆرکو لهندهن له ساڵی (1904ز)دا وتارێکی دهربارهی ئیسلام نووسیوه لهوێدا بهتایبهتی لهبارهی بنچینهی یههودییهتهوه بۆچهمکهکان و ڕێنماییه ئیسلامییه جیاوازهکان لێکۆڵینهوهی کردووه, دهبا بهدرێژی بۆچوونهکانی لهو بابهتهدا ببینین:

**1ـ خوای ئیسرائیلو خوای ئیسلام:**

سهرهتا جهختی لهسهر ئهوه کردووه که تێگهیشتنی تاقانهیی بۆ خودا که موحهممهد بهرههڵستی بتپهرستی عهرهبی پێکرد لهناوەرۆکدا لهگهڵ چهمکی یهکتاپهرستی لهکتێبهکهی زهکهریا –العهد القدیم–دا یهکدهگرێتهوه "سهرچاوهی پێشوو, لاپهڕه 625".

أـ ئهم بۆچوونه ههڵهیه, چونکه خوای کتێبهکهی زهکهریا به تهنها ئهو خوای ئیسرائیله, وه ئیسرائیلیش خوا ههڵی بژاردووه "سفر الخروج (19–64) وه (التثنیة) (4, 20, 32, 9, 70, 41, 8, 9, 43, 21) وه خوای ئیسلام به پێچهوانهی ئهوهوهیهو بریتییه له (رب العالمین) –پهروهردگاری جیهانیان– بهبێ جیاوازی گهلێك له گهڵ گهلێکی دیکه, وه بهشێوهیهکی تایبهتی گهلێکی ههڵنهبژاردووه.

ب ـ خوای ئیسرائیل بریتییه له (الاب– باوك) "أشعیاء, أصحاح (63, 16) وه إجماع (64, 7) لهکاتێکدا خوا له ئیسلامدا (لَمْ یَلِدْ وَلَمْ یُولَدْ) نهمنداڵی بووهو نه لهدایکیش بووه (الاخلاص –3), لهبهرئهوه (باینچ) لهسهرحهق بوو کاتێك لهکتێبهکهیدا (التوحید عند إسرائیل والشرق القدیم– یهکتاپهرستی لهلای ئیسرائیلو ڕۆژههڵاتی کۆن–دا وتویهتی "یهکتاپهرستی یههودی یهکتاپهرستییهکی نهتهوهییه, بهڵام یهکتاپهرستی ئیسلامی یهکتاپهرستییهکی جیهانییه".

**2ـ ڕۆژووی یههودیو ڕۆژووی ئیسلامیی:**

(گۆڵد تسهیر)و پاش ئهویش (ڤنسنك) له (دائرة المعارف الاسلامیة)دا وای بۆ دهچن که موحهممهد ڕۆژووی لهیهودییهتهوه وهرگرتووه, وه بێگومان ئهم وتهیهش ههڵهیه لهبهر ئهمهی لای خوارهوه:

چونکه ڕۆژووی یههودی بهستراوهتهوه به ڕووداوه دیاریکراوهکانی مێژووی یههودیهتهوه, ئهویش لهیهك ڕۆژدا کورت دهبێتهوهو شهریعهتهکهی موسا فهرمانی بهسهردا کردوون لهوکاتهدا بهڕۆژوبوون, ئهوهیش ڕۆژووی (الغفران– لێخۆشبوون)ه (سفر الأولین ئیجماعی شانزهههم ئایهتی 29), پاش ئهوهش ڕۆژووی چهند ڕۆژێکی دیکهیه به پچڕ پچڕی که (أیام الأسر)هو ئهم ڕۆژووهش تایبهته به زیندوو ڕاگرتنی ئهو نهگبهتیو نههامهتییانهی که دووچاری یههود بوونهتهوه (سفر زکریا, ئیجماعی 8, ئایهتی 9) ئهو ڕۆژوانهش ئهمانهن:

ڕۆژووی مانگی چوارهم (تهممون) وه مانگی پێنجهم (ئاب)و مانگی حهوتهم (تشرین)و مانگی دهیهم (شوبات) وه ڕۆژوو له ههڵهاتنی خۆرهوه دهست پێدهکاتو به دهرکهوتنی یهکهم ئهستێرهی شهو له ئێوارهدا کۆتایی پێدێت جگه لهڕۆژووی (یوم الغفران)و (نۆههم ڕۆژی مانگی ئاب) که ڕۆژوو لهم دوو ڕۆژهدا له ئێوارهوه تاوهکو ئێوارهی داهاتوو بهردهوام دهبێت, وه لهمیانهی ڕۆژووهکهیاندا تهنها پارێز له خواردنو خواردنهوه دهکهن, بهم شێوهیه دهبینین که ڕۆژووی یههودی بههیچ جۆرێك لهگهڵ ڕۆژووی ئیسلامیدا لهیهك ناچن لهبهر ئهمانه:

أـ ڕۆژووی ئیسلامیی مانگێکی تهواو دهخایهنێت کهمانگی ڕهمهزانه, نهك یهك ڕۆژ, یان ڕۆژێكو شهوێك وهك ئهوهی لهلای یههود پهیرهو دهکرێت.

ب ـ ڕۆژووی ئیسلامیی ولهبهستهی هیچ ڕووداوێك له ڕووداوهکان نییه که دووچاری مسوڵمانهکان هاتبێت, بهڵام کۆڵهکهیهکی بنچینهییه له پێنج پایهکهی ئیسلامو دروشمێکی ئاینی بنچینهییشه, به پێچهوانهی ئهوهوه که ڕۆژووی یههودی ڕۆژوویهکه لهسهری ڕێککهوتوون نهك ئهرکو واجب بێت, جگه لهو کاته نهبێت که یههودییهکان ڕوویهڕووی

چەوساندنەوە دەبنەوە, نەك لەكاتێكدا كە لەخۆشیو ئارامیدا دەژین "الموسوعه الیهودیه بەشی (5) لاپەڕە (347)",
ڕۆژوو وەك دروشمەو ڕێورەسمێكی ئاینیی لەزۆربەی ئەو ئایینانەدا هەبووە كەپێش یەهودیەت كەوتوون, وە چەند شێوەو
ئامانجێكی زۆری لەخۆگرتووە, وە ئەركێك یان كارێك بووە لەكارەكانی تەوبە كردن و پەشیمان بوونەوە ، یان
خاوێنكردنەوەو ئازادكرنی گەردەن –كەفارەت– هەروەها كارێك بووە لەكارەكانی پاكژبوونەوەو هۆیەك بووە بۆ
بەهێزكردنی دروشمە جادوگەرییەكان –سیحری– دواجاریش گوزارشتێك بووە لەماتەمینی, ڕۆژوو لە میسردا هۆیەك بووە
بۆ لێخۆشبوونی گوناهەكان, لە بابلیشدا دروشمێكی ڕێكخراو بووە بە ئامانجی تەوبەكردن ئەمەش (مەزمورەكانی
تەوبەكردن لەلای بابلییەكان ڕوونی دەكەنەوە) وە تەوبەكار ڕۆژووەكەی بەو شێوەیە پێناسە دەكات كە نابێت لەو ماوەیەدا
خواردن بخواتو ئاو بخواتەوە, ئەوەش لە ڕۆژانێكی دیاریكراوو سنووردارداریە بە تایبەتیش لەماوەی خەمباریو
كارەساتدا, لەوێدا پێویستە ڕۆژوویەكی تایبەت بگیرێت, بڕوانە (أبو سلمان البابلی– لیبزج–, 1885ز, لاپەڕە 34)
(ماسبرا –فجر البابلیه– بۆستن, 1898ز, لاپەڕەكانی 320–688).

جا لەبەر ئەوەی كە ڕۆژوو بە هەزاران ساڵ بەر لەدەركەوتنی یەهودیەت مومارەسەكراوە, ئیتر بە چ حەقێك (گوڵد تسیهر) بانگەشەی ئەوە دەكات كە موحەممەد ڕۆژووی لەیەهودیەتەوە وەرگرتووە؟ وەك ئەوەی كە یەهود یەكەم كەس بووبن ڕۆژوویان داهێنابێت! بەڵام بەردەوام هەمان كاڵوكرچیو هەمان ئەو فیكرە زاڵ بووەیە ئەوەی كەوای لەویشو لەوانەش كردووە كەوەك ئەو وەهان بەو شێوەیە شتەكان ببینن, هەروەها نیاز خراپیەكەی لەوەدا دەردەكەوێت كاتێك وشەی عیبری (صوم–ڕۆژوو) لەنێوان دوو كەوانەدا دادەنێت لە پاش دەستەواژە عەرەبییەكەوە (صیام–ڕۆژوو) كە لەوێدا لە وشە عیبرییەكە نزیك دەبێتەوە تاوەكو ڕوونی بكاتەوە كە دەستەواژە عەرەبییەكە بەتەواوەتی ئەوەیەو لەوشە عیبرییەكەوە گوازراوەتەوە, خۆ ئەگەر كەمێك زیرەك بولیە دەیگوت (صوم) لە جیاتی (صیام).

**3ـ قیبلە –ڕووگە :**

بەبۆچوونی (گوڵد تسیهر) موحەممەد كە لەسەرەتاوەو لە نوێژدا (بیت المقدس)ی كردە قیبلە، بۆ ئەوەبوو خۆشەویستی یەهود بەدەست بێنێت, چونكە لە شاری مەدینەدا پشتی بە پشتگیری ئەو یەهودییانە بەستبوو كەخاوەن پلەو پایەیەكی بەرزبوون, چونكە لەلای ئەوان پێغەمبەریی چاوەڕوان كراوبوو, وە كۆتاو دواهەمینی پێغەمبەرەكانی خودایە كە لە كتێبەكانیاندا هەیە (سەرچاوەی پێشوو, لاپەڕە 65), بەڵام كە پشتگیری یەهودی بەدەست نەهێنا قیبلەی گۆڕیو ڕووی كردە (بیت الحرام) لەمەككە.

ئەم بیروڕایەی كەلەلای زۆرێك لە ڕۆژهەڵاتناسەكان باوە وەك (ڤیل, لاپەڕە 90, مویر بەشی 3 لاپەڕە 45, هـ.گریم –محمد– لاپەڕە 71, لیون كیتانی, لاپەڕە 466, فربوهی– لاپەڕە 212) بنەمای دروستی نییە بۆیە لێرەدا دەكرێت ئەم تێبینیانەی لەسەر وەربگرین:

أـ بەوردی نازانین بەر لەكۆچ قیبلە لەمەككەدا كوێ بووە, لەسەر ئەم بابەتە سێ ڕا هەیە:

1ـ كەعبە قبلە بووە (الطبري, تفسیر الطبري, بەشی دووەم, البیظاوی, تەفسیری سورەتی (البقره) 193).

2ـ قیبلە هەمیشە (بیت المقدس) بووە (تفسیر الطبري, بەشی دووەم, (3, 8), تأریخ الطبري, بەشی یەكەم, لاپەڕە (1230), البلاذري, الفتوح 2 چاپی جویج).

3ـ موحەممەد بەر لەكۆچ لەنوێژەكەیدا بەجۆرێك ڕادەوەستا كە لەپێشەوەی و بەلای ڕاستدا كەعبەو (بیت المقدس) ببینێت (ابن هشام –السیره– لاپەڕە 190, 228).

وه هەریەکە لە (سبرنجر) لەکتێبی (حیاه محمد وعلمه) بەشی سێیەم لاپەڕە (46) سەرنجی 2, (ڤنسنك) لەکتێبی (محمد والیهود فی المدینه, لندن, 1903ز, لاپەڕە 108, بۆچوونی دووەم پەسەند دەکەن کە بریتییە لەوەی قیبلە بەرلەکۆچ لەمەککەدا (بیت المقدس) بووە, ئەگەر ئەوە وابێت کەواتە هەڵەیە گریمانەی ئەوە بکەین کە موحەممەد بۆیە (بیت المقدس)ی کردە قیبلە تاوەکو لە یەهود نزیك ببێتەوە, چونکە بەرلەکۆچ لە مەککەدا پێویستی بەوە نەبوو, وە تاوەکو نەچوویە ناو مەدینە پەیوەندی لەگەڵ جولەکە نەبەست.

بەڕای ئێمە ئەوەی ئەو ڕایە پوچەڵ دەکاتەوە ئەمەیە:

أ- ئەو وتەیەی کە دەڵێت (موحەممەد) قیبلەی لە (بیت المقدس)ەوە گۆڕی بۆ کەعبە لە (ڕەجەبی ساڵی دووەمی کۆچی) وەك ئەوەی لە (ئیبن هیشام)داولە چاپی (ویستنفیلد) لەلاپەڕە (381)دا هاتووە, وە (إبن سعد –الطبقات الکبری– بەرگی (10) لاپەڕە (261) (الطبري –تفسیر الطبري– بەشی دووەم لاپەڕە 3), یان لە شەعبانی هەمان ساڵدا وەك ئەوەی لە تەفسیری الطبري بەشی دووەم, لاپەڕە 30و (إبن أثیر, بەشی دووەم, لاپەڕە 98)دا هاتووە وتەیەکی دروست نییە, چونکە ئەو ئایەتە قورئانیانەی باس لەو بابەتە دەکەن باسی گەڕانەوە بۆ قیبلەی کۆن ناکەن بەڵکو تەنها دەڵێن: (سَيَقُولُ السُّفَهَاء مِنَ النَّاسِ مَا وَلاَّهُمْ عَن قِبْلَتِهِمُ الَّتِي كَانُواْ عَلَيْهَا قُل لِّلّهِ الْمَشْرِقُ وَالْمَغْرِبُ يَهْدِي مَن يَشَاءُ إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ) (البقرة : 142 ). هەروەها (....وَمَا جَعَلْنَا الْقِبْلَةَ الَّتِي كُنتَ عَلَيْهَا إِلاَّ لِنَعْلَمَ مَن يَتَّبِعُ الرَّسُولَ مِمَّن يَنقَلِبُ عَلَى عَقِبَيْهِ...) (البقرة : 143). هەروەها (قَدْ نَرَى تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي السَّمَاء فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَاهَا فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّواْ وُجُوِهَكُمْ شَطْرَهُ وَإِنَّ الَّذِينَ أُوْتُواْ الْكِتَابَ لَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ الْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ وَمَا اللّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ) (البقرة : 144).

ب - لەلایەکی ترەوە کەعبە لەمەککەدا بەر لەکۆچیش پەرستگای بتپەرستی عەرەبەکان بووە بۆیە ئامادەیە بۆ ئەوەی ببێتە قیبلەی ئیسلامێکی لەدایکبوو بۆ ئەوەی سەرکەوێت بەسەر بتپەرستیدا وە دواجاریش شیاو نییە ببێتە قیبلەی نوێژ بۆ ئەم کۆبوونەوە نوێیە, وە ئەو ئەرکە بۆ ئەم دوورکەوتنەوە گەورەیە لەشوێنی کەعبە ئەمەکداری دەوێت تاوەکو سەرکەوێت بەسەر ئەو نەریتەدا وە کەعبە وەك شوێنێکی بەرزی بتپەرستی نەبینین, بەڵکو وەك گەورەترین قەڵای پیرۆزی ئیسلام سەیربکرێت.

ج - لێرەدا ئەوەش زیاد دەکەین کە ئیسلام ئاینی ئیبراهیمە ئەویش دامەزرێنەری کەعبەیە, لەبەرئەوە زۆر سروشتییە مسوڵمانەکان لە نوێژدا ڕوویۆ کەعبە وەرگێڕن.

باوەڕمان وایە ئەم بەڵگانە بەسن بۆ پوچەڵکردنەوەی مەسەلەی ئەوانەی هەرجۆرە پەیوەندییەکیان دروست کرد لەنێوان هەڵبژاردنی (بیت المقدس) بە قیبلە بۆ یەکەمجارو ڕای موحەممەد لەسەر یەهود, یان گردبوونەوەی مەسیحییەکان لەدووڕگەی عەرەبیدا وەك بۆچوونی (فرید ریچ شفالی)ش لە (تأریخ القرآن – لاپەڕە 175, 176)دا وایە.

جالەبەرئەوە ئەو وتەیەی کە دەڵێت بەر لە کۆچ (بیت المقدس) قیبلە بووە، شتێکەو ئەوەیش کەدەڵێت موحەممەد ئەم نەریتو نروشمەی لەیەهودەوە وەرگرتووە بەتەواوەتی شتێکی ترە, ڕاستە یەهود لەنوێژەکانیاندا ڕوویان بەلای (بیت المقدس)دا وەردەگێڕا, (ارو (8, 44, 48) سفر دانیال (6, 2), وە هەموو ئیسرائیلییەك لەنوێژەکەیدا ڕووی دەکردە هەمان ڕووگە (یس– بار 17, 5) بەڵام ئەو هۆیەی لەپێناویدا پێغەمبەر موحەممەد (ﷺ) لەسەردەمی مەکیدا ڕووی دەکردە مزگەوتی (الاقصی) ئەوەبوو کە کەعبە هێشتا لەبت پاك نەکرابووەوە, یان خەریك بوو, جا لەبەرئەوەش یەکەم ئایەت لە سورەتی (الاسراء) باس لە (مسجد الاقصی) دەکات, ڕاستە کە ڕێککەوتنێك لەسەر دیاریکردنی (مسجد الاقصی) نییە, بەڵام بەشێوەیەکی گشتی تەفسیری ئیسلامیی دەستنیشانی (بیت المقدس) دەکات, وە کۆڕای زانایان لەسەر ئەوە پێکهاتووە کە ئەو ئایەتە ئایەتێکی مەککییە, وە گەشتی شەو ڕەوی (الاسراء) لەمەککەوە بۆ (بیت المقدس) بوو.

لێرەدا پرسیارێك سەر هەڵدەدات: چ قودسێك مەبەستە, قودسی ئاسمانی, یان قودسی سەرزەوی ئەوەی کە لە فەلەستینداية؟ ئەمە پرسیارێکی بێهودەیەو (بلاشیر لە وەرگێڕانەکەیدا بۆ قورئان, لاپەڕە 36) خستویەتییە ڕوو, ئەوەش لەبەرئەوەی قودسی ئاسمان وەهمێکە نووسراوەکانی ئەم دواییانەی جولەکە دایانتاشیوە کە پەیوەستە بە خەوەکەی (قەشە یوحەنا)وە بۆ ئەوەی دەربیخات کە قودسێکی هەمیشەیی هەیەو خوای گەورە لە ئاسماندا بنیاتی ناوەو دەبێتە دوایین پەناگەی باوەڕداران, ئەوەش جۆرێکە لە فیردەوس (سبیر)– خەوەکەی قەشە یوحەنا, بار (4, 2), (4) اسربا (8, 52)– وە لەوێدا درەختی ژیان هەیەو ئەو درەختەش لەسەردەمی نوێدا بەهیوای ئاشتییەوە گەشە دەکات, وە ئەو درەختە بەهەمان شێوە لە خەوەکەی قەشە یوحەنادا (21, 1) باسکراوە: "بەڕوح گواستمیەوە بۆ سەر لوتکەی چیایەکی بەرزو گەورە, وە ئاماژەی بۆ شاری پیرۆز کرد, قودسێك کە لە ئاسمانەوە لەلایەن خواوە دادەبەزێت".

(بلاشیر) لە سەرچاوەی پێشوودا جەخت لەسەر ئەم گریمانە خەیاڵیە دەکات ئەوەش ئەوەیە کە (المسجد الاقصی– قودس) واتە (قودسی ئاسمان) بەڵام دەڵێت "لە پاش ماوەیەکی دوورودرێژ لەکاتێکدا کە خەلیفەکانی بەنی ئومەییە لە دیمەشق ویستیان مەککە ڕزگاربکەن لەو ئیمتیازەی کە وەك تاکە پایتەختێکی ئاینی بۆ ئیسلام هەیەتی, ئیتر دەستەواژەی (المسجد الاقصی) واتە (قودسی ئاسمانی– القدس السماوية) لە ئارادا نەما, بەڵام شاری (یەهودا) هەمان ئەو قودسەیە".

**شەریعەتی ئیسلامیی و شەریعەتی هەلاخای یەهودی**

دواجار, لەهەمان وتاریدا لە (الموسوعه الیهودیه), بەشی چوارەم لاپەڕە (660)دا شوێن بانگەشەیەك کەوتووە کە بریتییە لە (کاریگەری شەریعەتی یەهودی بەسەر شەریعەتی ئیسلامییەوە) بەڵام جگە لەڕێگەی سەربڕینی ئاژەڵی خواردنو شۆردنی مردوو بەر لە خستنە ناو گۆڕ ئەو کاریگەرییەی دەستنیشان نەکردووە.

بەڵام شۆردنی مردو نەریتێك بووە لەسەردەمە کۆنەکانداو تەنانەت لەلای مرۆڤە سەرەتاییەکانیش پەیڕەوی کراوە, بڕوانە (موسوعه الدین والاخلاق– بەشی چوارەم, لاپەڕە 417, أدنبرگ (1911ز, "غسل الابدان– شۆردنی لاشەکان", کەواتە ئەمە شەریعەتێك نییە جولەکە دایهێنابێت.

بەڵام سەبارەت بە سەربڕینی ئاژەڵ بەمەبەستی خواردنی ئەوەش پرۆسەیەکی زۆر ئاڵۆزە لەلای جولەکەو لای مسوڵمانانیش زۆر ئاسانە, چونکە لەلای جولەکە –یەهود– پێویستە (شاهوت) واتە ئەو پیاوەی ڕادەسپێردرێت بە پرۆسەی سەربڕین, بەگوێرەی کەشوهەوا ئاینییەکە بەوکارە هەستێت, وە بەپێی پێویستییەکانی تەلمود ڕێگە نادرێت ژنان مومارەسەی ئەم پیشەیە بکەن "بڕوانە یورەدیا (1, 1) (Yoreh Deah)".

شاهوت پابەند دەبێت بەم یاسایانەوەو نابێت ڕاهاتبێت لەسەر خواردنەوە سەرخۆشکەرەکان –مشروبات روحية– "شولهان أروك" (بوردە دیارە) (1, 8) و نابێت تاوانباربێت بە پشتگوێخستنی ئەرکەکانی (سەرچاوەی پێشوو 144), نابێت کەسێکی داوێنپیس بێت, نابێت بە پێی یاسا گوناهباربێت, نابێت سنووری حەرامکراوەکانی ڕۆژانی شەممە ببەزێنێت (سەرچاوەی پێشوو 51), (الموسوعه الیهودیه– ئینسکلۆپیدیای یەهودیەت– بەشی 11, لاپەڕە 113, نیویۆرکو لەندەن ساڵی 1905ز).

لە ئیسلامدا بە پێچەوانەی ئەوەوە هیچ کام لەو پرەنسیپانە بوونی نییە, نە پیاوێکی دیاریکراو هەیە بۆ ئەو کەسەی ئاژەڵ سەردەبڕێت وەنەهیچ تایبەتمەندییەکی دیاریکراو هەیە بۆ ئەو کەسەی کە ئاژەڵ سەردەبڕێت, وە تاکە شتێك کە پێویستە لەکاتی سەربڕیندا لەبەرچاوبگیرێت ناویردنی ناوی خوایە لەسەرەتاوە, تاوەکو پەنابگیرێت لەوەی کە ئەو قوربانییە لە پێناوی بتێك یان خواوەندێکی دیکەی جگە لەخوای گەورەدا سەردەبڕێت, وە قورگو سورێنچکی ئاژەڵەکە ببڕدرێت, ئەمەش نەریتێکە تایبەت نییە بە جولەکەوە.

کەواتە سەیردەکەین کە هەردوو حاڵەتە باسکراوەکە وەك حاڵەتی کاریگەری لە شەریعەتی جولەکەوە بۆ سەر شەریعەتی ئیسلامیی حاڵەتێکی تێدا نییە کاریگەری هیچ کام لەو دوو شەریعەتە بەسەر ئەوی دیکەیانەوە بسەلمێنێت, وە لەهیچ شتێکدا سوود بە (گولّد تسیهر) ناگەیەنێت تاوەکو دەستەواژەی سەربرین لە عەرەبیدا بەتەنیشت هاوشێوەکانی لە عیبریدا دابنێت, یان بە پێچەوانەوە ئەم کارە بەسەر کەسدا ناگوزەرێت, چونکە تێگەیشتنی دەستەواژەی عەرەبی بە گشتی جیاوازە لە تێگەیشتنی دەستەواژەی عیبری, هەربەمشێوەیە (گولّدتسیهر) زۆرجار دەگەڕێتەوە سەری.

هەروەها هەمان هۆکار بەکاردێنێت لەبەدواداچوونی زۆرشتدا بەبێ ئەوەی ناوی سەرچاوەکانیان بێنێت, ئەو لە (سەرچاوەی پێشوو, لاپەرە 656أ)دا دەڵێت: "دەگێڕنەوە کە عائیشەی ژنی پێغەمبەر بیرۆکەی سزای ناوگۆڕی لە ژنێکی جولەکەوە وەرگرتووەو پاشان موحەممەد ئەو بیرۆکەیەی خستۆتە سەر ڕێنماییەکانی خۆی" لە کوێوە ئەم چیرۆکەی هێنا؟ ئەو خۆی هیچ ناڵێتو ئێمەش وەك خۆمان هیچ لەوبارەیەوە نازانین, لەبەرئەوە ئەو چیرۆکە شیاوی ئەوە نییە هیچ سەنگو کێشێکی بدرێتی, "بڕوانە ڤنسنك– المنظومة الاسلامیه– لاپەرە (117, 119).

بەهەرحاڵ پێویستە دان بەوەدا بنێین بۆی کە ئەو لە ڕۆژهەڵاتناسەکانی دیکەی وەك (الفرید فون کریمر) لەکتێبی (تأریخ حضارة المشرق تحت حکم الخلفاء) بەشی یەکەم لاپەڕەکانی (225–255)دا زیاتر میانڕەوترە, ئەمەی دوایی زۆر دوورتر بۆی ڕۆیشتووەو وای بۆ دەچێت کە دارِشتنەوەی یاسای مەدەنی – شارستانی– ئیسلامیی لەژێر کاریگەری شەریعەتی تەلمودی حاخامیدا بووە).

لەبەرئەوەی (گولّد تسیهر) تێبینی ئەوەی کردووە کەلەم بابەتەدا لەزۆر حاڵەتی ئەم بەرامبەریەدا گومانێکی یاسایی هەیە, وە دەکرێت دەربارەی ئەوە بپرسین ئەگەر یاسای ڕۆمانی کاریگەری هەبوویێت بەسەر گەشەکردنو گۆڕانی شەریعەتی ئیسلامییەوە, ئایا هەرگومان لەوەش دەکرێت یان نا؟ بەو پێیەی کە سەرچاوەیەکی ڕاستەوخۆ بووە کە زانا مسوڵمانەکان لێیەوە شتیان وەرگرتووە (سەرچاوەی پێشوو) لاپەڕە (657), بەڵام ئەمەش دەمانگەڕێنێتەوە بۆ جەنگێکی دیکەی ترسناکتر کەپێش ئەوە بە لێکۆڵینەوەیەکی ڕووکەش پشکداری تێداکردبوو, وەك ئەوەی کەخۆی دانی پێدا دەنێت, ناونیشانەکەش بریتییە لە (دراسه محمدیه, بەشی دووەم, لاپەڕە 75 سەرنجی 2) وە ناونیشانەکەشی بە زمانی مەجەڕی بریتییە لە "دەربارەی سەرەتاکانی فیقهزانی ئیسلامیی" بودابست, ساڵی (1884ز) (پەیمانگای مەجەڕی ئەکادیمیای زانستەکان) لەبەرئەوە بەڵێنی داوە سەرلەنوێ مۆڵەتی بۆ وەربگیرێتەوە, ئەوەش بەڵێنێکەکە وادیارە هێشتا جێبەجێی نەکردووە, لەبەرئەوە چەند نمونەیەکی لەسەر ئەم لەیەکچوونە خستووەتەڕوو لەنێوان بنەما فیقهیە ئیسلامییەکانو یەهودییەکاندا لەوێدا سەرچاوەی بنەڕەتی کردووەتە یاسای یەهودی ئەوەش بریتییە لە:

أ- چاکسازی کردن لە فیقهی ئیسلامییدا – تیفون ها علام لە یاسای یەهودیدا.

ب - خواستن لە فیقهی ئیسلامیدا – Praesumpito لە یاسای ڕۆمانیدا.

ج - ئەو بنەما فیقهییەی کە دەڵێت: لە فیقهی ئیسلامیدا قازی بە زانیاری خۆی حوکم نادات, بنەماکەی ئەم بنەما تەلمودیەیە: en la dyane ll amasheenaw rooth.

وە ئەمەش وانەیەکە لە ئاگاداری کە (گولّد تسیهر) دەیلێتەوە کە شیاوتر بوو تەواوی بکردایە, بەڵام بەداخەوە وەك بە درێژایی ئەم بەشە ڕوونمانکردەوە ئەو جگە لە ئاگادارکردنەوەیەکی ئاسان چی تری لێ تەواو نەکردووە.

یەکێك لە گرانترین گرفتەکانی وەرگێڕانی قورئان بریتییە لە چەمکی وشەی (الصابئون) ئەو ناوەی کە سێ جار لەم ئایەتانەی خوارەوەدا هاتووە:

1ـ (إِنَّ الَّذِينَ آمَنُواْ وَالَّذِينَ هَادُواْ وَالصَّابِؤُونَ وَالنَّصَارَى مَنْ آمَنَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وعَمِلَ صَالِحاً فَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ) (المائدة : 69 ).

2ـ (إِنَّ الَّذِينَ آمَنُواْ وَالَّذِينَ هَادُواْ وَالنَّصَارَى وَالصَّابِئِينَ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَعَمِلَ صَالِحاً فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ) (البقرة : 62 ).

3ـ (إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَالَّذِينَ هَادُوا وَالصَّابِئِينَ وَالنَّصَارَى وَالْمَجُوسَ وَالَّذِينَ أَشْرَكُوا إِنَّ اللَّهَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ) (الحج : 17 ).

ئێستاش ڕای ڕۆژهەڵاتناسە جیاوازەکان دەخەینەڕوو ئەوانەی هەوڵیانداوە ڕاڤەی واتای (الصابئين) بکەن:

یەکەم: (سبرنجر) ئەو بڕوای وایە کە واتای (الصابئين) لەبەرامبەر وشەی (الحنيفيين)دا دێت, ئەوەش هەمان ڕای (جی. پیدرسون)ە (دراسات شرقيه,برونكمبردج (1923ز) لاپەڕە 66).

بەڕای ئێمە ئەم بیروڕایە وانییە چونکە:

أـ (شهرستانی) لە(الملل والنحل)دا لاپەڕە (116) –بترز– یونسکو– (1986ز) جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە(الحنفاء – ڕاستگۆکان) پێچەواەی (الصابئين)ە وە هەریەك لەودوو ئاینە لەیەکتری جیاوازن‌و پێچەوانەی یەکترین, (الحنيفيون) ئەوانەن کە شوێن حەزرەتی ئیبراهیم کەوتبون, لەکاتێکدا (الصابئون) بریتین لە ئەستێرە پەرستەکان, ئەوەش پەرستشێك بوو ئیبراهیم سەلامی خوای لێبێت بەگژیداچووەتەوە, خوای گەورە لە ئایەتی (76)ی سورەتی (الانعام)دا دەفەرموێت: (فَلَمَّا جَنَّ عَلَيْهِ اللَّيْلُ رَأَى كَوْكَباً قَالَ هَـذَا رَبِّي فَلَمَّا أَفَلَ قَالَ لا أُحِبُّ الآفِلِينَ) (الأنعام: 76 ). هەروەها خوای گەورە لە ئایەتی (78)ی (الانعام)دا دەفەرموێت: (فَلَمَّا رَأَى الشَّمْسَ بَازِغَةً قَالَ هَـذَا رَبِّي هَـذَا أَكْبَرُ فَلَمَّا أَفَلَتْ قَالَ يَا قَوْمِ إِنِّي بَرِيءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ) (الأنعام : 78 ).

ب ـ لە قورئاندا شتێك نییە بڵێت کە(صابئە)کان کتێبێکی پیرۆزیان هەبووە, لەکاتێکدا ئیبراهیم سەلامی خوای لێبێت (صحف)ی هەبووە (صحف إبراهيم وموسى) ئایەتی (19) سورەتی (الاعلى).

خوای گەورە دەفەرموێت: ( أم لم ينبأبما فى صحف موسى وابراهيم الذى وفى).

دووەم: (هورفیتز) لە (دراسات قرآنية) لاپەڕە 121دا دووپاتی دەکاتەوە کە (صابئە)کان بریتین لە تایەفەکانی (مەعمەد)ی یان زۆرینەی ئەوان دەگرێتەوە, (هانز هينرش) ئەویش لە (عالم الشرق) ژمارە (4), لاپەڕە (290) شتوتگارت (1949ز)دا گرنگی بەو ڕایە دەدات و دەڵێت : (موحەممەد کە لە مەککەدا بوە دەربارەی مەعمەدییە بابلییەکان کەبریتین لەو صابئانەی سێ جار لەقورئاندا ناویان هاتوە بیستوویەتی, (مەعمەدی) وشەیەکە دەگەڕێتەوە بۆ شێوەی بابلی ئارامی وشەکەو واتە(غطس في الماء – ژێرئاوکەوتن ) و لەوشەی (عمد)وە هاتوە واتە (صبا) لەزمانی سریانیدا. (ر.بيل) لە (أصل الاسلام) لاپەڕە (60)دا هەمان ڕای هەیە.

سێیەم: (کارادی ڤوکس) لەوتارێکدا بەناونیشانی (القرآن ومكانته في قاموس أصول الاهوت الكاثوليكى) بەرگی (3) بەشی (2), ساڵی (1923ز)دا دەڵێت: "پاشماوەی شەریعەتی موحەممەدی لەسەرچاوە یەهودی‌و مەسیحییەکانەوە وەرگیراوە, یان لەکۆمەڵێك وەرگیراو لەمەزهەبی (التأليهي) –بەخواکردن–وە، زۆربەی ئەو ڕێنماییانەش ناوی صابئەکان هەڵدەگرن, ئەدەبی عەرەبیش دوو جۆر صابئەی ناسیوە: ئەوانەیان کەقورئان ناوی بردوون‌و ئەوانەشیان کەلە ناوچەی(حەران)دا نیشتەجێ بوون, ئەو ڕێنماییانەش کە لە مەزهەبی (التأليهى)دا هەبوون بەکار هاتوون لە پەرستنی

ئەستێرەو مەسەلەی دەستنوێژدا, وە موحەممەد صابیئەکانی لە ڕیزی خاوەن پەیامەکاندا ژماردوونی واتە لەڕیزی ئەو نەتەوانەدا کەکتێبی پیرۆزیان هەبووە, وەك دەریشدەکەوێت پەرەپێدانی مەزهەبی پێغەمبەرایەتی‌و داستانی پێغەمبەرەکان‌و ڕێوڕەسمەکانی دەستنوێژی لەوانەوەوەرگرتووە, بەڵام چەکی لەدژی پەرستنی ئەستێرەکان هەڵگرتووە, بەڵام لەپیاهەڵدانی فیردەوس‌و ئەو گرنگییەی بە فریشتەکان‌و پەرییەکانی –جنۆکە– داوە کاریگەری ڕێنماییە فارسییەکانی پێوە دیارە".

پێویستە لەسەرمان لێرەدا ئەوە ڕوون بکەینەوە کە دەقەکەی (گارادی ڤوکس) پڕیەتی لەتێکەڵو پێکەڵی وەك ئەمەی خوارەوە:

أ- تێکەڵکردن لەنێوان هۆزە (مەعمەدەنییەکان)و ئەوانەدا کە ئەستێرە پەرستن.

ب - تـێکەڵکردن لەنێوان مەعـمەدی بـوون‌و ڕێـنماییـە مەعـمەدییەکان‌و دەستنوێژی داواکراو بۆ هەموو نوێژێك لەئیسلامدا.

ج - تێکەڵکردن لەنێوان چیرۆکی پێغەمبەران لە قورئانداو چیرۆکی پێغەمبەران کە کتێبە پیرۆزەکانی (مەعمەدانییەکان) دەیانگێڕنەوە, بەتایبەتیش لەکتێبە گەورەکەیاند بەناوی (جینزا)وە.

کەواتە باگریمانەکانی (گارادی ڤوکس) بخەینەلاوەو تەنها ئاوڕ بەلای ئەوڕایانەدا بدەینەوە کەلە (باب بعالیە)دا هەن.

ئەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی (مەندائیەکان) بیستبێتی ئەوە مەسەلەیەکە ڕێی تێدەچێت, وە دەشێت ئەوەی لە سەلمانی فارسییەوە زانیبێت کەناوبراو شارەزابوە بەوڕێوڕەسمە ئاینیانەی کە لە وڵاتە نەژادییەکەی خۆیدا کە وڵاتی (فارس) بوە باوو بڵاوبون, (بڕوانە, ماسینون, سلمان, باك, پاریس, 1930ز) ئەم بابەتە لە لایەن (کمال جاد الله) ساڵی 1937ز, لە قاهیرە لەژێرناوی )شخصیت قلقە فی الاسلام) وەرگێڕاوەتەوە سەر زمانی عەرەبی.

کەواتە ناوی (صابئە)کان لە وشەی (ماس بوتا) وە هاتووە بەواتای (تخمر فی الماء – ترشان لە ئاودا) ئەوەش دروشمێکی ئاینی بنەڕەتی بووە لەلای (مەندائیەکان).

بەڵام بڵاوبوونەوەی ئەم زاراوەیە بەعەرەبی زەحمەتە, چونکە لە عەرەبیدا وشەی (صبا) لەبنەڕەتەوە واتە (تخلص من– ڕزگاربوون لە) پاشان بەخواستن واتە "لە ئاینێك ڕزگاربوو یان خۆی ڕزگارکرد بۆ ئەوەی ئاینێکی دیکە بگرێتە ئەستۆ (بچێتە ناو ئاینێکی ترەوە)".

(صابیء) ناوی بکەری چاوگی (صباء) و (صابئون) کۆی ناوەکەیە ، وە( أبواسحاق ) واتای ووشەی (صابئین) لە قورئاندا بەمشێوەیە ڕاڤەدەکات, بەواتای: ئەو کەسانەی وازیان لەئاینەکەی خۆیان هێناوەوچوونەتە ناو ئاینێکی ترەوە "بڕوانە الزبیدی – تاج العرس, مادە صبأ – بەرگی 1, لاپەڕە 307, چاپخانەی کومیت" بەڵام لە چ ناوچەیەکەوە هاتوون؟ لەلای یەهودەوە یان لەلای مەسیحییەکانەوە؟ وەکو (ك. گولب) لەوتارێکدا کە لە ئینسکلوپیدیایەکدا لەژێر ناوی (الدین منذ فجر التأریخ حتی الوقت الحاضر) بەشی (4) ماددەی (معمد) لاپەڕە 711دا دەڵێت "بنەچەی مەندائییەکان دەخوازێت لەنێوان ڕێنماییەکانی مەعمەدانییەکان کە لە یەهودو مەسیحییەکانەوە بۆیان ماوەتەوە لێکۆڵینەوە بکرێت, وە ئەوانە تیرە گەلێکن لەناوچە سنوورییەکانی نێوان سوریاو فەلەستیندا, ئەمەش لە جیاتی (مد)بەسەر ئەو زاراوە باسکراوەی (صب)دا دەسەپێت تاوەکو ئاماژە بێت بۆ "نوقم بون لە ئاودا" ئەوەش بەهۆی سەرچاوە تایبەتەکان بەمێژووی یەهودییە جیابووەکان ئەوانەی کە لە یەهودییەت جیابوونەوەو دابڕان.

وە ئەگەر پشت بەبنەڕەتە عەرەبییەکە ببەستین، ئەوا وشەی (الصابئین– صابئەکان) ماناکەی دەبێتە ئەو جیابووەوانەی کە لە ئاینی جولەکە یان مەسیحی چوونە دەرەوە تاوەکو ئاینێکی دیکە پێك بهێنن، ئێستاش پێویستە ئەوە بزانین چ ئاینێك لە جولەکە یان مەسیحییەت جیابوویەوە؟

لەلایەکی ترەوە ئایا ئەوانە (الصیباویون)ن کە قەشە (ابیڤان) ئاماژەیان بۆ دەکات گوایا ئەوانە هۆزێکی (سامیری) پێشووترن لە مەسیحییەت، وە ئەولانە بەبێ گومان لەگەڵ (مەعمەدیە یومینەکاندا) ڕێکدەکەون، چونکە نووسەرانێکی دیکەی زۆر هەن بەتایبەتیش لەزمانی یۆنانیندا کەبەر لەمەسیحو لەناوچەکانی نزیك (ئوردون)دا دەرکەوتوون.

چوارەم– (22، 5) کوتست، أبوست، جیروم، هیریس، ابیڤان _8، 19، 5) وتوێژکردنی بوستین (50)، هەروەها کە نەریتە تەلمودییەکان ئەوانە بە (المعمودون الصباحیيون) وەسف دەکات (بیراکس 2)، ئەتا باردی لە فەرهەنگی (اصول الدین الکاثولیکی– بەرگی (9) بەشی دووەم (1814ز) بینا لەسەر ئەوە، ئەوانە لە یەهودییەت جیا بوونەتەوە، وە (شەهرستانی)ش لەڕیزی نەتەوە دێرینەکان داینـاون‌و جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە (صابئە)کان لەسەردەمی ئیبراهیمەوە هەبوون.

لێرەدا دەتوانین ڕاڤە جیاوازەکانی مسوڵمانە ڕاڤەکارەکانی قورئان‌و زمانناسەکان بۆ ئەم وشەیە بیر بخەینەوە:

أ- لە (مختار الصحاح)ی (جەوهەری)دا (صابیئەکان) تیرەیەکن لەخاوەن پەیامەکان.

ب - لە (التهذیب)ی (ئەزهەری)دا (صابیئەکان) نەتەوەیەکن ئاینەکەیان لە ئاینی مەسیحی دەچێت‌و وە دەڵێن لەسەر ئاینی حەزرەتی (نوح)ن.

ج - لەتەفسیری (البیضاوي)دا دەڵێت " صابیئەکان فریشتە پەرست بوون‌و وتراویشە ئەستێرە پەرست بوون، (شەهرستانی) لە کتێبی (الملل والنحل)دا بەشێکی زۆر گەورەی تایبەت کردووە بە (صابئە)کانەوە لەلاپەڕە (203) وە تاوەکو لاپەڕە (251) –لەندەن– (1846ز)وە ئەم کتێبە بەهەموویەوە لە (458) لاپەڕە پێکهاتووە.

ناوبراو لەم بەشەی کتێبەکەیدا مەزهەبەکەیانی لەشێوەی مشتومڕێکی نێوان (صابئە)کان و (حەنیفیەکاندا) خستۆتەڕوو، کە ئەمانەی دواییان لەشوێن کەوتوانی ئیبراهیم پێغەمبەرن (سەلامی خوای لێبێت) نووسەر لەم گفتوگۆیەدا ئەوەی هەڵهێنجاوە کە (صابئە)کان ئاینەکەیان لەسەر بنەمای ڕۆمانیەت دامەزراندووە، ئەویش ئەو ڕاسپێر –وسیط–انەن لەنێوان خودای بەدیهێنەری ئاقڵو خاڵی لەهەموو سیفەتێك لە سیفەتەکانی دروستکراوەکان‌و لەنێوان مرۆڤەکاندان، ئەو ڕۆحیانەتەی کەلەهەموو پەندو باوێك پوختکراوە، لەمادەو کردارو حاڵەتدا، لەماددەدا چونکە پاکژ کراوەتەوە لەهەرشتێکی ماددی یان هەر جووڵەیەکی خۆیی، یان هەر گۆڕانێکی ئارەزوومەندانە، بەپێی ڕێنماییەکانی مامۆستا کۆنەکانیان (ئەجدامون)و (هرمس) ڕاسپێرەکانیان لەلای ئەو خودایەی کە پەروەردگاری هەموو پەروەردگارەکان‌و خوداوەندی هەموو خوداوەندەکانە، وە بۆ ئەوەی پەیوەست بن بەم ڕۆحانیەتانەوە ئەولانە پاککردنەوەی دەروونیان لەحەزە سروشتییەکان‌و پاکژکردنەوەی ڕەوشتیان لەپیسی‌و خراپە دەخەنە سەرشانی خۆیان، وە ئەگەر خاوێن بوونەوە لەسەر ئەو شێوازە ئیدی دەتوانن بڕۆن بەلای کاروباریانەوە تاوەکو پاش ئەوە لێخۆشبوونی خوا بەدەستبهێنن (شەهرستانی، لاپەڕە 203، 204)، لە میانەی ئەم خستنەڕووەی شەهرستانیدا دەبینین کە ئاینی (صابئە)کان لەژێر کاریگەری ڕێنماینییەکانی فارسەکاندا بووە، بەڵام ئەمە دەمانباتە دەرەوەی بەدواداچوونەکەی خۆمان.

بەڵام ئەگەر (صابئە)کان لەژێر کاریگەری مەزهەبی فارسەکاندا بووبن ئەوەتا قورئان جیاوازی دەخاتە نێوان ئەوان‌و مەجووسەکانەوە بەڕوونی ئەوە لە قورئاندا هەیە وەك ئەو شایەتیدانەی ئایەتی (17) لە سورەتی (الحج) کە لەسەرتای ئەم بەشەوە خستمانە ڕوو.

لەمبارەیەوە پێویستە لێرەدا بپرسین بۆچی قورئان دەربارەیان فەرموویەتی: (إِنَّ الَّذِينَ آمَنُواْ وَالَّذِينَ هَادُواْ وَالصَّابِؤُونَ وَالنَّصَارَى مَنْ آمَنَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وعَمِلَ صَالِحاً فَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ) (المائدة : 69 ), (إِنَّ الَّذِينَ آمَنُواْ وَالَّذِينَ هَادُواْ وَالنَّصَارَى وَالصَّابِئِينَ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَعَمِلَ صَالِحاً فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ) (البقرة : 62 ) بەتەواوەتی وەك ئەوەی لەبارەی جولەكەو گاورەكانەوە دەدوێت؟ لەكاتێكدا قورئان باسی ناونیشانی كتێبەكەیانی نەكردووەو ناونیشانی كتێبەكانی جولەكەو گاورەكانی بۆ دیاری كردووین (تەورات‌و ئینجیل), وە ناشبێت قورئان ناوی كتێبی (جینزا) بهێنێت چونكە ئەو كتێبە هەتا دوای سەدەكانی حەوتەم‌و هەشتەمی زاینی هێشتا كۆنەكرابوویەوە, هەروەها دەوترێت ئەو كتێبە لەلایەن صابئەكانەوە بۆ ئەوە نووسراوەتەوەو كۆكراوەتەوە تاوەكو لەبەردەم دەسەڵاتی مسوڵمانەكاندا پێی بوەستن بەوپێیەی ئەوانیش لەخاوەن پەیامەكانن‌و دەبێت بەهەمان شێوەی جولەكەو گاورەكان لە ئیسلامدا مامەڵەیان لەتەكدا بكرێت.

لەلایەكی تریشەوە (صابئە)كان دان بە پێغەمبەراندا نانێن چونكە بەلای ئەوانەوە پێغەمبەرانیش وەك ئەوان مرۆڤن‌و هەموو سیفەتە مرۆییەكانیان تێدایە, (شەهرستانی لە لاپەڕە (204)ی كتێبەكەیدا دەڵێت: (صابیئەكان دەڵێن: كە پێغەمبەران لە چۆنێتیدا وەك ئێمە وان‌و هەمان شێوەی ئێمە یان هەیەو لەتوخمیشدا بەشدارانین, ئەوانیش ئەوە دەخۆن كە دەیخۆین‌و ئەوەش دەخۆنەوە كە ئێمە دەیخۆینەوەو هەمان شێوەو شكڵی ئێمەیان هەیە, ئەوانە وەك ئێمە مرۆڤن كەواتە ئیتر لەبەرچی بەگوێیان بكەین؟ ( ولئن أطعتم بشرا مثلكم انكم اذا لخاسرون) ئایەتی (34, المؤمنون). ئەمە مەسەلەكەیانە (شەهرستانی, سەرچاوەی پێشوو).

جا ئەگەر ئەمە مەسەلەكەیان بێت لەوەی كە پەیوەستە بە پێغەمبەرایەتییەوە ئیتر چۆن موحەمەد (ﷺ) لەگەل یەهودو مەسیحییەكاندا بەیەكسانی دایاندەنێت؟ وە بەپێداچوونەوەی ئایەتی (34)ی سورەتی (المؤمنون)دا (لیث) كە (ئەزهەری) لە (التهذیب)و (فیروز ئابادی) لە (القاموس)دا ناویان هێناوە دەڵێت: بۆچی (صابیئەكان) وای دەردەخەن كە ئەوان لەسەر ئاینی حەزرەتی (نوح)ن, چونكە پاش خستنەڕووی چیرۆكی نوح قورئان باس لە نەوەیەك دەكات كە پاش گەلەكەی (نوح) هاتوون‌و پێغەمبەرێكیان بۆ نێرراوە تاوەكو بانگیان بكات بۆ خواپەرستی, بەڵام گەلەكەی ڕازی نەبوون گوێ بۆ ئامۆژگارییەكانی بگرن‌و ئیمانیان پێنەهێناوەو وتویانە: ( ماهذا الا بشر مثلكم يأكل مماتأكلون منه ويشرب مما تشربون * ولئن أطعتم بشرا مثلكم انكم اذا لخاسرون ), ئایەتەكانی (33, 34) سورەتی (المؤمنون).

بەم پێیە گرفتی دیاریكردنی (صابئە)كان ئەوانەی لەم دوو ئایەتەو ئایەتی (17)ی سورەتی (الحج)دا مەبەستن زۆر ئاڵۆز بوون, چونكە ئەوانە ئەو (صابئانە) نین كە (شەهرستانی) باسیان دەكات‌و بە پێی ڕای (لیث)یش لەلای (ئەزهەری)و (فەیروز ئاباد)یش شوێنكەوتوانی حەزرەتی (نوح)نین.

هەروەها وەك (هورفیتز)و كەسانی دیكەش بۆی دەچن (مەعمەد)یش نین, چونكە عەقیدەو دروشمەكانی (مەعمەدییەكان) ناكرێت كە موحەممەدی پێغەمبەر (ﷺ) پەسەندیان بكات وەك: پەرستنی ئەستێرەو, ڕەدكردنەوەی پێغەمبەرایەتی‌و قسەكردن لەپەرستنی گەردوون‌و دروشمەكانی (تەعمید)و (التثنية), ئەگەر ئەمە حاڵیان بێت ئایا دەكرێت پێغەمبەر (ﷺ) بەشان‌و باڵیاندا هەڵبدات‌و ستاییشیان بكات (صابئە)بن یان هەركەسێك كەلە سەر شێوازی ئەوان بڕۆ كاری چاكە نەكەن؟

وە بەگەڕانەوە بۆ (جی. باردی) "قاموس أصول الاهوت الكاثوليكي, لاپەڕە (209) ساڵی (1884ن)" لەڕێوڕەسمەكاندا كە قەشە (أبیڤان) ناوی لێناون "نصائح هيريس– ئامۆژگارییەكانی هیریس– لاپەڕە (6) بەرگی (41, 244) "الصيباويه" وشەیەكی پەنهانی نهێنی یە چونكە (أبیڤان) بەم ڕێوڕەسمانە شتێكی دەربارەی عەقیدە نەوتووە,

بەلاَم تەنها لەوە دواوە کە مێژووی هەندێك جەژنی یەهودییان گۆڕیوە, لەسەرووئەوەشەوە (کاردی) بەبێ بەڵگە تێکەڵییەك دروستدەکات لەنێوان ئەوانو (مەعمەدییەکانی حەڕاندا) ئەوانەی (ابیڤان) لەبەشی حەڤدەهەمی (نصائح هیریس)دا لەبارەیانەوە دواوەو (نەزارینەکان) کەلەبەشی هەژدەهەمدا لاپەڕە (41, 255, 259) دەربارەیان دواوە, لەگەڵ ئەم تێکەڵکردنەی لەنێوان ئەم سێ هۆزە یەهودیەدا (صیباویون)و (مەعمەدییەکان)و (نەزارین) هێشتا (أبیڤان) نەگەیشتووەتە پاکانەیەك بۆ ئەو پیاهەڵدانو ستایشەی قورئان بەسەر (صابئە)کاندا.

کەواتە ئایا دەبێت کەبێ هیوابین لەوەی چارەسەرێکمان دەست بکەوێت بۆ کێشەی (صابئە) لە قورئاندا؟ بەڵێ, ئەمەش دوایین و تەمانە.

# بەشی حەوتەم

## پێغەمبەران لە قورئاندا

لەنێوان بیروڕا خەیاڵییەکانی (فنسنك)دا کە زۆر زۆرن ئەمانەن:

"بیرۆکەی پێغەمبەرە نێرراوەکان بۆ نەتەوە جیاوازەکان دەشێت لەڕێگای کەناڵە مەسیحییەکانەوە بە موحەممەد گەیشتبێت, وەك ئەو پلانەی لەڕێگەی بڵاوبوونەوەی مەسیحییەت بەسەرتاسەری جیهاندا باسدەکرێت, وە جیاوازییەکە لەو حەقیقەتەدایە کەنە موحەممەدو نە میتۆدی ئیسلامیی شتێك دەربارەی دوانزە پێغەمبەرەکە نازانن "المنظومة الاسلامية" لاپەڕە (203) کامبرد ج(10933ن).

من سەرەتا دەپرسم: بۆچی پێغەمبەر (ﷺ) بیرۆکەی پێغەمبەرە موژدەدەرە نێردراوەکان بۆ سەر نەتەوە جیاوازەکان لە ڕێگاکانی مەسیحییەتەوە فێر بووە؟ ئەی باشە بیرۆکەی پێغەمبەرانی موژدەدەر بۆ نەتەوەکان لەلای یەهودییەکانیش نییە؟ چونکە ئەم بیرۆکەیە لەزۆر جێگەی (العهد القديم)دا دووبارە بووەتەوە:

1ـ لە سفر الملوك الاول, الاصحاح14, ئایەتی 6, 7:

"من نێردراوم بۆ لای تۆ, فاسی دەڵێت بڕۆ بە ربحام بڵێ, پەروەردگاری خوای ئیسرائیل وا دەڵێت لەپێناو خۆمدا لەنێوان گەلدا بەرزم کردوویتەوەو کردوومی بەسەرۆك بەسەر گەلەکەم ئیسرائیلەوە".

2ـ لە سفر إشعاء, الاصحاح, ئایەتی 8, 9:

"پاشان دەنگی گەورەمانم بیست دەیوت کێ بنێرمو کێ بڕوات لەپێناوماندا وتم ئەوە من بمنێرە کەواتە بڕۆو بەو گەلە بڵێ".

وشەی نێردراو –رسول– بەرامبەرەکەی لەزمانی عیبریدا بریتییە لە (شالو) وە بەوشەی (ئەپۆستۆلۆس– Apostolos) لە (العهد القديم)دا چەندین بەکارهێنانو واتای هەیە.

أـ لە ئینجیلی متی (10, 2), وە ئینجیلی مەرقۆس (6, 30) وە ئینجیلی لۆقا (6, 13) مەبەست لە (ئەپۆستۆلۆس) ئەو دوانزە پێغەمبەرە –نێردراوەن– کە بەهیچ شێوەیەك قورئان ئاماژەی بۆ نەکردوون (فنسك) دان بەوەدا دەنێت, وەلە قورئاندا وەك ڕەگەز هاتوون کە بریتییە لەحەوارییەکان _الحواريون) هاوڕێکانی حەزرەتی عیسا (سەلامی خوای لێبێت).

ب ـ بەڵام لە ئینجیلی لۆقادا (11, 49) وشەی (ئەپۆستۆلۆس) ئاماژەی پێدەکرێت بۆ پێغەمبەرانی خودا "هەروەها لەبەر ئەوە حیکمەتی خوایی وتی من پێغەمبەرانو نێردراوان دەنێرم" لۆقا.

ج ـ لە پەیامی دووەمدا بۆ دانیشتوانی (کورنتس) (8ـ23) وە پەیامێك بۆ دانیشتوانی (فیلبی) (2ـ25) مەبەست لە وشەی (ئەپۆستۆلوس) نێردراوانی کەنیسەیە, جا ئەگەر ولبوایە پێغەمبەر (ﷺ) بیویستایە شارەزای بیرۆکەی پێغەمبەرە نێردراوەکان بێت بۆسەر گەلان ئەوا ئەو کارەی لەژێر کاریگەری یەهودەکاندا دەکرد نەك مەسیحییەکان!.

نامانەوێت بڵێین کە موحەممەد (ﷺ) بیرۆکەی پێغەمبەرانی خوای لە یەکێیانەوە وەرگرتووەو لەوی تریانەوە وەری نەگرتووە, بەڵام بە پێچەوانەوە, ئێمە دەمانەوێت جەخت لەسەر ئەوە بکەینەوە کەلە هیچ کامیانەوە وەری نەگرتووە.

بەڵگەشمان ئەوەیە کە چەمکی پێغەمبەرانی خوا بەتەواوەتی جیاوازە لە (شالوە)ی عیبریو (ئەپۆستۆلۆس)ی یۆنانی لە (شالوە)ی لای یەهودییەکان جیاوازە چونکە (رسول– نێردراو) تەنها نێردراو لەلایەن خواوە بۆ ڕاگەیاندن یان گواستنەوەی ئەرکێك ناگرێتەوە, بەڵکو پێویستە ڕاسپاردەیەکی لەسەرشان بێت, کەهەموو ژیانی بۆ تەرخان بکاتو ئەوەش ئاشکراکردنی ئاینێکە بەڕاگەیاندنی کتێبێکی پیرۆز, (رەسول) زیاتر لەوەیە کە (نەبی) بێت چونکە (نەبی – النبی) بە کتێبێکی پیرۆزەوە نایەت یان کتێبێکی ئاسمانی لەگەڵ خۆیدا هەڵنەگرتووەو نەیهێناوە, لەبەرئەوەیە زانا مسوڵمانەکانی یەکتاپەرستی دەڵێن: جیاوازی نێوان (الرسول)و (النبی) لەوەدایە کە (الرسول) ئەوکەسەیە خوای گەورە بە ئاینێکی نوێو کتێبێکی پیرۆزەوە ناردوویەتی, ئەو گوزارشت لەو ئاینە دەکات, لەکاتێکدا (النبی) جگە لە مژدە بەخشینو ئاگادارکردنەوە

ئەرکێکی دیکەی نییە, لەهەمان کاتیشدا وشەی (شالوە)ی عیبری واتە نێردراو بۆ نەتەوەیەك, وە ئەوەش کە پەیوەندی بە (رسول)ەوە هەیە لە ئینجیلەکانو کەنیسە مەسیحییەکاندا بە شێوەیەکی گشتی ئەوەیە کە دوانزە نێردراوەکە لەلایەن خوا یاخود بەوتەی ئەوان (الاب)ەوە نە نێردراون بەڵکو لەلایەن حەزرەتی مەسیحەوە نێردراون, ئەوەش یەکەم جیاوازییە لەنێوان ئەوانو پێغەمبەران (نێردراوان) لە ئیسلامدا, جیاوازی دووەمیش ئەوەیە کە هەرکام لەو دوانزە حەوارییە (الحواریون) هیچ کتێبێکی تایبەتیان لەگەڵ خۆیاندا هەڵنەگرتووە, بەڵام هەرکام لەوانە بەبێ جیاوازی مژدە دەربارەی هەمان ئایینو هەمان هەواڵ دەدەن, کەواتە واتای نێردراو یان پێغەمبەران – رسل) بەتەواوەتی جیاوازە لەگەڵ واتای حەوارییەکان لە مەسیحییەتدا, ئەمەش ڕونی دەکاتەوە بۆچی قورئان دوانزە حەوارییەکەی بە –رسل – کەناوی کۆی (رسول)ە واتە پێغەمبەران ناو نەبردووە, ئەوانە جگە لەوەی کە قوتابی حەزرەتی مەسیح بوون هیچی تر نەبوون, (الحواریون) ناوە تاکەکەی (حواری)یەو (نۆلدکە) ڕای وایە وشەی (حواری) لە وشەیەکی ئەثیوبییەوە –حەبەشی– وەرگیراوە، (نولدکە لەوتارێکیدا دەربارەی زانستی زمانە سامییەکان, لاپەڕە 49).

لەفەرهەنگە عەرەبییەکانیشدا ڕاڤەی جیاواز بۆ ئەو وشەیە واتە (حواری) هەیە, ئەوەیان کە جێگەی قبوڵە ئەوەیانە کەجەخت لەسەر ئەوە دەکات (حەواری) واتە دڵسۆز یان زۆر متمانە پێکراو, وتەیەکی پێغەمبەر (ﷺ) دێنێتەوە کە تیایدا فەرمویەتی "الزبیر بن العوام إبن عمتی حواری, ومن أهل بیتی...".

واتە: زوبەیری کوڕی عەوامی حواری کوڕە پوورم لەنێوان هاوەڵەکان یان مسوڵمانەکاندا یەکێکە لەکەسە نزیکەکان لەمنەوە –لەخەڵکانی ماڵەکەمە – "تاج العروس, بەرگی دووەم, لاپەڕە 104, چاپی کوەیت".

لەبەرئەوە باوەڕداران بە پێغەمبەر (ﷺ) پێیان دەوترا (حەوارییەکان) هەروەها دەوترێت (حەواری) واتە: پشتیوان یان هاوڕێییەکی نزیك, یان ئیماندار (سەرچاوەی پێشوو), وە لەم واتایەوە وشەی (حەوارییەکان) لە قورئاندا بەکارهاتووە تاوەکو واتای باوەڕداران بەعیسای مەسیح بگەیەنێت.

ئەوەش لە ئایەتی (52)ی سورەتی (آل عمران)دا خراوەتە ڕوو خوای گەورە دەفەرموێت: (فَلَمَّا أَحَسَّ عِیسَى مِنْهُمُ الْكُفْرَ قَالَ مَنْ أَنصَارِي إِلَى اللّهِ قَالَ الْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ أَنصَارُ اللّهِ آمَنَّا بِاللّهِ وَاشْهَدْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ) (آل عمران : 52 ).

بۆ ڕوونکردنەوەی دوورترین گرنگی بیرۆکەی (الرسل– نێردراوان) لە قورئاندا چەند ئاماژەیەك بەسە کە بریتین لە:

أ- وشەی (رسول) (146)جار لە قورئاندا بەکارهاتووەو زۆربەشیان پەیوەستن بە موحەممەد پێغەمبەرەوە (ﷺ).

ب - وشەی (رسوله) واتە موحەممەد "رسول الله) (84) جار لە قورئاندا هاتووە وە (رسولنا) (4جار).

ج - چەمکی (رسول) لە ئیسلامدا گرنگی زۆرتری هەیە وەك لەلای جولەکەو گاورەکان, جالەبەر ئەوە بێهودەییە بەرامبەرکێ لەم بابەتەدا بیەستینەوە بەنێوان مەسیحییتو ئیسلامەوە, زیاتریش بێهودەییو بێ ئاکامییە وای بۆ بچین کە پێغەمبەر (ﷺ) زاراوەی (رسل)ی لەمەسیحییەتەوە خواستووە.

بینیمان كه چۆن ڕۆژهه‌لاتناسه‌كانی وه‌ك (هیر شفیلد, گۆڵد تسیهر, هورفیتز, توری) قورئانیان به‌ خوێندنه‌وه‌یه‌كی یه‌هودیانه‌ خوێنده‌وه‌و كه‌سانی دیكه‌ش وه‌ك (موبیر, بیل, ئارنز) به‌خوێندنه‌وه‌یه‌كی مه‌سیحیانه‌ خوێندیانه‌وه‌ یان به‌ یه‌هودی‌و مه‌سیحی,ئێمه‌ش ده‌مانه‌وێت له‌ ده‌رگایه‌كی گاڵته‌ ئامێزه‌وه‌ له‌م به‌شه‌دا به‌رهه‌ڵستیان بكه‌ین‌و بڵێین ئه‌ی ده‌شێت كه‌سێكی هێلینی چی بڵێت كاتێك به‌ شێوازی خۆی قورئان ده‌خوێنێته‌وه‌, ده‌شێت ئه‌ویش ئه‌مه‌ بڵێت:

قورئان زۆر شتی له‌بیروباوه‌ڕو ڕێنماییه‌ یۆنانییه‌كانه‌وه‌ وه‌رگرتووه‌ گرنگترینیان ئه‌مانه‌ن:

أ- له‌ (ئه‌ره‌ستۆ)وه‌ چه‌مكی (فه‌زیله‌ –چاكه‌)ی خواستووه‌ (كوسط بین طرفین, ناوه‌ند له‌نێوان دوو لایه‌ندا) چونكه‌ خوای گه‌وره‌ له‌ قورئاندا به‌مشێوه‌یه‌ باسی ئوممه‌تی ئیسلامیی كردووه‌ :

(وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطاً لِّتَكُونُواْ شُهَدَاء عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيداً وَمَا جَعَلْنَا الْقِبْلَةَ الَّتِي كُنتَ عَلَيْهَا إِلاَّ لِنَعْلَمَ مَن يَتَّبِعُ الرَّسُولَ مِمَّن يَنقَلِبُ عَلَى عَقِبَيْهِ وَإِن كَانَتْ لَكَبِيرَةً إِلاَّ عَلَى الَّذِينَ هَدَى اللّهُ وَمَا كَانَ اللّهُ لِيُضِيعَ إِيمَانَكُمْ إِنَّ اللّهَ بِالنَّاسِ لَرَؤُوفٌ رَّحِيمٌ) (البقرة : 143 ).

زانا مسوڵمانه‌كانی (أصول) ئه‌م سیفه‌ته‌ میانڕه‌ویه‌ی ئیسلامیان ڕونكردووه‌ته‌وه‌, وه‌ تائێستاش ئه‌وه‌ ڕوونده‌كه‌نه‌وه‌ كه‌ ئه‌وه‌ هێمایه‌كی جیاكه‌ره‌وه‌و گرنگه‌ له‌ ئیسلامدا, وه‌ ئیسلام هه‌میشه‌ له‌ یاسای مۆراڵی خۆیدا پارێزگاری له‌ناوه‌ندبوونی نێوان دوولایه‌ندا كردووه‌ ،هه‌روه‌ها له‌ تێگه‌یشتنی فیقهی‌و عه‌قیده‌یی‌و ڕوشمه‌كانیشیدا .... وه‌ هه‌روه‌ها, له‌به‌رئه‌وه‌ش خوای گه‌وره‌ ده‌رباره‌ی ئیسلام چ وه‌ك نه‌ته‌وه‌ چ وه‌ك ئاین ده‌فه‌رموێت (كنتم خیر أمة أخرجت للناس) ئایه‌تی (110, آل عمران).

ب - قورئان شكۆمه‌ندی ئه‌سكه‌نده‌ری گه‌وره‌ی له‌ شانزه‌ ئایه‌تی سوره‌تی (الكهف)دا له‌ژێرناوی خوازراوی (ذوالقرنین)دا باس كردووه‌ له‌ ئایه‌تی (83 هه‌تا 98), وه‌ به‌كه‌سێكی ئاسایی وه‌سفی كردووه‌ (انامكنا له‌ فی الارض وآ تیناه‌ من كل شیء سببا) وه‌تاوه‌كو ئه‌و شوێنه‌ی خۆری تێدا ئاوا ده‌بێت ڕۆیشتووه‌ هه‌روه‌ها پادشایه‌كی زۆر به‌هێزبووه‌و سته‌مكارانی ترساندووه‌و به‌شێوه‌یه‌كی زۆر جوان پاداشتی ئه‌وانه‌ی داوه‌ته‌وه‌ كه‌ ئیماندارو چاكه‌كار بوون (وَأَمَّا مَنْ آمَنَ وَعَمِلَ صَالِحاً فَلَهُ جَزَاء الْحُسْنَى وَسَنَقُولُ لَهُ مِنْ أَمْرِنَا يُسْراً) (الكهف : 88 ). وه‌ هه‌ر ئه‌و پردێكی بنیات ناوه‌ له‌نێوان (یه‌ئجوج‌و مه‌ئجوج) شه‌ڕخواز له‌لایه‌ن‌و ئیمانداره‌كانیش له‌لایه‌كی دیكه‌وه‌, كه‌واته‌ (ئه‌سكه‌نده‌ری گه‌وره‌) ئه‌و پادشا نمونه‌یی‌و دادپه‌روه‌ره‌ بووه‌.

ج - داستانی (سیزیف) له‌ قورئاندا باسكراوه‌, وه‌ له‌ڕاستیدا ئه‌م (سیزیف)ه‌ وه‌ك له‌به‌شی دووه‌می لاپه‌ڕه‌ (593)ی (ئۆدیسا)دا ناوی هاتووه‌, به‌م سزایه‌ی لای خواره‌وه‌ حوكمی به‌سه‌ردا داوه‌.

زۆریان لێكردووه‌ به‌به‌رده‌وامی به‌ردێك له‌بنی چیایه‌كه‌وه‌ تاوه‌كو لوتكه‌كه‌ی بیجوڵێنێت و پاڵی پێوه‌بنێت, پاشان به‌رده‌كه‌ گلۆر ده‌بێته‌وه‌ پاش ئه‌وه‌ دێت به‌زۆر لێكراوی‌و به‌شێوه‌یه‌كی بێ كۆتایی ده‌بێت ئه‌و پرۆسه‌یه‌ دووباره‌ بكاته‌وه‌.

له‌ قورئاندا ده‌بینین ئه‌م سزایه‌ به‌سه‌ر مرۆڤێكی كافردا دراوه‌ (كَلَّا إِنَّهُ كَانَ لِآيَاتِنَا عَنِيداً* سَأُرْهِقُهُ صَعُوداً) ئایه‌ته‌كانی (16, 17, المدثر).

واته‌ (نه‌خێر, نا, ئه‌و ملهجه‌ڕێی له‌گه‌ڵ ئایه‌ته‌كانی ئێمه‌دا ده‌كرد, منیش له‌داهاتوودا, سزایه‌كی سه‌خت‌و تاقه‌تپروكێنی پێ ده‌چه‌ژم كه‌ له‌وزه‌و توانایدا نه‌بێت.

د- له‌ قورئاندا ئه‌م دوو ئایه‌ته‌ ده‌خوێنینه‌وه‌: (أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقاً فَفَتَقْنَاهُمَا وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاء كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ) (الأنبياء : 30 ) (وَاللَّهُ خَلَقَ كُلَّ دَابَّةٍ من مَّاء فَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَى بَطْنِهِ وَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَى رِجْلَيْنِ وَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَى أَرْبَعٍ يَخْلُقُ اللَّهُ مَا يَشَاءُ إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) (النور : 45 )

ئەمەش هەمان بیرۆکەی (طالیس)ە (640– 562 پ.ز) کە جەخت لەسەر ئەوە دەکات ئاو بنچینەی هەموو شتێکە لەگەردووندا, کۆڵەکەیەکی بنەڕەتییە (لەبەرئەوەی سروشتەکەی لەهەموو لایەکەوە چواردەوری داوە).

شێدارییەکەی سەرچاوەی ژیانە, ئەو پیتو پێویستی چاندنو سەوزبوونە.

هـ ـ لە قورئاندا خوای گەورە دەفەرموێت (الله نور السموات والارض) ئایەتی (35, النور) (نور علی نور) (35, النور).

لە ئەفلاتونیەتی نوێداو بەتایبەتیش لەلای دامزرێنەری ئەو فەلسەفەیە (ئەفلوتین) (204– 270ز) ڕووناکی بە سەرەتاو دەستپێکی یەکەم دادەنێت, گەردوون هەمووی تیشکدانەوەی ئەو سەرەتایەیە کە بریتییە لە ڕۆشناییەك لە ڕۆشناییەکەوە دەردەچێت, وە گەردوون هەمووی ڕووناکییە بەو پێیەی لە پلەیەکەوە بۆ پلەیەکی تر لە ڕووناکییەکی وەرگیراو لەتاکو تەنها یەکەوە دەگوێزرێتەوە.

ئەو دوو ئایەتە قورئانییە لەسەرەوە باسکران تێڕامانی ڕۆشنایی فەلسەفی پێکدێنن لەلای لێکۆڵینەوەی (ئیشراقییەکان) کە (سەهرەوەردی) دایمەزراندووەو ساڵی (1191ز) کوژراوە؟

و- خوای گەورە لە ئایەتی (20)ی سورەتی (الجاثية)دا دەفەرموێت: (وَقَالُوا مَا هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَا إِلَّا الدَّهْرُ وَمَا لَهُم بِذَلِكَ مِنْ عِلْمٍ إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ) (الجاثية : 24 ).

دەشێت ڕەخنەبگرین کەلەوەدا وەرگرتنێك هەیە لە (ئەبا قورییەکانەوە) چونکە لای ئەوان گرنگ ئەو ژیانەیە کە تیایدا دەژینو مردن بەلای ئەوانەوە هیچ ناگەیەنێتو مانای نییە, لەبەر ئەوە با هەلی ئەو خۆشیانە لەدەست نەدەین کە ژیانی ئێستا پێشکەشمانی دەکاتو پێمانی دەبەخشێت چونکە نە ژیانی هەتا هەتایی هەیەو نە زیندووبوونەوەی پاش مردنیش.

بە گوێرەی وتەی ئەوان (نفس– دروون) لەحەقیقەتی خۆیدا تەن– لاشە – یە, ناکرێت جگە لەوە شتێکی دیکە بێت, ئەویش واتە –دەروون– لەچەندگەردیلەیەك پێکهاتووە, وە کاتێك مردن ئەم گەردیلانە دەرزێنێت هیچیان لێ نامێنێتەوە هەروەك (أبيقور) دەڵێت (مردن بەلامانەوە هیچ مانایەکی نییە چونکە ئێمە کاتێك کە زیندووین مردن بوونی نییە, وە کاتێك مردنیش دێت بوونمان نابێت, وە ئەو مرۆڤەی دەستی گرتووە بەترسی مردنو ژیانی ڕۆژی دواییەوە دەبێت بەتەواوی ڕێزی خۆشییەکانی ژیانی لەناوچوون بزانێت, ئەو ژیانەی هەتا هەتاییو هەمیشەیی بۆ نییە, وە لەلای (ابيقور) خواکان لەچەندین گەردیلەی جوان پێکهاتوون وە لە ژمارەیەکی لەبن نەهاتوودا دەژینو لەچەندین جۆری بێ کۆتاییدا لە جیهاندا هەنو ئەوان جگە لەخۆشیو بەختەوەری خۆیان گرنگی بەهیچی تر نادەن. (الطبيعة الالهية, 2–51).

ئەوەی کە قورئان لە (ئەبیقورییەکانەوە) شتی وەرگرتووە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەم مەزهەبە لەدوورگەی عەرەبیدا شوێنکەوتووی هەبووە, وە دەبێت ئەوان ئەو مەزهەبەیان وەرگرتبێت بەبێ ئەوەی بزانن دانەرەکەی کێیە, ئەوەش زۆرجار لەمێژووی مرۆڤایەتیدا ڕوودەدات.

بەڵام ئێمە لەم بەشەی بەهەرڵستی کردنەکەماندا دەوەستین ئەگینا ئەو هێلینییەش, دەکەوێتە ناو هەمان ئەو هەڵانەوە کە شوێنکەوتوانی هێرشفیلدو گۆڵدتسهیرو هورفیتزو ئەوانی دیکە ئەنجامیان داون.

(نولدکه – شڤالی) له (تأريخ القرآن – بەرگی یەکەم – لاپەڕە 116)دا وای بۆ دەچێت ئەو شێوازەی کەهەموو سورەتێکی قورئان جگە لە سورەتی (التوبە) دەستی پێدەکات لەزمانی بەکارهاتووی ئینجیلەوە وەرگیراوە, پاشان ئەو بۆچوونەی سنووردار دەکاتو ئەم بەکارهێنانە بەڕوونی دەگەڕێنێتەوە بۆ بەستنەوەی بەوشەگەلێکەوە کە دەلالەت لە کردار دەکەنو جارێکی تریش بەستنەوەی بەگوزارشتەکانی وەك (بسم الله)و (قل) هەروەها لە بابەتەکانی ناو ئیصحاحی (3) ئایەتی (17)دا بەکارهێنانێکی ڕەهای شێوازەکە دەخاتە ڕوو.

لە سەرنجی (3)یەمدا ناوی بنچینە عیبرییەکە دەبات کەلە (العهد القديم)دا (بسم باوا)یەو بنچینە یۆنانییەکەی لە (العهد الجديد)دا بریتییە لە (en onomeati kourion) .

بەلاّم من بەبیّ ئەنجام لە (العهد القديم)دا گەڕامو دەربارەی شێوازی _بسم باوا _ کە وەك شێوازێك بۆ نوێژو پاڕانەوە لەخواو واتای (بەسمەلە)ی قورئانی تێدا هەبێت هیچم دەست نەکەوت.

لە حەقیقەتدا (بسم باوا) لە (العهد القديم)دا لەیەك شوێندا بەکارهاتووە ئەویش لە (سفر الملوك, الاصحاح 118ی ئایەتی 24) دەلێت "ثم تدعون باسم آلهتكم وأنا أدعو باسم الرب يهوا) واتە: پاشان بەناوی خواکانتانەوە بانگەشە دەکەنو منیش بەناوی پەروەردگار یەهوا yahwaوە بانگەشەدەکەم.

ئەوە زۆر ئاشکرایە کەلەوێدا هیچ لێکچوونێك لەگەلّ (بەسمەلە, بسم الله الرحمن الرحيم)دا نییە, هەموو ئەوەی لێرەدا دەوترێت (ادع الهك, وأنا سادعوا إلهي) بانگی خواکەی خۆت بکەو منیش بانگی خواکەی خۆم دەکەم.

ئەوە شتێکە لەگێلیەتی ئەگەر لەم ئایەتە تەوراتییەدا بنچینەی (بەسمەلە)مان بەردەست بکەوێت.

ئایەتێکی تەوراتی دیکە هەیە تیایدا دەستەواژەی (بسم باوا) yahwa bishm بەکارهاتووە بەلاّم نەك بەمانای بانگکردن, بەلّکو تەنها بەواتای (بعون باوا) بە یارمەتی باوا – یاهوا – هاتووە ئەویش (ئایەتی 45ی سفر صموئيل الاول الاصحاح 17)یە "قال داود لفلسطين: تأتيني أنت بسيف ورمح وحربه, وأنا آتيك مسلحا باسم الرب" واتە: داود بە فەلەستینی وت: تۆبە شمشێرو ڕمو خەنجەرەوە چەکداریتو دێیت بۆمن, منیش دێم بۆتو بەناوی پەروەردگارەوە چەکدارم.

ئەمەش لەزۆر شوێنی ( العهد القديم )دا واتای yahwa bishm (بسم باوا ) دەگەیەنێت .

بەلاّم ئەوەی پەیوەستە بە (العهد الجديد)ەوە ئەوەیە کە گریمانەکەی (نولدکە شڤالی) زیاتر درۆیە چونکە ئەو (بەسمەلە) دەگەڕێنێتەوە بۆ ئەم ئایەتە لەنامەیەکی قەشە پۆلسدا بۆ دانیشتوانی کۆرنسا ئایەتی 17 لە ئیصحاحی سێیەم کە دەلێت "هەموو ئەوەی بەوتە یان کردەوە کردووتانە هەمووی بکەن بەناوی یەسوعی خواوە وە بەوە سوپاسگوزاری خواو باوك بن".

پێویستە بپرسین: کامەیە ئەو پەیوەندییەی نێوان ئایەتەکەی قەشە پۆلسو بەسمەلەدا؟ وەلاّمەکە ئاشکرایە! هیچ پەیوەندییەك لەوێدا نییە, چونکە ئایەتەکە بە ئاڕاستەیەکی پێچەوانەی واتای بەسمەلەدا دەڕوات.

لەگەلّ ئەوەشداسەر لێتێکچوونی هەریەك لەنولدکەو شڤالی بەوەوە ڕاناوەستێت چونکە ئەوان درێژە بەووتەکەیان دەدەنو دەلێن: "وە بەپێی ئەم شێوازە تەنها دوو شوێن لە قورئاندا دەگەڕێنەوە بۆ سەرچاوە یەهودییە نەناسراوەکان بەچاوپۆشی لەناونیشانی ئەو سورەتانەی کە (بەسمەلە)یان تێدایە".

بەلاّم ئەوان ناوی هیچ سەرچاوەیەکی یەهودی نابەن کە دەلالەتو بەلّگە بێت لەسەر ئەو بانگەشە بی بناغەو دوور لە ڕاستییەی کە دەیکەن, لەبەرئەوەشە (کارادی ڤو) لە بەشی بەسمەلەو (والس) لە (بەشی قورئاندا) و بۆچوونەکەی

(نۆلدکه – شڤالی) که هەڵەیه لەمیانەی وتارەکانی "موسوعه الاسلام– ئینسکلۆپیدیای ئیسلام) چاپی دووەمدا, باسیان نەکردووە.

زۆرو هەمە جۆرن هەوڵەکانی زانا مسوڵمانە کۆنەکانو هەروەها ڕۆژهەلاتناسە ئەوروپییە نوێکان، بۆ ڕێکخستنی سورەتەکانی قورئان بەپێی مێژووی هاتنەخوارەوەیان.

**یەکەم : ڕێکخستن لە لای مسوڵمانەکان**

ئەو زانا مسوڵمانانەی گفتوگۆیان لەسەر ئەم مەسەلەیە کردووە ڕێککەوتوون لەسەر دابەشکردنی سورەتە قورئانییەکان بۆ هەردوو سەردەمی (مەککی)و (مەدەنی), بەڵام تاڕادەیەك لیستی جیاوازیان سەبارەت بەو دوو سەردەمە داناوە, با پێکەوە ئەو لیستانە ببینین کە دانەرەکانیان بەپێی ڕێکخستنی کات هەڵیان بژاردوون.

1ـ (ابن الندیم) لە (الفهرست– پێرست)دا ئەم لیستە زەمانیە دەخاتەڕوو:

أـ سەردەمی (مەککی): سورەتەکانی

(العلق 96, ئایەتەکانی (1–5), القلم (68), المزمل (73) المدثر (74), المسد (111), التکویر (81), الاعلی (87), النصر (193), الفجر (89), الضحی (93), اللیل (92), العادیات (100), الکوثر, التکاثر, الماعون, الفیل, الاخلاص, الفلق, الناس (هەندێك وایدەبینن ئەم سورەتە مەدەنییە), النجم ، عبس, القدر, الشمس, البروج, التین, قریش, القارعە, القیامە, الهمزە, المرسلات, ق, البلد, الرحمن, الجن, یس, الاعراف, (دەوترێت ئەم سورەتە مەدەنیە), الفرقان, فاطر, مریم, طە, الواقعة, الشعراء, النحل, القصص, الاسراء, هود یوسف, یونس, الحجر, الصافات, لقمان (کۆتایی ئەم سورەتە مەدەنیە), الانبیاء, الزمر, الجاثیة, الاحقاف, الذاریات, الغاشیە, الکهف, (کۆتاییەکەی مەدەنییە), الانعام ((چەند ئایەتێکی مەدەنی تێدایە) نوح, إبراهیم, السجدە, الطور, الملك, البلد, المعارج, النبأ, النازعات, الانفطار, الانشقاق, الروم, العنکبوت, المطففین, القمر, الطارق.

ب ـ سەردەمی مەدەنی: سورەتەکانی:

البقرە, الانفال, الاعراف, آل عمران, الممتحنة, النساء, الزلزلة, الحدید, محمد, الرعد, الطلاق, الحشر, النور, الحج, المنافقون, المجادلة, الحجرات, التحریم, الجمعە, التغابن, الصف, الفتح المائدە, التوبە (جگە لە ئایەتەکانی (128, 129, 110) کە مەدەنین.

ئەم لیستە دەگەڕێتەوە بۆ (الزهری) لە (موحەممەدی کوڕی نوعمانی کوڕی بەشیر)ەوە.

2ـ عومەری کوڕی موحەممەدی کوڕی عبدالکافي (الخطوط, لیدن, ژمارە 674, فرنر).

أـ سەردەمی مەککی:

العلق, القلم, المزمل, المدثر, المسد, التکویر, الاعلی, اللیل, الفجر, الضحی, الشرح, العصر, العادیات, الکوثر, التکاثر, الماعون, الکافرون, الفیل, الفلق, الناس, الاخلاص, النجم, عبس, القدر, الشمس, البروج, التین, قریش, القارعة, القیامة, الهمزة, المرسلات, ق, البلد, الطارق, القمر, ص, الاعراف, الجن, یس, الفرقان, فاطر, مریم, طە, الواقعة, الشعراء, النمل, القصص, الاسراء, یونس, هود, یوسف, الحجر, الانعام, الصافات, لقمان, الومر, غافر, فسلت, الشوری, الزخرف, الدخان, الجاثیة, الاحقاف, الذاریات, الغاشیة, الکهف, النحل, نوح, إبراهیم, الانبیاء, المؤمنون, السجدة, الطور, الملك, الحاقة, المعارج, النباء, النازعات, الانشقاق, الانفطار, الروم, العنکبوت, المطففین.

ب ـ سەردەمی مەدەنی:

البقرة, الانفال, آل عمران, الاحزاب, الممتحنة, النساء, الزلزلة, الحدید, محمد, الرعد, الرحمن, الانسان, الطلاق, البینة, الحشر, النصر, النور, الحج, المنافقون, المجادلة, الحجرات, التحریم, الجمعة, التغابن, الصف, الفتح, المائدة, التوبة (براءة).

لەنێوان ئەم دوو لیستەدا هەندێك جیاوازی هەیە بەتایبەتی لە سەردەمە مەكییەكەدا بەڵام سەردەمە مەدەنییەكە هەمان ڕێكخستنە, بەڵام ئەم دوو لیستە بۆیان باس نەكردووین لەسەر چ بنەمایەك پشتیان بەم ڕێكخستنە مێژووییە بەستووە.

3ـ لیستەكانی دیكە كە لە (الاتقان)ی (السیوطی)و كتێبی (المباني)دا هەنو ئەوانیش جیاوازیان نییە لەگەڵ ئەو دوو لیستەی لە پێشەوە باسكران تەنها لەهەندێ گۆڕانكاریدا نەبێت وەك ئەمەی خوارەوە:

أـ لیستی ژمارە (39) لە (المباني)دا لەسەر سورەتی (الضحی) ئایا (مەككی)یە یان (مەدەنی) یە جیاوازی هەیە.

ب ـ لەم لیستەی كە لە (الاتقان)دا هەیەو (عەكرەمە) پاڵپشتیەتی سورەتی (الدخان) لەدوای سورەتی (غافر)ەوە دادەنێتو, سورەتی (آل عمران)یش لەدوای سورەتی (البقره )ەوە سورەتی (المطففین)یش بەیەكەم سورەتی مەدەنی لەقەڵەم دەدات.

ج ـ لیستی ژمارە (4) لە (المباني)دا كە بە (سەعیدی كوڕی موسەیب)و لە (ئیمامی عەلی)یەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) پشت دەبەستێت, سورەتی (الضحی) لەپێش سورەتی (المزمل)ەوە دادەنێت, سورەتی (الرحمن) لە پاش سورەتی (الشرح)ەوەو سورەتی (العادیات) لەدوای سورەتی (الفیل)و سورەتی (الحج) لەپێش سورەتی (النور)ەوە دانێتو سورەتی (الرعد)یش بەیەكەم سورەتی (مەدەنی) لەقەڵەم دەداتو سورەتەكانی (الواقعه)و (العادیات)و (الفلق)و (الناس)یش بەدواهەمین سورەتەكانی سەردەمی (مەككی) دەژمێردرێت.

كتێبی چاپە حكومییەكەی میسر بۆ قورئان كە لە ساڵی (1924ز)دا دەرچووە شوێن ئەم ڕێكخستنەی خوارەوە كەوتووە.

أـ سورەتە مەكیەكان:

العلق, القلم, (جگە لە ئایەتەكانی 17, 33, 48, 50 كە مەدەنین) المزمل (جگە لە ئایەتەكانی 10, 11, 20, مەدەنین) المدثر, الفاتحه, المسد, التكویر, الاعلی, اللیل, الفجر, الضحی, الشرح, العصر, العادیات, الكوثر, التكاثر, الماعون, الكافرون, الفیل, الفلق, الناس, الاخلاص, النجم, عبس, القدر, الشمس, البروج, قریش, القارعه, القیامه, الهمزه, المرسلات "جگە لە ئایەتی (48) كە مەدنیە", ق, (جگە ئایەتی (38) كە مەدەنیە), البلد, الانسان, القمر, (جگە لە دوو ئایەتی (54, 56), الاعراف, (جگە لە دوو ئایەتی 163, 170) كە مەدەنین, الجن, یس, 45 مەدەنیە) الفرقان (جگە دوو ئایەتی (68, 70) مەدەنین), فاطر, مریم (جگە لە دوو ئایەتی (58, 71) كە مەدەنین) الشعراء (جگە لە ئایەتەكانی (197, 224, 227) كەمەدەنین, النمل, القصص (جگە لە دوو ئایەتی (52, 55) كەمەدەنین), یونس (جگە لە ئایەتەكانی (40, 94, 95, 98) كەمەدەنین), هود (جگە ئایەتەكانی (12, 17, 114) مەدەنین) یوسف (جگە لە ئایەتەكانی (1, 2, 3) كە مەدەنین), الحجر, الانعام (جگە لە ئایەتەكانی (20, 23, 91, 114, 141, 151, 152, 153) كە مەدەنین), الصافات, لقمان (جگە لە ئایەتەكانی (27, 28, 29) كەمەدەنین), سبأ (جگە لە ئایەتی (6) كەمەدەنیە), الزمر, جگە ئایەتەكانی (52, 53, 54) كە مەدەنین) غافر (جگە لە دوو ئایەتی (56, 57) كە مەدەنین), فصلت, الشوری (جگە لە ئایەتەكانی (23, 24, 27) كەمەدەنین), الزخرف (جگە لە ئایەتی (54) مەدەنیە), الدخان, الجاثیة (جگە لە ئایەتی (14) كەمەدەنیە), الاحقاف (جگە ل ئایەتەكانی (28, 83, 101) كەمەدەنین), النحل (جگە لە دوو ئایەتی (28, 29) كەمەدەنین" الانبیاء, المؤمنون, السجدة (جگە لە دوو ئایەتی (16, 20) كەمەدەنین), الطور, الملك, المعارج, النبأ, النازعات, الانفطار, الانشقاق, الروم (كە لە ئایەتی (17) كەمەدەنیە), العنكبوت (جگە لە ئایەتەكانی (1 تا 11) كەمەدەنین), المطففین.

ب ـ سورەتە مەدەنییەكان– سەردەمی مەدەنی:

البقره (جگه له ئایه‌تی (281) كه له حه‌جی ماڵئاواییدا هاته خواره‌وه)، الانفال، (جگه له دوو ئایه‌تی (20، 26) مه‌ككین)، آل عمران، الاحزاب، الممتحنه، النساء، الزلزلة، الحدید، محمد (جگه له ئایه‌تی (13) كه له‌ڕێگه‌و له‌كاتی كۆچدا هاته‌خواره‌وه، الرعد، الرحمن، الانسان، فاطر، البینة، الحشر، النور، الحج، المنافقون، المجادله، الحجرات، التحریم، التغابن، الصف، الجمعه، الفتح، المائده، التوبه (جگه له دوو ئایه‌تی (128، 129) كه مه‌ككین، النصر.

وه‌ك بینیمان ئه‌م لیسته‌و ئه‌م ڕێكخستنه به‌ته‌واوی ڕێكه له‌گه‌ڵ لیسته‌كه‌ی (عومه‌ری كوڕی موحه‌ممه‌دی كوڕی عه‌بدولكافی) ئه‌و لیسته‌ی كه له پێشه‌وه باسكرا.

له‌كۆتایی ئه‌م چاپه میسرییه‌دا ئه‌و نووسه‌رانه ده‌بینین له‌سه‌روشیانه‌وه (خلف الحسینی) گه‌وره قورئان خوێنی میسر، كه به ئاشكرایی دان به‌وه‌دا ده‌نێتو ده‌ڵێت (ده‌ستگرتن به ئاشكراكردنی مه‌ككی یان مه‌ده‌نی له‌و كتێبه ناوبراوانه‌و كتێبه‌كه‌ی عومه‌ری كوڕی موحه‌ممه‌دی كوڕی عه‌بدولكافی، وه كتێبه‌كانی خوێندنه‌وه‌و ته‌فسیر له هه‌ندێكیاندا جیاوازی هه‌یه)، كه‌واته ئه‌وان واته دانه‌ره میسرییه‌كان له‌م بواره‌دا هیچ ماندووبوونێكی خودییان نه‌نواندووه، ته‌نانه‌ت ئاماژه‌كه‌ش بۆ ئایه‌ته‌كان له‌دوای ئه‌وه‌وه له سوره‌ته‌كاندا له (الاتقان في علوم القرآن)ی( سیوطي)ه وه وه‌رگیراوه (مه‌به‌ست له ئاماژه‌كه ئه‌و هێمایه‌یه كه له‌سه‌ره‌تای هه‌موو سوره‌تێكدا پاش ناوهێنانی ژماره‌كه‌ی دیاریكراوه) هه‌روه‌ها پشتیشیان به هه‌ندێك ته‌فسیری قورئانی دیكه به‌ستووه له‌كاره‌كه‌یانداو زانیاریه‌كانیان لێوه‌رگرتووه، به‌كورتی كاری ئه‌م لیژنه‌یه به‌گشتی گه‌ڕانه‌وه‌یه بۆ بناغه‌وگواستنه‌وه‌یه‌كی بێ كه‌موزیاده یان (پوخته).

بۆچی مسوڵمانه‌كان هه‌وڵیاندا سوره‌ته‌كانی قورئان به‌پێی دابه‌زینیان ڕێكبخه‌ن له‌وكاته‌وه‌ی كه پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) كۆچی دوایی كرد؟ ئه‌وه‌ش له‌به‌ر هۆیه‌كی زۆر گرنگ كه بریتییه له زانینی ناسخ له‌منسوخ (هه‌ڵوه‌شێن له هه‌ڵوه‌شێنراو) (ناسخ – هه‌ڵوه‌شێن ) واته ئه‌و ئایه‌ته‌یه كه حوكمی ئایه‌تێكی تر هه‌ڵده‌وشێنێته‌وه‌و جێگه‌ی ئایه‌ته ( هه‌ڵوه‌شێنراوه‌كه –مه‌نسوخ– )ده‌گرێته‌وه.

چونكه شه‌ریعه‌تی ئیسلامیی كه‌دابه‌زییه سه‌ر پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) به‌چه‌ند قۆناغێكدا تێپه‌ڕی كردووه، وه ئه‌م گۆڕانه زۆرجار پێویستی كردووه بنه‌مایه‌ك هه‌ڵوه‌شێنرێته‌وه‌و بگۆڕدرێت به‌بنه‌مایه‌كی دیكه‌ی جیاواز له‌وو به‌پێی پله‌ی جیاواز، بۆیه ناسینی (ناسخ‌و مه‌نسوخ) بوو به زانستێكی خاوه‌ن گرنگی له‌ڕاده‌به‌ده‌ر له شه‌ریعه‌تی ئیسلامیدا چونكه له‌سه‌ر ئه‌و ناسینه بڕیاره كرده‌ییه زۆر گرنگه‌كان له‌ڕێڕه‌وی ژیانی كرده‌یی مسوڵماناندا ڕاده‌وه‌ستێ‌و پشتی پێده‌به‌ستن، وه لیستی ئه‌و كتێبانه‌ی كه‌له‌سه‌ر ئه‌م بابه‌ته نووسراون هه‌ر له‌سه‌ده‌ی سێیه‌می كۆچییه‌وه ئه‌گه‌ر پێشتریش نه‌بووبێت زۆر دووردرێژه، وه هه‌ڵوه‌شاندنه‌وه –نه‌سخ– له قورئاندا دانی پێدانراوه، له‌م ئایه‌تانه‌دا:

1ـ (مَا نَنسَخْ مِنْ آيَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَا أَوْ مِثْلِهَا أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللّهَ عَلَىَ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) (البقرة : 106 ).

2ـ (وَإِذَا بَدَّلْنَا آيَةً مَّكَانَ آيَةٍ وَاللّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ قَالُواْ إِنَّمَا أَنتَ مُفْتَرٍ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ) (النحل : 101 ).

3ـ (وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ وَلَا نَبِيٍّ إِلَّا إِذَا تَمَنَّى أَلْقَى الشَّيْطَانُ فِي أُمْنِيَّتِهِ فَيَنسَخُ اللَّهُ مَا يُلْقِي الشَّيْطَانُ ثُمَّ يُحْكِمُ اللَّهُ آيَاتِهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ) (الحج : 52 ).

كه‌واته نه‌سخ به‌م مانایانه دێت:

أـ هه‌ڵوه‌شاندنه‌وه یان سڕینه‌وه وه‌ك له ئایه‌تی (52) ی (الحج)دا هاتووه.

ب ـ واته گۆڕین یان له‌جێگه‌دانان وه‌ك له ئایه‌تی (101) ی (النحل)دا هاتووه.

ئه‌وه‌ی په‌یوه‌ندی به (نه‌سخ – هه‌ڵوه‌شاندنه‌وه) وه هه‌یه سوره‌ته‌كانی قورئان له‌و باره‌یه‌وه ده‌بن به‌چوار به‌شه‌وه:

1ـ به‌شێكیان هیچ (نه‌سخ یان سڕینه‌وه‌یه‌كیان) تێدا نییه‌و ئه‌م به‌شه‌ش (43) سوره‌ت ده‌گرێته‌وه كه ئه‌مانه‌ن:

(الفاتحه, يوسف, يس, الحجرات, الرحمن, الحديد, الصف, الجمعه, التحريم, الملك, الحاقه, نوح, الجن, المرسلات, النبأ, النازعات, الانشقاق, البروج, الطارق, الاعلى, الفجر, وه تاوەكو كۆتايى قورئان جگه له سورەتى (التين, العصر, الكافرون).

2- بەشێكيان (ناسخ ومنسوخ) هەڵوەشێن –سڕەرەوە– وه هەڵوەشێنراوە –سڕاوە– يان تێدايەو (259 سورەت دەگرێتەوە كەئەمانەن (البقرة, آل عمران, النساء, المائدة, الحج, النور, الفرقان, الشعراء, الاحزاب, سبأ, غافر, الشورى, الذاريات, الطور, الواقعة, المجادلة المزمل, المدثر, التكوير, التكاثر).

3- بەشێكيان تەنها (ناسخ– هەڵوەشێن)يان تێدايە بەبێ (مەنسوخ– هەڵوەشێنراوە) وه ئەم بەشەش تەنها (6) سورەت لەخۆدەگرێت كه ئەمانانەن: (الفتح, الحشر, المنافقون, التغابن, الطلاق, الانفطار)

4- بەشى چوارەميش تەنها (مەنسوخ– هەڵوەشێنراوە – سڕاوە)يان تێدايەو ئەو (40) سورەتە دەگرێتەوە كه دەمێنێتەوە بۆ زانيارى زياتر بڕوانە (الاتقان, بەرگى 3, لاپەڕە (62, 77) قاهيرە, ساڵى (1967ز) چاپخانەى أبو الفضل ابراهيم).

جێى تێڕامانە كه لەيەك سورەتدا ئايەتێكى هەڵوەشێنراوەو ئايەتێكى هەڵوەشێن بەدى دەكەين بۆ نمونە لە سورەتى (الاحزاب)دا ئايەتى (50) بەهۆى ئايەتى (52)وە حوكمەكەى هەڵوەشێنراوەتەوە. (سيوطي) جەخت دەكاتەوە كه جياوازييەكى گەورە هەيە لەنێوان زانایاندا لەوەدا كه تايبەتە بە ژمارەى ئايەتە هەڵوەشێنو هەڵوەشێنەرەوەكانەوە, بۆيە قەسيدەيەكى فێركارى داناوە بۆ ئەوەى ڕاى خۆى لەسەر ئەو بابەتە بخاتە ڕوو. بڕوانە (الاتقان) بەرگى (3) لاپەڕە (68) هەمان چاپى پێشوو.

جا با ئەم دەرگايە كه پەيوەستە بە (سڕينەوە– هەڵوەشاندنەوەوە) دابخەين, بۆ ئەوەش باسمان كرد تاوەكو دووپاتى بكەينەوە كه ئەو بابەتە كارێكى سەرقاڵ كەرى زانا مسوڵمانەكان بووە لەو كاتەوەى كه پێغەمبەر (ﷺ) كۆچى دوايى كردووە, وه هەوڵيشياندواە سورەتەكانى قورئان بەپێى هاتنە خوارەوەيان ڕێك بخەن.

**دووەم : ڕێكخستن لاى ڕۆژهەلاتناسەكان**

لەكاتێكدا لامان ئاشكرايە كه كۆنترين دوو ليستى ڕێكخستنى قورئان بەپێى هاتنە خوارەوەيان پێكەوە هاوكات نين بەو شێوەيەى پاساويان بۆ بهێنرێتەوە دەبينين ڕۆژهەلاتناسە ئەورووپيە هاوچەرخەكان هەوڵيانداوە لەم بابەتەدا لەسەر چەند هۆكارێكى دەرەكىو ناوەكى ئەركەكانيان خستووەتەگەڕ.

1- نۆلدكە:

چالاكانەترين هەوڵ كه بۆ ڕێكخستنى سورەتەكانى قورئان دراوە بەپێى سەردەمو كات ئەوەيە كه نۆلدكە( له كارە گرنگەكەيدا "تأريخ القرآن) دا پێى هەستاوە, ئەوەش كارێكە لەسەر ڕەخنەى ناوخۆيى وەستاوەو يەكەمجاريش ئاراستەكراوە بۆ:

أ- فەرمودە

ب - كتێبە مێژووييەكان (سيره ابن هشام, تأريخ الطبري, اليعقوبي..).

ج - ئەو كتێبانەى پەيوەنديان بەهۆكارەكانى دابەزينى قورئانەوە هەيە, وەڕەخنەى ناوخۆيى ئەمانەى خوارەوە لەبەرچاو دەگرێت:

1- شێوازى زمانو تايبەتمەندێتييەكانى زمانو ڕێگاكانى گوزارشتكردن بەپێى (دەربڕينى).

2- ئەو مەزهەبانەى لەسەر گەشەكردنى پەيامى پێغەمبەر وەستاون.

3ـ هەڵوێستی پێغەمبەر (ﷺ) لە یەهودییەتو مەسیحییەتو بتپەرستی عەرەبی وە ئاکامی ئەم لێکۆڵینەوانە لەمەی خوارەوەدا کورت دەبێتەوە.

أـ سەرەتا پێویستە وەك ئەوەی زانا مسوڵمانەکان کردوویانە جیاوازی بکەین لەنێوان دوو سەردەمی گەورەدا, سەردەمی مەککیو سەردەمی مەدەنی.

ب ـ پاشان لەسەردەمی مەکیدا (نۆڵدکە) خۆی سێ ماوە جیا دەکاتەوە:

1ـ ماوەی یەکەم سورەتە زۆر کورتەکان دەگرێتەوە, یان کورتنو ئایەتەکانی وێنەو ڕیتمێکی بەهێزو پەیڕەوی کردنی سەرروای ڕێکیان پێوە دیارە, وە ئەم سورەتانەی خوارەوە سەربەو ماوەیەن.

(العلق, المدثر, المسد, قريش, الكوثر, الهمزة, الماعون, التكاثر, الفيل, الليل, البلد, الشرح, الضحى, القدر, الطارق, الشمس, الانفطار, التكوير, النجم, الانشقاق, العاديات, النازعات, المرسلات, النبأ, الغاشية, الفجر, القيامة, المطففين, الحاقة, الذاريات, الور, الواقعة, المعارج, الرحمن, الاخلاص, الكافرون, الفلق, الناس).

2ـ ماوەی دووەم چیرۆکو بەسەرهاتی پێغەمبەرە پێشینەکانی تیادا زۆرەو عەقیدە تیایدا دەست بەدەرکەوتن دەکات لەگەڵ ئاماژەکان لە سروشتو مێژووی پیرۆز, وە سورەتەکان لەم ماوەیەدا درێژ دەبنو زۆرێك لە ئایەتەکان بەوشەی (قل, بڵی) دەکرێنەوەو وشەی (الرحمن) وەك ناوێکی خوا دەست بەدەرکەوتن دەکات, وە ئەو سورەتانەی سەر بە ماوەی دووەمنو مەککین ئەمانەن: (القمر, الصافات, نوح, الانسان, الدخان, ق, طه, الشعراء, الحجر, مريم, ص, يس, الزخرف, الجن الملك, المؤمنون, الانبياء, الفرقان, النمل, القصص).

3ـ لەماوەی سێیەمی مەکیدا ئیتر ناوی (الرحمن) لە سورەتەکاندا بەدیار نەدەکەوتو چیرۆکی پێغەمبەرە پێشینەکانو هەتاوەکو ئاستی میللەتەکان دووبارە دەبوویەوە, ئەم سورەتانەی خوارەوەش سەربەو ماوەیەن:

(السجده, فصلت, الجاثية, النحل, الروم, هود, إبراهيم, غافر, القصص, الزمر, العنكبوت, لقمان, الشورى, يونس, سبأ, فاطر, الاعراف, الاحقاف, الانعام).

ماوەی گەورەی دووەم سەردەمی مەدەنییە, لەوێدا پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر باشترین شێوە پێشەوایەتی ئوممەتەکەی دەکرد, لەبەر ئەوە سورەتەکان پڕ بوون لە شەریعەتو یاسا کە بەناوی خوداوە دەرچووبوون, وە داڕشتنەوەی ئەم یاسایانە بەدوورگیراوە لەهەموو جوانکاریەکی ڕەوانبێژی, وە سەروا ڕێککردن کەمتر ڕەچاو دەکرا, وە ئاراستەکردنی وتار بە (يا أيها الناس– ئەی خەڵکینە) توانایەکی زۆرتری وەرگرتو گۆڕا بە (يا ايها الذين آمنوا : ئەی ئەوکەسانەی باوەڕتان هێناوە).

ئەو ماوەیە لەمیانەی نیشتەجێبوونی پێغەمبەردا (ﷺ) لەمەدینە بوویە مێژوویەکی ڕاستەقینەی ئوممەتی ئیسلامی, ئایەتە دابەزێنراوەکان لەم ماوە (مەدەنی)یەدا زۆر نین, لەبەرئەوە ڕێکخستنی ئایەتەکان بەپێی دابەزینیان زیاتر ئاسان بوو. ئەم سورەتانەش سەر بەم قۆناغەن:

(البقرة, البينة, التغابن, الجمعة, الانفال, الحجر, آل عمران, الصف, الحديد, النساء, الرحمن, الطلاق, الحشر, الاحزاب, المنافقون, الانسان, الممتحنة, النصر, الحجرات, التوبة, المائدة).

ئەوەی لەم ڕێکخستنە مێژووییەوە وەردەگیرێت ئەم تێبینیانەی خوارەوەیە:

1ـ دابەشکردنی سیانی قۆناغی (مەککی) کە (نۆڵدکە) دەیخاتە ڕوو (گۆستاف فایل)ی ڕۆژهەڵاتناس لە کتێبی (الفتوحات الحربيه التأريخيه فى القرآن)دا چاپی یەکەم (1884ن)و چاپی دووەمی (1887ن) بلفید, پێشی کەوتووە.

ئەمەش ئەو ڕێکخستنە مێژووییەیە کە (فایل) پێشکەشی دەکات:

أ- قۆناغی (مەکی) یەکەم:

(العلق, المدثر, المزمل, قريش, المسد, الاحزاب, التكوير, القلم, الاعلى, الليل, الفجر, الضحى, الشرح, العصر, العاديات, الكوثر, التكاثر, الماعون, الكافرون, الفيل, الفلق, الناس, الاخلاص, عبس, القدر, الشمس, البروج, البلد, التين, القارعة, القيامة, الهمزة, المرسلات, الطارق, المعارج, النبا, النازعات, الانفطار, الانشقاق, الواقعة, الغاشية, الطور, الحاقة, المطففين, الزلزلة).

ب - قۆناغی (مەکی) دووەم:

(الفاتحة, الذاريات, يس, ق, القمر, الدخان, مريم, طه, الانبياء, المؤمنون, الفرقان, الملك, الصافات, ص, الزخرف, نوح, الرحمن, الحجر, الانسان).

ج - قۆناغی (مەکی) سێیەم:

(الاعراف, الجن, فاطر, النحل, القصص, الاسراء, يونس, هود, يوسف, الانعام, لقمان, سبأ, الزمر, غافر, السجدة, الشورة, الجاثية, الكهف, النحل, إبراهيم, فصلت, الروم, العنكبوت, الرعد, التغابن).

1- ژمارەی سورەتەکان لەهەر قۆناغێکدا:

أ- گۆستاف فایل (45) نۆڵدکە (48).

ب - فایل (20) نولدکە (21).

ج - فایل (26) نوڵدکە (21).

کۆی گشتی: فایل (91) نولدکە (90).

2- ڕێکخستنی مێژوویی لەهەرقۆناغێکدا جیاوازە لەنێوان (ریچاردبیل)و (نۆڵدکە)دا, سەبارەت بە قۆناغەکانی (مەدەنی) ڕێکخستنەکە لەلای (بیل) ئەمەیە:

(البقرة, البينة, الجمعة, الطلاق, الحج, النساء, الانفال, محمد, الحديد, آل عمران, الحشر, النور, المنافقون, الاحزاب, الفتح, النصر, الصف, الممتحنة, المجادلة, الحجرات, التحريم, التوبة, المائدة). کۆی گشتی (23)سورەتن لەکاتێکدا کۆی گشتی لەلای (نوڵدکە) (24) سورەتە, چونکە ئەو سورەتی (التغابن)ی بۆ زیاد دەکات.

لەکاتێکدا (بیل) ئەو سورەتە لەکۆتایی قۆناغی (مەککی) سێیەمدا دایدەنێت, بەڵام سورەتەکە لە دوولیستە ئیسلامییەکەی (ابن الندیم)و (ابن عبدالكافي)دا لەڕیزی سورەتە مەدەنییەکاندایە, وە تەنانەت ڕێکخستنی مێژوویی لەنێوان (بیل)و (نوڵدکە)دا جیاوازە.

3- هەروەها (ریچارد بیل) لەلاپەرە (103)ی (مقدمة في القرآن, ساڵی 1953ز)دا تێبینی دەکات "کە ئەو کارە گومانی تێدایە, چونکە ئەگەر بەکارهێنانی (الرحمن) وەك ناوێکی زانراو وەك نوڵدکە دەڵێت تایبەت بوویێت بەناوەڕاستی قۆناغی (مەکی)یەوە, لەوکاتەدا کە ئەو بڕیار لەسەر ئەوەدەدات پشت بەهیچ شتێکی متمانە پێکراو نابەستێت تاوەکو بە ئەنقەست بکەوێتە هەڵەوە".

لە واقیعدا, هیچ هۆیەك نییە بیانووی نەهاتنی ناوی (الرحمن) لەماوەیەکی دیایکراودا لەکاتی نیشتەجێبوونی پێغەمبەر (ﷺ) لەمەککەدا بهێنێتەوە.

چونکە نەقورئانو نەسوونەت باس لەهیچ هۆیەك ناکەن پاڵ بە پێغەمبەرەوە بنێت (ﷺ) کارێکی لەوجۆرە بکات, وە ئەوەی کەناوی (الرحمن) لە ژمارەیەکی دیاریکراوی سورەتەکاندا بەرچاو ناکەوێت هەرگیز ئەو بیانووە نادات بەدەستەوە تاوەکو ئەو سورەتانە بکەینە گروپێك کە قۆناغی مەکی سێیەم پێك بهێنن, وە ئەگەرپاڵنەرێك –هۆیەك– هەبوایە بۆ خۆلادان لەبەکارهێنانی ناوی (الرحمن) لە قۆناغی مەکیدا ئەو کاتە دەبوایە دەنگدانەوەی ئەوەمان لە قورئانو سوونەتدا

دەست بکەوتایە, وە بەرهەڵستی کۆمەڵە مەکییەکە بۆ بەکارهێنانی ئەو ناوە لە کاتی (ڕێککەوتننامەی حودەیبییە) لە ساڵی (6)ی کۆچیدا بەرهەڵستیەك بوو لەسەر (بەسمەلە– بسم الله الرحمن الرحيم), بەشێوەیەکی گشتی بەو پێیەی کە سیفەتێکی جیاکەرەوەی ئیسلامە.

3ـ ئەوەی کە تایبەتە بە شێوازەوە ئەگەر سوودی هەبووبێت لەجیاکردنەوەی نێوان ماوە درێژەکاندا بەڵام لەوەدا کە پەیوەستە بەجیاکردنەوەی بەشوێن یەکدا هاتنی مێژوویی سورەتەکان لەماوەیەکی کورتدا هیچ سودێکی نابێت چونکە لە واقیعدا هەموو قۆناغی مەکی 12 ساڵ زیاتر نییە ساڵی (610–622ز) ئیتر بە چ حەقێك بانگەشەی جیایی لەنێوان شێوازی نووسەردا لەماوەی تەنها (12ساڵدا) بکەین؟ واز لەوەش بێنە کە بتوانین لەو ماوەیەدا جیاوازی بکەین لەنێوان سێ ماوەی کورتدا, چونکە بابەتی جیاکردنەوە بارودۆخی زۆرە, ئەگەر بڵێین ڕێکخستنی مێژوویی سوورەتەکان بەپێی شێواز لە قۆناغی مەکیدا لەتوانامانا هەیە ئەوا بانگەشەیەکی لەو جۆرە ئەگەر درۆش نەبێت دوورە لەڕاستییەوە.

2ـ هـ. گریم:

پاش هەوڵەکەی نۆڵدکە لە ساڵی (1880ز)دا هەوڵێکی هـ. گریم, دێت لەکتێبی (موحەممەد) –مونستر– (1892ز) بەشی دووەم– لاپەڕە (250, 270).

بیرۆکەی سەرەکی ڕێکخستنەکەی بریتییە لەگەشەکردنی بابەتە ئاینییەکانی: یەکتاپەرستی, زیندووبوونەوە, ڕۆژی دوایی...هتد, وە ئەو کارەکەی بەتایبەت لەسەر قۆناغی مەدەنی چڕ دەکاتەوە, وە لەوەدا کە پەیوەندی بەقۆناغی مەکییەوە هەیە پشت بە بنەمای ڕێکخستنەکەی (نۆلدکە) دەبەستێت ودابەشی دەکات بەسەر سێ ماوەی کورتدا, بەڵام لەم خاڵانەی خوارەوەدا لەگەڵیدا جیاوازە:

أـ لەماوەی کورتی یەکەمدا ئەم سورەتانە ناهێنێت:

(الذاريات, الطور, النجم, الرحمن, الواقيعة, الفاتحة, القدر, الكافرون, الاخلاص) بەڵام سورەتەکانی (الذاريات هەتا الواقعة) لەماوەی دووەمدا دادەنێت, وە سورەتەکانی (الفاتحە, القدر, الكافرون, الاخلاص) دەخاتە ماوەی سێیەمەوە.

ب ـ وا دادەنێت سورەتی (ابراهيم) جگە لە دوو ئایەتی (32, 38) کەمەدەنین لەناو ماوەی دووەمدایە, هەروەها سورەتەکانی (الرعد) و( ق) و( القمر)یش.

ج ـ لەلای ئەو سورەتی (الانسان) سەربە ماوەی یەکەمە.

دـ هەموو سورەتەکانی ماوەی دووەمی ڕێکخستنەکەی (نولڵکە) لەلای (گریم) لەناو ماوەی سێیەمدا پلەبەند کراون.

هـ ـ لەنێوان هەردووکیاندا جیاوازی هەیە لەوەدا کە پەیوەستە بەڕوونکردنەوەی ئەو ئایەتانەی لە سوورەتە ئاماژەپێکراوەکاندا هەن لەسەر ئەوەی ئەوانە لەمێژوویەکی پاشتر لە سورەتەکانی دیکە دابەزیون.

وـ لای (نولدکە) نەوەد سورەت مەکین و بیستو چواریش مەدەنی, لەلای (گریم) نەوەدو دوو سورەت مەکین و بیستودوو سورەتیش مەدەنین.

زـ وەك بینیمان لەلای (گریم) ماوەی سێیەم زۆر کورتە چونکە بەڕای ئەو ئەو ماوەیە بەتایبەتی دەربارەی ڕوودانی ڕۆژی دوایی و سزای بەرکەوتووی سەر بێ باوەڕان دەدوێت.

3ـ ڕۆژهەڵاتناس (ولیام موییر – William Muir):

لەبەشی دووەمی کتێبەکەیدا (حیاة محمد) لاپەڕە (132, 183, 318, 320) هەروەها لە کتێبی (القرآن تکوینە وتعالیمە) لاپەڕە (47, 73) ی ساڵی (1898ز) دا (موییر) سورەتە مەکییەکان دابەش دەکات بەسەر پێنج قۆناغدا.

أـ قۆناغی یەکەم پێش هاتنی پێغەمبەر(ﷺ)

ب ـ کۆنترین سوورەتەکان تاوەکو یەکەم دەرکەوتنی فەرمیی پەیامی پێغەمبەرایەتی.

ج ـ لەیەکەم دەرکەوتنی پەیامەکەیەوە هەتا ساڵی شەشەمی پێغەمبەرایەتی (616ز).

دـ لە ساڵی شەشەمی پێغەمبەرایەتییەوە هەتا ساڵی دەیەم.

هـ ـ لە ساڵی دەیەمەوە هەتا کۆچ بۆ مەدینە لە ساڵی (622ز)دا.

پاش (93 سورەتی مەکیو (21) سورەتی مەدەنی ڕێکخستنە مێژووییەکەی بەم شێوەیەی لای خوارەوەیە:

1ـ سەردەمی مەکیی:

(العلق, العادیات, الشرح, الشمس, قریش, الفاتحة, القارعة, التین, التکاثر, الهمزة, الانفطار, اللیل, الفیل, الفجر, عبس, الانشقاق, الطارق, النصر, البروج, المطففین, النبأ, المرسلات, الانسان, القیامة, المعارج, الکافرون, الاخلاص, الرحمن, الواقعة, الملك, النجم, السجدة, الزمر, النازعات, القمر, سبأ, لقمان, الحاقة, القلم, فصلت, نوح, الطور, ق, الجاثیة, الصافات, الروم, النور, الحجر, الذاریات, الاحقاف, الجن, فاطر, یس, مریم, الکهف, النحل, الشوری, غافر, ص, الفرقان, طه, الزخرف, یوسف, هود, یونس, ابراهیم, الانعام, التغابن, القصص, المؤمنون, الحج, الانبیاء, الاسراء, النمل, الرعد, العنکبوت, الاعراف, الفلق, الناس).

2ـ سەردەمی مەدەنیی:

(البقرة, محمد, الحدید, الانفال, المجادلة, الطلاق, البینة, الجمعة, الحشر, النور, المنافقون, الفتح, الصف, النساء, آل عمران, المائدة, الاحزاب, الممتحنة, التحریم, الحجرات, التوبة).

جیاوازییەکانی نێوان ئەم ڕێکخستنەو ڕێکخستنەکەی (نولدکە) بریتییە لە:

أـ حەوت سورەتی ماوەی یەکەمی مەکیی لەلای (نولدکە) گوێزراوەتەوە بۆ ماوەی چوارەم لەلای (موییر).

ب ـ هەشت سورەت لەماوەی دووەم گوازراوەتەوە بۆ ماوەی پێنجەم لەلای (موییر).

هەروەك هەریەکە لە (نولدکە – شفالی) لە( تأریخ القرآن) لاپەڕە (73)دا تێبینیان کردووە کە هەڵەی سەرەکی (موییر) ئەو بۆچوونەیەتی سەبارەت بە دیاریکردنی ڕێکخستنی هاتنەخوارەوەی سورەتەکان لەهەموو قۆناغێکدا, لەوەدا خۆی دانی پێدا دەنێت کە بەتەواوەتی لەو هەوڵەیدا سەرکەوتوونەبووە, لەڕاستیشدا ئەو کاتێك لەجیاتی سێ ماوەی بچوك هەموو سەردەمی مەککی دابەشکرد بۆ چەند قۆناغێك بەوە کێشەکەی ئاڵۆزتر کرد, وە بەپێچەوانەوە (نولدکە) دان بەوەدا دەنێت کە ئەو ڕێکخستنەی ئەو دەیخاتە ڕوو ڕێکخستنێکی نزیککراوە – تقریبی – یە.

4ـ ریجس بلاشیر:

بلاشیر لەوەرگێڕانەکەیدا بۆ قورئان (پاریس 1949ز, 1951ز) پشت بەهەمان ڕێکخستنەکەی (نوڵدکەو شفالی) دەبەستێت جگە لە سێ خاڵدا نەبێت کە کاریگەرییان نییە!

أـ بلاشیر سورەتەکانی (الذاریات, القلم) لە سەرەتای ماوەی دووەمدا دادەنێت, لەکاتێکدا شوێنەکەیان لەلای (نولدکەو شفالی) لەکۆتایی ماوەی یەکەمدایە.

ب ـ سورەتی (یوسف) لەلای (بلاشیر) لەناو ماوەی سێیەمدا پلەبەندکراوە, لەکاتێکدا لەلای (نولدکەو شفالی) لەناو ماوەی دووەمدا دانراوە.

ج ـ بەدوای یەکداهاتنی سورەتەکان لەماوەی یەکەمدا لەوەرگێڕانەکەی بلاشیردا جیاوازە لەو شێوەیەی کە (نولّدکەو شڤالی) پشتیان پی بەستووە, (بلاشیر) وا باسی دەکات کە ئەو جیاوازییە سەرچاوەکەی ئەوەیە کە ئەو لەنێوان خەلّکیدا دابەشکردنی سورەتەکانی بۆ چەند گروپێك بەرچاوکەوتووەو بۆ هەموو سورەتێکیش لەو گروپەوە بیرۆکەیەکی هاوشێوە بۆ یەکێکی تریان هەیە پاشان زنجیرەی بەدوای یەکدا هاتنی بەشێوەیەك داناوە کە لەگەلّ گەشەکردنی بانگەوازە تازە پێگەیشتووەکەدا بگونجێنێتو ڕێککبەکەوێت. (القرآن (2) لاپەڕە (6) پاریس (1949ز) وە نارەواییو زۆرداری بلاشیر لەوەدا دەگاتە چلّەپۆپە کاتێك هەندێك سورەت دابەش دەکات بۆ چەند بەشێك بەپێی چەند مێژوویەکی جیاوازو بەبێ پشت بەستن بەهەر هۆکارێك یان زانیارییەکانی مێژوویەکی دیکە.

بەپێی ئەو دابەشکردنە وردبین کراوەی کە پێی هەستاوە دەبینین ژمارەی سورەتەکان لەلای ئەو لەجیاتی (114) دەبنە (116) هەروەك لەلای جهیانی ئیسلامیو ڕۆژهەلاّتناسەکانیش ئەوە ئاشکراو زانراوە کە ژمارەی سورەتەکانی قورئان (114) سورەتن نەك (116).

لەگەلّ ئەوەدا کەهەمان دەقی قورئان لەلای (بلاشیر) هەر ئەو دەقی قورئانەیە کە لەلای هەموو جیهان هەیە, کەچی ئەو هەردوو سورەتی (العلق) و( المدثر) هەریەکەیانی کردووە بەدوو سورەت بەم شێوەیە:

1ـ سورەتی (العلق) لە ئایەتی (1) بۆ (5) دەبێتە دەقی ژمارە (1) لە ڕێکخستنەکەی (بلاشیر)دا, وەئایەتی (6) هەتا (19)ی کردووە بەدەقی ژمارە (32) واتە دەقێکی سەربەخۆ.

ب ـ سورەتی (المدثر) ئایەتەکانی (1بۆ7) دەبنە دەقی ژمارە (2) وە لە ئایەتی (8) بۆ (55) دەقێکی سەربەخۆیە لەژێر ژمارەی (36)دا.

5ـ ریچارد دبیل:

دوایین ڕۆژهەلاّتناس کە باسی دەکەین (ریچارد دبیل)ە, کە لەبەشی شەشەمی کتێبەکەیدا (مقدمة في القرآن 1953ز) لەژێر ناونیشانی (الترتیب التأریخی للقرآن– ڕێکخستنی مێژوویی قورئان) دا گفتوگۆی دەربارەی ئەم مەسەلەیە کردووە.

وە پاش ئەوەی هەولّەکەی (نولّدکە)ی ئەلّمانی خستۆتەڕوو کەبەلای ئەوەوە زیاتر پەسەندە,هەروەها خستنە ڕووی هەولّەکانی (مویرو گریمو هێرشفیلدو بلاشیر), دانیش بەوەدا دەنێت کە دەشێت گومان لەوەبکرێت بتوانرێت ڕێکخستنێکی تەواوی قورئان بەپێی هاتنەخوارەوەی ئەنجام بدرێت.

هەروەها باوەڕیشی وایە کەباشترین بڕیارێك بتوانرێت لەم بارەیەوە بدرێت بریتییە لە خستنەڕووی بنەما –پرەنسیبە– گشتییەکان, لەگەلّ دانانی بۆچوونێك بتوانرێت سیستمەکانی قورئان لەناویدا تێکەلّ بکرێن.

ئەم بنەمایانەی خوارەوەی ڕونکردووەتەوە:

1ـ لەنەبوونی سەرشارێك –مرجعیەتێك– ی مێژوویدا بۆ ڕووداوەکان دەکرێت شێواز ببێتە پێودانگێکی بەسود بۆ دیاریکردنی مێژوویەکی نزیککراوە –تقریبی–, پاشان دان بەوەشدا دەنێت کە ئەو پێودانگە بەکارهێنانی قورسە.

2ـ هەلّبژاردنی پێودانگێکی دیکەی ڕاستتر ئەویش ڕێکخستنی ڕستەکانە, وە لێرەشدا دان بەوەدا دەنێت کەچەند شتێکی پێکەوە گونجاوو دەگمەنیش لەوێدا هەیە کە دەشێت بمانخاتە هەلّەوە.

پاش ئەوەی بەو پێودانگانەی کە پێشنیاری کردن خۆی لاوازکرد, ئیتو مشتومڕ لەسەر یەکەمی بوونی سورەتەکانی (العلق, القلم) دەکات ئەو دوو سورەتەی کەهەموو نووسەرە مسوڵمانەکانو هەروەها ڕۆژهەڵاتناسەکانیش دەزانن ئەو دوو سورەتە یەکەمو دووەم سورەتن لە سورەتەکانی قورئان, بەڵگەشی بۆ ئەوە ئەمەیە:

"شێوازی قسەکردن لەم دوو سورەتەدا زیاتر لەگەڵ تێگەیشتنو زانیارییەکانی دوای سەرهەڵدانی پێغەمبەردا دەگونجێن, زیاتر لەوەی لەگەڵ بۆچوونو بیرکرنەوە سەرەتاییەکانی (موحەممەد)دا بگونجێن, بەجۆرێك ئەو لەسەرەتاوە هیچ بۆچوونێکی دەربارەی فریشتەکان نەبووە " بێگومان ئەمەش هەڵەیەکی پوختو زەقە, چونکە عەقیدەی خواناسی بەر لە ئیسلام تایبەت بووە بە بیرۆکەی فریشتەوە, لەبەرئەوەی کە یەهودییەتو هەروەها مەسیحییەتیش کە شوێنکەوتوانیان لەدوورگەی عەرەبیدا هەبووە بەشێوەیەکی بەردەوام بانگی فریشتەکانیان کردووەو ناویان بردون, ئیتر چۆن دەکرێت بڵێین کە موحەممەد لەسەرتاوە هیچ بۆچوونێکی دەربارەی فریشتەکان نەبووە؟

دەبا هەندێك لەگاڵتە جاڕییەکانی (ریچارد دبیل) بخەینە ڕوو:

أ- وشەی (نبی) وشەیەکی مەدەنیە.

ب - ئیبراهیم تەنها لەمەدینەدا بووەتە پێغەمبەر.

ج - ئیسلام, موسلیم, وە بەکارهێنانی ئاینی بۆ وشەی (أسلم– هاتنە ناو ئیسلام) وشەیەکی سەردەمی مەدەنییە .

بەڵام ئەم بانگەشانە درۆن, چونکە وشەی (نبی) لە سورەتە مەکییەکاندا هەیە:

(الانعام, الاعراف, الفرقان, الزخرف, مریم, الروم) وە ئیبراهیم وەك پێغەمبەرێك لەم سورەتە مەکیانەدا ناوی هاتووە:

(الانعام, هود, یوسف, إبراهیم, الحجر, النحل, مریم, الانبیاء, الشعراء, العنکبوت, ص, الشوری, الزخرف, الذاریات, النجم, الاعلی) وە وشەکانی (إسلام, مسلم, مسلمون) لە (21) سورەتی مەکیدا هەن.

ئەگەر ئەم بنەمایانەی (بیل) جێبەجێبکرێن ئەوا دەبێت (44) سورەت لەسەردەمی مەکیی کەم بکەینەوەو بیانخەینە سەر قۆناغی (مەدەنی) لەلای هەموو توێژەکارەکانیش, ئائەوە بۆخۆی گاڵتەجاڕیە.

**کۆتایی ئەم بەشە**

ئەمە ئەو هەوڵانەبوون کە زانا مسوڵمانەکانو ڕۆژهەڵاتناسەکان بۆ ڕێکخستنی سورەتەکانی قورئان بەپێی دابەزینیان ئەنجامیانداوە, بەڵام هەموو ئەم هەوڵانە بەشکست خواردوو دەژمێردرێن, بەڵام هەوڵەکانی زانا مسوڵمانەکان ناحەقییان کەمتر پێوە دیارە چونکە تەنها بەدابەشکردنی سورەتەکان بۆ دوو سەردەمی (مەکی)و (مەدەنی) وازدەهێنن, لەگەڵ ئەوەشدا ڕێکخستنی سورەتەکان گریمانەیەکە لەگەڵ هەموو جارێکدا لەڕووی سەرچاوە مێژووییەکانەوە لاوازە.

بڕوامان وایەو هەندێك چیرۆکیش جەخت لەوە دەکەن کە قورئان لەماوەی ژیانی پێغەمبەردا (ﷺ) لەیەك کتێبدا ڕێکخراوە لەبەر ئەمانە:

أ- سوننەتو تەفسیرە قورئانییەکان جەختیان لەسەر ئەو ئایەتە مەدەنییانە کردووە کە لە سورەتە مەکییە پێشکەوتووەکان –پێشینەکان–دا هەن وە پێویست وایە کۆکردنەوەی سورەتەکان بەکردەیی ڕێکخرابنو پاش ئەوە ئەو ئایەتانەی کەلەمەدینە هاتوونەتە خوارەوە تیایدا ڕونکرابێتەوە کەهەندێك بۆچوونی ناو سورەتە پێشووەکان هەموویان ڕاست دەکەنەوە.

بۆ نمونە (سورەتی الشعراء) لەکۆتاییدا لە ئایەتی (227) پێکهاتووەو ئایەتێکی مەدەنییەو بۆی زیادکراوە تاوەکوشاعیرە مسوڵمانەکان جیا بکاتەوە لەو ئیدانەکردنەی کە بۆ شاعیران تیایەتی, چونکە ئەو شاعیرە مسوڵمانانەی وەك (حەسانی کوڕی سابتو عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحەو کەعبی کوڕی مالك) بەرگرییان لە پێغەمبەر دەکرد (ﷺ) (بڕوانە:

تەفسیری الطبري, اسباب النزول للسیوطي) هەروەها (چاپە فەرمییە میسرییەکە) کە لەسەرەتای هەر سورەتێکەوە ئایەتە مەدەنییەکانی ناو سوورەتەمەکییەکان ڕووندەکاتەوە کە پێش ئەوە دابەزیون (بڕوانە لاپەڕە (122, 123) الزركشی, البرهان لاپەڕە (199, 263) کە تیایدا سەرژمێریەکی تەواوان لەو بارەیەوە پێدەبەخشرێت.

ب ـ ئەو قورئانە کۆکراوە لەماوەی ژیانی پێغەمبەردا (ﷺ) هەر دەبێت لەسەر پێستە نووسرابێتەوە, وە قورئان باس لەنووسینی هەڵکۆڵراو دەکات ( وَكِتَابٍ مَّسْطُورٍ* فِي رَقٍّ مَّنشُورٍ) ئایەتی (2–3) سورەتی (الطور) واتە "کتێبێکی ڕێکوپێك لە تیانووسێکی ڕاخراوی دانەخراوو سەرمۆر نەکراودا". (تیانووس: هەرشتێك لەسەری بنووسرێت، پێستە بێت یان کاغەز یان هەرشتێکی تر — وەرگێڕ—).

شاعیرە کۆنەکان لەزۆر شوێندا باسیان لە پێستەو ئەو پارچانە کردووە کەلەسەری نووسراوە, وە دەگێڕنەوە کە (حەوت یان دە) هۆنراوەکەی شاعیرە مسوڵمانەکان (المعلقات السبع) لەسەر پێستە یان گەڵای (بردی) نووسراوەتەوە. (بردی: پاپیرۆس, جۆرە گیایەکە میسریە کۆنەکان بۆ نووسین بەکاریان هێناوە — وەرگێڕ—).

ئەو شیعرە نووسراوانە لەناو کەعبەدا هەڵواسرابوون, هەموو ئەمانە ئەوە دەسەلمێنن کە بەکارهێنانی پێستە یان گەڵای بەردی لەناو مەککەو مەدینەو دوورگەی عەرەبیدا بەشێوەیەی گشتی بڵاوبووە, وە ئەگەر کەسێك ڕەخنە لەبەسەرهاتی (زەیدی کوڕی سابت) بگرێت کە قورئانی لە پارچە گەڵاو بەردو پەلکی دارخورماو ئێسقانو ناوشانی حوشترو ئێسكو ئێسقانی چوارپەلی وڵاخو پێستەکەیاندا کۆکردووەتەوە, من بەوە بەرپەرچی دەدەمەوە کە ئەوە وەك ئەو دیکۆمێنتانە وایە کە ئاسانکاری دەکەن بۆ کۆکردنەوەی دەقێکی دیاریکراو تاوەکو نەفەوتێتو لەناونەچێت, وە ئەوەش ڕێك لەوەدەچێت کە ئەمڕۆ لەسەر دەستنووسە تەواوەکان لەکارێکی چاپکردنی چەسپاوو سەلمێنراودا ئەنجامی دەدەین, وەلەگەڵ بڕوانامەو کاغەزە پرژوبڵاوەکاندا کۆی دەکەینەوە..هتد.

ئەوەش کە پەیوەندی بەدابەشکردنی سیانی قۆناغی مەکییەوە هەیە پێویستە ئاماژەی پێبکەین بۆ ئەوەی کە (ویلو نولدکە) یەکەم کەس نین بۆ ئەو مەسەلەیە چووبنو ئەوەیان وتبێت, بەڵکو پێشنیازێکیش بووە لەلایەن یەکێك لەکۆنترین زانا مسوڵمانەکانەوە کە (أبو القاسم الحسن بن محمد بن حبيب النيسابوري)یە کە لە کتێبەکەیدا (التنبيه الى أفضل العلوم القرآنية)دا دەڵێت "یەکێك لە ڕێزدارترینی زانستە قورئانییەکان بریتییە لەدابەزینی, وە شوێنەکانیو ڕێکخستنی ئەوەی لەمەککەدا هاتۆتەخوارەوە سەرەتاو ناوەڕاستو کۆتاییەکەی, وە ڕێکخستنی ئەوەش کەلەمەدینە هاتۆتە خوارەوە" (زەرکەشی ئەم بابەتەی لە (البرهان في علوم القرآن(1) لاپەڕە (192) قاهیرە (1957ز) چاپی (محمد أبو الفضل ابراهيم )دا هێناوەو باسی کردووە. کەواتە چاکەی دەستپێشخەری لەڕێکخستنی سیانی سورەتەکانی سەردەمی مەکیدا دەگەڕێتەوە بۆ وتەکەی (نیسابوری) نەك (ویل یان نولدکە), تەنها وا دەردەکەوێت کە( نیسابوری) یان (الزرکشی) لەبەشی داهاتوودا باسی کردووە بەڵام لەڕێکخستنی مێژوویی سورەتە مەکییەکان لەنێوان هەر سێ ماوەکەدا کە باسی کردوون جیاوازی نەکردووە لە ژماردنیاندا, لاپەڕە (193)و ڕێکخستنەکەی بەم جۆرەیە: "یەکەم سورەت کە لەمەککە دابەزی بریتییە لە (إقراء باسم ربك) (العلق, پاشان (نون والقلم) پاشان (يا أيها المزمل).

بەو شێوەیە (85) سورەتی مەکی دەژمێردرێتو پاشان (9) سورەتی مەدەنیش دەژمێرێت کە یەکەمیان سورەتی (البقرة)یە, وە ئەم ڕێکخستنەی ڕێکە لەگەڵ ڕێکخستنەکەی (ابن عبدالكافي) کە پێشتر باسمان کرد وە لەدەرەنجامی ئەمەوە ئاشکرا دەبێت کە نە (فایل)و نە (نۆڵدکە)و نە ئەوانەی شوێنیان کەوتوون بیرۆکەو بۆچوونی نوێیان نەبووە لەبارەی ڕێکخستنی سورەتەکانی قورئاندا بەپێی هاتنەخوارەوەیان.

بۆیە بەشی نۆیەم لەبەشی یەکەم لاپەڕە (19–209)ی کتێبەکە (الزرکشی) بەسە بۆ ئەوەی قەناعەتێکی تەواو بەوە بکەین, لەکۆتاییشدا پێویستە لەسەرمان کە ڕابمێنینو فێری ئەم وانە جوانەی بی فیزی ببین کە (زەرکەشی) لەلاپەڕە (192)ی بەشی یەکەمی کتێبەکەیدا پێی ڕاگەیاندووینو بریتییە لە: "گومان لەوەدا نییە کە جیاوازی هەیە دەربارەی هەندێك سورەت کە ئایا سورەتێکی مەکییە یان مەدەنی, بۆ ئەوەش لەوانەیە سودو بەلگەی خۆی هەبێت..".

مەسەلەی زاراوە ناعەرەبییەکان لە قورئاندا لەسەدەی یەکەمی کۆچییەوە (حەوتەمی زاینی) وروژێنراوەو زانا مسوڵمانەکانی خستووەتە ناو مشتومڕێکی بەرفراوان لەنێوان لایەنگرو بەرهەڵستکاراندا:

أ- لەنێوان ئەو کەسانەدا کە ئەوە ڕەد دەکەنەوە وشەی نا عەرەبی لە قورئاندا هەبێت ئەمانەن: ئیمامی شافیعی کە دامەزرێنەری مەزهەبی فیقهی شافعیە, وە ئەبوعوبەیدە کە زانایەکی فیقهی زمانە, هەروەها موحەممەدی کوڕی جەریری طەبەری کە مێژوونووسێکی گەورەو بەناوبانگترین ڕاڤەکاری قورئانە, (ئەبوبەکری بەقلانی) کە زانایەکی ئەشعەرییە, هەروەها (أبو الحسن کوڕی فارس) زانای فیقهی زمان, ئەوانە مەسەلەکەیان لەسەر دوو ئایەتی قورئانی بنیات ناوە کە ئەمانەن: (إِنَّا أَنزَلْنَاهُ قُرْآناً عَرَبِيّاً لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ) (یوسف: 2 ). (وَلَوْ جَعَلْنَاهُ قُرْآناً أعْجَمِيّاً لَّقَالُوا لَوْلَا فُصِّلَتْ آيَاتُهُ أَأعْجَمِيٌّ وَعَرَبِيٌّ قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ آمَنُوا هُدًى وَشِفَاء وَالَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ فِي آذَانِهِمْ وَقْرٌ وَهُوَ عَلَيْهِمْ عَمًى أُوْلَئِكَ يُنَادَوْنَ مِن مَّكَانٍ بَعِيدٍ) (فصلت: 44 ).

هەروەها وتویانە ئەگەر عەرەب نەیانتوانیبێت دەقی هاوشێوەی دەقەکانی قورئان بهێننەوە ئەوا دەبوو ناڕەزاییان دەربڕیایەو بیان گوتایە کە قورئان لەزمانگەلێك پێکهاتووە عەرەب تێیان ناگات.

ب - لەنێوان ئەوانەدا کە وتویانە قورئان وشەی ناعەرەبی – عەجەمی– تێدایە, بەپلەی یەکەم (عەبدوڵلای کوڕی عەباس)و (عەکریمە)ی قوتابییەتی, پاشان (ئەبوموسای ئەشعەری) کە سەلماندوویانە لە قورئاندا زاراوەی نا عەرەبی هەن لیستیشیان بۆئەو زاراوانە داناوە.

ئەوانەیان کە حاشا لەبوونی وەها حاڵەتێك دەکەن خۆیان بەستووەتەوە بەشتێکی ئاشکراوە ئەویش ئەوەیە کە ئەو وشانەی لەو لیستەدا هاتوون لە قورئانو لەهەندێك زمانی دیکەشدا هەن کە دژەکانیان ناویان بردوون, کەسێکی وەك (طبري) ڕاڤەی ئەم ڕێککەوتنو گونجاندنە دەکاتو دەڵێت: ئەم نمونانە (واتە ئەو وشانەی لە لیستی ناوە ناعەرەبییەکاندا هاتوون) لەوەوە هاتوون کە دەگونجێت زمانە جیاوازەکانی دیکە ڕێکبن لە گوزارشت کردنو دەربڕینی شتێکدا ئەوەش پڕاوپڕ ڕێکەوتە, دەشێت شتەکان بەوشەگەلێکی چوون یەك ناویان لێبنرێت, بۆ نموونە عەرەبو فارسو حەبەشییەکان هەمان زاراوەیان بەکارهێناوە بۆ گوزارشتکردن لەهەمان شت.

زەرکەشی لە (البرهان) بەشی یەکەم, لاپەڕە (289), قاهیرە, 1975ز, ئەم وتەیەی (طبري) هێناوەتەوە, هەروەها (ئەبوعوبەیدە)ش ڕای (ئیبن فارس) پەسەند دەکات (زەرکەشی, سەرچاوەی پێشوو, لاپەڕە 289).

بەڵام (إبن عطية) بەرهەڵستی ئەم ڕایە دەکات ئەوەش لە پێشەکی کتێبەکەیدا "حول تفسير القرآن"[1] لاپەڕە (277)داو دەڵێت "ئەو تەفسیرەی ( طبری )کە دوو زمان لەهەمان وشەدا وەك یەك بن لەڕاستییەوە دوورە, وە لە واقیعدا زمانی یەکەم وشە بنەڕەتییەکەی تێدایەو زمانی دووەمیش وشە وەرگیراوەکەیە ئەمەش لەزۆربەی حاڵەتەکاندا وایە, وە ئێمە لواندنی ڕێککەوتن ناسەلمێنین, بەڵام لەچەند حاڵەتێکی کەمداو بەڕێگەیەکی بێجگەیی – استثنائی – شتی وا ڕوو دەدات (الزرکشی, سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە (290).

(أبو عبيدة القاسم بن سلام) گونجاندنێك دەخاتە نێوان هەردوو ڕاکەو دەڵێت "لەلای من ڕای ڕاستو دروست بریتییە لەوتنو کارکردن بەهەردوو ڕاکە, لەڕاستیدا ئەو وشە لێکچوانەی نێوان زمانی عەرەبیو زمانەکانی دیکە بنچینەکەیان عەجەمین –ناعەرەبی– بەو پێیەی کە زاناکان بڕیاریان لەسەرداوە, بەڵام گەیشتوونەتە لای عەرەبو ئەوانیش بەڕۆڵی خۆیان کردوویانن بەعەرەبیو لەزمانەکانی دیکەوە گۆڕیوویانن بۆ سەر زمانی خۆیانو بەو شێوەیە بوونەتە عەرەبی. وە

[1] الجامع المحرر ... الوجيز في تفسير القران العزيز.

کاتێك قورئان دابەزی ئەو وشانە پێشتر تێکەڵ بەزمانی عەرەب بوو بوون, لەبەرئەوە ئەوەی وتویەتی ئەو وشانە عەرەبین لەسەر حەقەو وە ئەوەش وتوویەتی ئەو وشانە عەجەمین هەروەها ئەویش لەسەر حەقە" (زەرکەشی, هەمان سەرچاوەی پێشوو, لاپەڕە 290, وە ئیبن فارس)یش کە شایەتی لەسەر ڕاکەی (أبو عبيدة القاسم بن سلام)داوە لە کتێبی (الصاحبی, لاپەڕە 29)دا دەگات بەهەمان گونجاندن.

بەهەرحاڵ ڕای پەسەندتر ئەو ڕایەی (إبن عطية)یە کە لە پێشەکی کتێبەکەیدا (حول التفسير القرآني) لاپەڕە (277)دا دەیلێت "ڕوونکردنەوەی ئەو ڕێککەوتنە لەنێوان زاراوە عەرەبییەکانو ئەوانی دیکە لەوەوە دێت کە عەرەبەکان ئەوانەی قورئانی پیرۆز بەزمانەکەیان دابەزی تێکەڵاویان هەبووە لەگەڵ زمانەکانی دیکەدا ئەوەش لەڕێگەی بازرگانیو ئەو دوو گەشتە ساڵانەییەی قوڕەیشەکانەوە, وە گەشتی گەڕیدەکان وەك گەشتەکەی (أبو عمر) بۆ شامو گەشتەکەی (عومەری کوڕی خەتاب)و (عەمری کوڕی عاص)و (عومەیرەی کوڕی وەلید) بۆ حەبەشەو گەشتەکەی (أعشى) بۆ (حەڕا)و تێکەڵبوونی بە مەسیحییەکانی ئەو شوێنەو لەوێشدا گەورەیی بۆ زمانی عەرەبی بوو, وە بەم هۆکارانە عەرەب وشەی عەجەمیان وەرگرتو بەلابردنی هەندێك پیت لێیانەوە هەندێکیانیان گۆڕیو هەستان بەسوككردنی قورسایی ناعەرەبی بوونەکەی, وە پاشان ئەو وشانەیان لە شیعرەکانیانو قسەکردنەکانیاندا بەکارهێناو کارگەیشتە ڕادەیەك کە ئەو وشانە هەمان شێوازی عەرەبی پوختیان بۆ دروست بوو پاشان لەوتارەکانیشیاندا بەکاریان دەهێناو بەم حاڵەتەشەوە قورئان بەکاری هێناون.

کەواتە حەقیقەت ئەوەیە کە ئەو وشانە عەرەبی نین, بەڵام عەرەب کردوونی بەعەرەبیو بەکاری هێناونو بەو واتاو چۆنیەتییەوە بوونەتە وشەگەلێکی عەرەبی" (لەهەمان سەرچاوەی پێشووی زەرکەشییەوە وەرگیراوە, لاپەڕە 289). ئەمەش سازاندنێکی بەهێزو پەسەندە.

- لیستی زەرکەشی (794ك– 1391ز) لەدایکبووە.

لێرەدا لیستەکەی زەرکەشی بۆ وشە ناعەرەبییەکان دەخەینە ڕوو کەبەبێ ڕێکخستن لە کتێبەکەیدا (البرهان) بەشی یەکەم (لاپەڕە 288, 289)دا باسی کردووە, بەڵام ئێمە لێرەدا بەم شێوەیە پۆلێنی دەکەین:

أ- لەزمانی یۆنانییەوە:

1- طفق= شتێك دەکات.

2- قسط – قسطاس= دادپەروەری.

3- رقيم= خوان یان مێزی نانخواردن.

4- سری= ڕووباری بچوك.

ب - لەزمانی فارسییەوە:

1- استبرق= لە فارسیدا (استبره)= قوماشی ئەستوور.

2- سجل= کتێب یان دەفتەر

ج - لە عیبرییەوە:

1- هدنا= تەوبەمان کرد.

2- طأها= ئەی پیاو, قاچت دانێ.

3- أليم= دەریا.

د- لە سریانییەوە:

1ـ طور= چيا.

هـ ـ له (نبطی )يەوە

1ـ سينين= جوان, چاك.

وـ له ئەمهەرييەوە:

1ـ ناشئة= هەستان لەكاتی شەودا.

2ـ كفلين= دووجار.

3ـ قسورة= شێر.

4ـ مشكات= وزەی ڕوناكی.

5ـ دری= ڕۆشن.

زـ له هيندييەوە:

1ـ سندس= پەردەی تەنك يان نەرم.

ح ـ له زمانی قيبتيەوە:

1ـ الآخرة (لله الآخرة)= يەكەم.

2ـ ورائهم= له پێشيانەوە.

3ـ يم= دەريا.

4ـ بطائنها= دەرەوەی.

ط ـ لەزمانی مەغريبييەوە:

1ـ مهل= قرچەی ڕۆن, زەيت.

2ـ يشار= هەتا كۆتاييەكەی پێدەگات.

3ـ إناه= لێنان – پێگەيشتن.

4ـ أب= گيا.

كۆی گشتی (25) زاراوەی نا عەرەبييە، ئەم ليستەش چەندين پرسيار دەوروژێنێت گرنگترينيان:

يەكەم: لەوەدا كە پەيوەندی بەبابەتی ئەم ليستەوە هەيە يەكەم پرسياريش كە دەوروژێت ئەوەيە.

ئەم زمانی مەغريبيي يە كامەيە؟ له گفتوگۆكردنێكی (سيوطي)دا بۆ ئەم وشەيە (المهل) له كتێبی (الاتقان)يدا لاپەڕە (325) چاپی 1952ز–4, بەشی يەكەم لاپەڕە (140) قاهيرە (1935ز) ڕوونی دەكاتەوە كەزمانی دانيشتوانی مەغريب واتە زمانی بەربەرەكان يان زمانی بەربەری.

ناوی دەنێت زمانی دانيشتوانی ئەفريقا, بەڵام (ئارسەر جيفری) له كتێبی (الكلمات الاجنبية في القرآن)دا لاپەڕە (31)– باروّدا– (1938ز) بڕوای وايە ئەوە شتێكە لەگەوجێتی ئەگەر گومانی ئەوە ببڕێت گوايا هەندێك ڕەگەزی وشەی بەربەری لەماوەی پێش هاتنی ئيسلامدا يان له ماوەی دابەزينی قورئاندا هاتبێتنە ناو زمانی عەرەبييەوە.

هەموو ئەوەی دەشێت بوترێت ئەوەيە كە ئەو وشانە بەلای زانايانەوە لەسەردەمی خۆياندا نهێنی بوونو وە دەستەواژەی "بەزمانی دانيشتوانی مەغريب يان بەزمانی بەربەر" بەداپۆشينێنێك بۆ شاردنەوەی نەزانی خۆيان لەقەڵەم دەدرێت.

دووەم: پرسیاری دووەم ئەوەیە "بۆچی ئیبنو عەباسو عەکریمەو ئەبوموسای ئەشعەریو ئەوانی تر ئەم لیستەیان بەزاراوە ناعەرەبییەکان ڕێکخستووە ئەگەر ئەو زمانە عەجەمییانەیان نەزانیبێت کە لێیانەوە بنچینەی ئەو وشانە وەرگیراوە؟ ئایا پشتیان بەکەسانێك بەستووە کە نمونەی ئەو زمانە عەجەمییانەیان زانیوە؟ وا دیارە وەڵامەکە بە (بەڵێ)یە چونکە ئەو ڕەگوڕیشە یان بنەچەیەی داویانەتە پاڵ هەندێك لەو وشانە دروستن, بۆ نموونە, لەگروپی یەکەمدا دوو وشەی (قسط وقسطاس) لەڕاستیدا قسطاس کە لێورگرتنەکەی (قسط)ە لە وشەی یۆنانی (Dikastes)وە وەرگیراوەو ماناکەی واتە (قازی) وەك (قولرز) لە (6ZDM)دا ڕوونی کردووەتەوە یان هەر لە یۆنانییەوە Xestes (کە لە لاتینییەوە وەرگیراوە Sexdarios لەڕۆمانیدا بەواتای پێوەر دێت وەك ئەوەی (منجانا) ڕوونی کردووەتەوە لە (التأثیر السریانی علی اسلوب القرآن) لە بلاوکراوەی Rylands (1927ن)دا) بەلام سێ وشەکەی دیکە کە وتویانە لە یۆنانییەوە وەرگیراون هیچ ڕاڤەیەکی ڕیشەیی نییە, وە سەیریش لەوەدایە کە ئەم سێ وشەیە _طفقا, رقیم, سری) خاسیەتەکانی وشەی بەریەرییان نییە کە ببێتە پاڵنەرێك بۆ ئەوەی بە عەجەمی لەقەڵەم بدرێن, بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەو سێ وشەیە کێشێکی عەرەبی پوختیان هەیە ئەی چی پاڵی بەو زانایانەوە ناوە کە هەوڵبدەن بنچینەیەکی عەجەمییان بۆ بدۆزنەوە؟

ئەوەش کە پەیوەستە بەوشەی (رقیم) ئایا هەر لەبەر ئەوەی لەمیانەی داڕشتنی چیرۆکی هاوڕێیانی ئەشکەوت (أصحاب الکهف)دا بەکارهاتووە بۆیە زانیویانە ئەوە وشەیەکی باوە لەوڵاتی (ڕۆم)دا؟

ئەوە بەسەر دووووشەکەی دیکەدا (طفق) و( سری) دا جێبەجێ نابێت: چونکە یەکەمیان پەیوەستە بە (ئادەمو حەوا)وە پاش ئەوەی هەڵەکەیان ئەنجامدا, وە دووەمیشیان پەیوەندی بە چیرۆکی (مەریەم)ەوە هەیە لەو کاتەدا کەعیسای کوڕی لەحاڵەتی لەدایکبووندا بوو.

سێیەم: پرسیاری سێیەم: ئەی بۆچی دوای ئەوە ئەو زانایانە بیریان چووە ئاماژە بۆ وشە گەلێك بکەن کە سروشتێکی عەجەمییانەی ئاشکرایان هەیە ؟ نمونەی ئەو وشانەش کە بنچینەیەکی یۆنانیان هەیە ئەمانەن:

- دینار (آل عمران 68)= Denarion.
- درهم (یوسف 20)= Drakhme دراخما پارەیەکی یۆنانییە.
- قنطار (آل عمران 14, 75, النساء 20)= Kentenarion.
- ابلیس (البقرة 22, الاعراف 61, ..هتد)= Diaboios.
- سیما (البقرة 273, الاعراف 46, محمد 30, الفتح 29, الرحمن 41)= Sema.
- صراط (25جار لة قورئاندا باسکراوة)= Strata.
- قرطاس (الانعام 7, 91)= Khartas.

چوارەم: (بۆچی کاتێك ئەوانەی دژ بە بوونی وشەی عەجەمین لە قورئاندا وتەی ئەوانەی کە بوونی ئەو وشانە دەسەلمێنن هەڵدەوەشێننەوەو بۆیان ڕووندەکەنەوە ئەو وشانە کەئەوان دەڵێن یۆنانی یان هی زمانی دیکەن وانییە ؟) خۆ لەنیوەی دووەمی سەدەی دووەمی کۆچیدا ئەو وەرگێڕانەی کە یۆنانیو سریانیان زانیوە هەبوونو زۆربوونو لەبەردەستی زانایانی زمانی عەرەبیدا بوون ئەی بۆچی ئەوانە بانگیان نەکردن بۆ خۆپاراستنو هەڵوەشاندنەوەی مەسەلەی نەیارەکانیان؟ ئەوانەی کەدەڵێن وشەی عەجەمی یۆنانیو سریانی لە قورئاندا هەن؟

ئەگەر گروپەکانی دیکە کەماون لە (ب)وە بۆ (ط) بخوێنینەوە ئەوا تێبینی ئەمانەی خوارەوە دەکەین:

1ـ لە گروپی (ب)دا وەرگرتنی دوو وشەکە دروستە.

2ـ لەگروپی (ح)دا وەرگرتنی هەرسێ وشەکە هەڵەیە.

3ـ لەگروپی (د)دا وەرگرتنی وشەی (طور) دروستە.

4ـ لە گروپی (ﻫ)دا وەرگرتنی وشەی (سینین) دروست نییە چونکە پێدەچێت کە( سینین)[1] ڕاستکردنەوەی وشەی (سینی)بێت, ئەوەش ڕاستکردنەوەیەکە ویستەکان –شوێنی وەستانەکان– پێویستی کردووە.

5ـ وشەی (مشکاة) بەتەنها ئەو ڕاستە بەڵام چوار ووشەکەی دیکە وەرگرتنەکانیان هەڵەیە 0بڕوانە جیفری, الالفاظ الاجنبية في القرآن, لاپەڕە (32, 266).

6ـ لەگروپی (ز)دا "سندس لە فارسییەوە وەرگیراوە وەك فراتیاج لە (المعجم) دا وای دەبینێت" وە (نفوراك) یش لە (الكلمات الاجنبيه 72)دا هەربەوشێوەیە دەیبینێت, لەکاتێکدا فرانکل لە (الكلمات الاجنبيه 400)دا وایدەبینێت کە ئەو وشەیە هاوشێوەی وشەی یۆنانی (Sindom)ە واتە (ئەو جلوبەرگەی کە لە ڕێوڕەسمە باخوسییەکانی پەیوەست بەباخوسی خوداوەندی شەرابەوە لەبەریان دەکرد).

7ـ دەربارەی گروپی (ح) کە لە قبتییەوە وەرگیراوە وە ئەوەی پەیوەستە بە وشەکانی(1 ، 2 ، 4) مایەی گاڵتەپێکردنە بەڵام وشەی (یم) ئەوەیان لەزمانی میسریو زمانی قیبتیدا هەیە (بڕوانە جیفری, لاپەڕە (293).

8ـ بەڵام دەربارەی گروپی (ط) کەلەزمانی مەغریب واتە بەربەرەوە وەرگیراوە شتێك نییە لەویارەیەوە بوترێت.

ـ لیستی (السيوطي) (911کۆچی– 1505ز) لەدایکبووە ئەویش بەپێی ڕێکخستنی (ابجد)ییە:

ـ اباريق= لە فارسییەوە.

ـ أب= گیا زمانی مەغریبی.

ـ إبلعي= زمانی ئەمهەری.

ـ أخلد= پشوودەدات بە عیبری.

ـ أرائك= چرپای خەوتن بەزمانی ئیبراهیم.

ـ آذر= ئەوکەسەی هەڵە دەکات بەزمانی ئیبراهیم.

ـ أسباط= هۆزەکان– خێڵەکان بەزمانی عیبری.

ـ إستبرق= کراسی زبر بە فارسی.

ـ أسفار= کتێبەکان بە سریانی.

ـ إصری= وەسیەتم بە نەبەطی.

ـ أكواب= پەرداخ بە نەبەطی.

ـ إل= ناوی خوا بەنەبەطی.

ـ أليم= (بەڕای ئیبن جەوزی زمانی زنجییەکانەو بەڕای (شهيد الله)ش زمانی عیبرییە) واتە دەریا.

ـ إناه= لێنانی زمانی بەربەری.

ـ أواه= قانع –ڕازی– زمانی حەبەشییە بەڕای (ئیبن عەباس) واتە (دلۆڤان –بەبەزەیی) زمانی حەبەشییەو بەڕای عەمری کوڕی شەرحەبیل, (نوێژی زۆرە) و بەڕای( واسطی) یش زمانی عیبریە.

ـ أواب= ئەوکەسەی تەسبیحاتی زۆر دەکات بەمەسیحی (حەبەشیە).

ـ الاولى والاخرة= قیبتیە.

---

[1] سورەتی التين, ئایەتی (2)

- بطائنها= دیوی دەرەوەی (قیبتیە).
- بعیر= گوێدرێژ لەزمانی عیبریدا.
- تنور= فڕن ( فارسییە).
- تبور= قببتیە.
- تحت= (لەو ئایەتەدا کە پەیوەستە بەمەریەمەوە (فناداها من تحتها) واتە (سك) بەزمانی نەبەطي).
- الجبت= (ناوی شەیتانە) لەزمانی حەبەشیدا.
- جهنم= ئاگر لەفارسیو عیبریدا.
- حرم= پێویست لەزمانی حەبەشیدا.
- حصب= سوتەمەنی ئاگر لەزمانی زنجییەکاندا.
- حطة= حەق بێژین لەزمانی عیبریدا.
- حوارین= شۆرەرەکان بەنەبەطي.
- حوب= گوناه لەزمانی حەبەشیدا.
- درست= عیبریە, واتە خوێندنەوەو فێربوون.
- دری= ڕۆشن –ڕوناك – لەزمانی حەبەشیدا.
- دینار= پارە بە فارسی.
- راعنا= جنێوی پێدا, بەعیبری.
- ربانیون= حاخامەکان بە سریانیو عیبری (حاخام) واتە پیاوی ئاینی جولەکە.
- ربیون= داینا –نووسی بەسریانی.
- الرحمن= لە عیبریدا بە پیتی خاء دەنووسرێت بەلای (مبرد)و (ثعالیبی)یەوە.
- الرس= بیر بە فارسی.
- الرقیم= پەت بە یۆنانی بەلای (شهیدالله)وە.
- الروم= بێزەنتییەکان (سریانی)ە.
- زنجبیل= فارسیە.
- السجل= لەحەبەشیدا واتە (پیاو) بەلای (ابن عباس)ەوە وە (کتێب) یان (دەفتەر) بەلای (جنی)یەوەو هەندێکیش دەڵێن وشەیەکی فارسییە.
- سجیل= وشەیەکی فارسییە واتە شتێك لە (بەردو قوڕ) پێکهاتووە.
- سرادق= لە فارسیدا (سایردە)یە واتە پەردەی ماڵ.
- سریا= ڕوبار لەزمانی سریانی یان قیبتیدا, یان یۆنانی بەلای (شهیدالله)ەوە.
سفرە= خوێنەر لەزمانی قیبتیدا.
- سقر= ئاگر لە فارسیدا.
- سجدا= بەسەری داپۆشراو لە سریانیدا.
- سکرا= ترێ لەزمانی حەبەشیدا.
- سلسبیل= جوالقی لە (الاجامي)دا دەڵێت وشەیەکی فارسییە.

ـ سنا= ابن حجر باسی کردووەو جگە لەو کەس ناوی نەبردووە.

ـ سندس= لەلای (جوالقی) وشەیەکی فارسییە بەڵام شهیدالله دەڵێت هیندییە (بەمانای قوماشی نەرم یان ئاوریشم).

ـ سیدها= مێردەکەی لەزمانی قیبتیدا.

ـ سینین= جوان لەزمانی قیبتیدا.

ـ شطر= بەلای لەزمانی حەبەشیدا.

ـ شهر= مانگ سریانیە.

ـ الصراط= ڕێگا یۆنانییە.

ـ صرهن= پارچە پارچەکردن نەبەگیە.

ـ صلوات= وێردو دوعا عیبریە.

ـ طه= ئەی پیاو بەنبطیو سریانی.

ـ طفقا= داینا (یۆنانیە).

ـ طوبی= ناوی بەهەشتە حەبەشییە.

ـ طور= چیا بە سریانی یان قیبتی.

ـ طوی= بەشەو یان ناوێکی پیاوانەیە لە عیبریدا.

ـ عبدت= کوژران –کوشتووتن– بەزمانی قیبتی.

ـ عدن= کێلگەی ترێ (ڕەز) بە سریانیو یۆنانی.

ـ العرم= بەحەبەشی واتە خوارەوە.

ـ غساق= سارد بەتورکی.

ـ فردوس= بەهەشت بە یۆنانیو لقی ترێ بە (نبطی).

ـ قوم= گەنم بە یۆنانی.

ـ قراطیس= بەلای (جوالقی)یەوە وشەیەکی عەجەمییە.

ـ قسط= دادپەروەری بە یۆنانی.

ـ قسطاس= تەرازوو بە یۆنانی.

ـ قسوره= بەلای (ابن عباس)ەوە حەبەشییە واتە شێر.

ـ قطنا= کتێبمان بە قیبتی.

ـ قمل= کێچ عیبری یان سریانییە.

ـ قفل= قوفڵ یان دایخست فارسییە.

ـ قنطار= بەلای (الثعالبی)یەوە لەزانستی زماندا ئەم وشەیە یۆنانیەو واتە دوانزەکێش.

ـ القیوم= ئەوەی کەناخەوێت لەزمانی سریانیدا.

ـ کافور= فارسیە.

ـ کفر= بیسڕەرەوە بە نبطی یان عیبری.

ـ کفلین= دووجار, بە نبطی.

ـ کنز= گەنجینە, فارسیە.

ـ كورت= دیارنەما (ونبوو) فارسیە.

ـ لینە= درەختی نەجیل بەزمانی جولەکەکانی مەدینە.

ـ متكأ= پرتەقاڵی تاڵ بەحەبەشی.

ـ مجوس= ئاگرپەرست بەلای جوالقییەوە وشەیەکی عەجەمیە.

ـ مرجان= مەرجان بەلای جوالقییەوە عەرەبی نییە.

ـ مسك= میسك ـبۆن ـ فارسیە.

ـ مشكاه= چرا بە حەبەشی.

ـ مقالید= کلیل بە فارسی.

ـ مرقوم= نووسراو بە عیبری.

ـ مزجاه= کەم نرخ فارسییە یان قیبتییە.

ـ ملكوت= شاهەنشاە قیبتیە.

ـ مناص= شوێنی ڕاکردن یا دەربازبوون قیبتیە.

ـ منساە= گۆچان بەحەبەشی.

ـ مهل= ڕۆن, زەیت عیبریە.

ـ ناشئة= نەخەوتن بەشەودا حەبەشە.

ـ ن= بە فارسی (أتون) چیت دەوێ بیکە.

ـ هدنا= تەویەمان کرد, عیبریە.

ـ هودا= یەهود وشەیەکی عەرەبی نییە.

ـ هون= ژیر, ئاقڵ, بە سریانی یان عیبری.

ـ هیت لك= وەرە, قیبتی یان سریانی یان حورانی یان عیبرییە.

ـ وراء= لە پێشەوە, قیبتییە.

ـ وردە= جوالقی دەڵێت وشەیەکی عەرەبی نییە.

ـ وزر= فێڵ یان پەناگە بە قیبتی.

ـ یحور= (إنە ظن أن لن یحور) واتە دەگەڕێتەوە حەبەشییە.

ـ یس= ئەی پیاو, حەبەشیە.

ـ یصدون= هاوار دەکەن, بەحەبەشی.

ـ یطهو= چاك لێی دەنێت (زمانی دانیشتوانی مەغریبییە یان بەلای (شهیدا الله)وە قیبتییە.

ـ الیم= دەریا لای (ابن قتیبە) سریانییەو لای (ابن جوزی) قیبتیە, (شهیدالله).

ـ الیهود= وشەیەکی ناعەرەبییەو لە بنچینەدا عیبریەو کراوەتە عەرەبی.

کۆی گشتی 119 وشەی (عەجەمی) ناعەرەبی.

(سیوطي) شانازی دەکات بەوەی کە ئەو یەکەم کەس بووە ئەم ژمارەیەی وشە عەجەمییەکانی ناو قورئانی کۆکردووەتەوە, هەروەها دەڵێت کە (قازی تاج الدین کوڕی سەبکی) شیعرێکی داناوە (27) وشەی عەجەمی تێدایەو (ابن حجر)یش شیعرێکی دیکەی داناوە کە (24) وشەی عەجەمی تێدایەو وە (سیوطي)یش شیعرێکی لە هەموو وشەکانی دیکە

که عەجەمین‌و لە قورئاندا هەن داناوە واتە خۆی لە نزیکەی (60) وشە زیاتر دەدات یان لەکۆتاییدا ئەو سێ قەسیدەیە پێك هاتوون لە (1000) وشە زیاتر وە (سیوطي) هەرسێ قەسیدەکەی بەتەواوی لە کتێبی (الاتقان, بەشی 1, لاپەڕە (140, 141), قاهیرە (1935ز)دا هێناوەتەوەو بەهەمان کێش‌و سەروا دایناونەتەوە.

هەروەها (السیوطي) هەواڵمان دەداتێ کە کتێبێکی داناوەو هەمووی تایبەتە بۆ ئەو بابەتە, بەناونیشانی (المهذب فیما وقع في القرآن من المعرب).

ئەمەش لیستێکە کە ڕۆژهەلاتناسەکان هەستاون بەدیراسەکردن لەبارەی ئەم بابەتەوە:

- دڤوراك (دەربارەی وشە بیانییەکان لە قورئاندا) ڤیەننا 1885ز.
- دڤوراك (پشکدارییەك دەربارەی کێشەی وشە بیانییەکان لە قورئاندا).
- س. فرانکل (وشە عەرەبییە کۆنە بنچینەییە گۆڕاوەکان لە بنەڕەتەکەیانەوە.
- س. فرانکل (تێکەڵە لە قورئاندا) ZDMG لاپەڕە (56, 71).
- هـ. گریم (دەربارەی هەندێك جۆری وشەی پاڵدراو بە ئاشووری دوورگەی عەرەبییەوە لە قورئاندا) ZA لاپەڕە (26) 1912ز.
- ئارسەر جیفری ( وشە بیانییەکانیان لە قورئاندا) پەیمانگای ڕۆژهەلاتی –باروبا– 1938ز.
- أ. منجانا (کاریگەری سریانی بەسەر شێوازی قورئانەوە) بلاوکراوەی ریناڵدز (1927ز).

**پێشنیازەکانمان**

ئەو نووسەرانە ئەرکو ماندووبوونێکی گەورەیان خستۆتەگەڕ بۆ ڕاڤەکردنی ژمارەیەکی زۆر لەو وشە داتاشراوە بیانیانەی کەلەناو قورئاندا هەن، دەبینین هەندێك جاریش پێشنیاری چەند داتاشراوێك بۆیەك وشە دەکەن, ئێمەش ئێستا پێشنیازی ڕاستکردنەوەی هەندێك لەو قەبلاندنانەتان بۆ دەکەین کە ئەوان ئەنجامیانداوە بەنیازی تەواوکردنی لیستەکانیشیان ئێمە سەرچاوەیەکی دیکەمان

دەرخستووە کە ئەوان بەتەواوی لەبیریان کردووە ئەویش زمانی لاتینییە, چونکە ڕۆمەکان لە دوورگەی عەرەبیدا لەماوەی ئەو حەوت سەدەیەی کە پێش دەرکەوتنی ئیسلام کەوتووە ئامادەییان هەبووە, وە یۆنانییەکانیش بەشێوەیەکی بەرفراوان لەنێوان گەلانی ناوچەکەدا بلاوبووبوونەوە بۆیە ناکرێت بەوە نەزانین کە زمانی ڕۆمانی بەڕادەیەکی وەها بوونی هەبووە کە وایکردووە بچێتە ناو پێکهاتەی زمانە خۆماڵییەکەوە، لەبەرئەوە لەسەرمانە لێرەدا ئاماژە بەوە بدەین کە وشەی (ڕۆمانی) وەکو یەك دەلالەت لە زمانی یۆنانی‌و لاتینی دەکات, لەبەرئەوە هەرکاتێك (زەرکەشی) یان (سیوطی) لە لیستەکانیاندا بنچینەی زاراوەیەکی (ڕۆمانییان) ناوبرد پێویستە لەسەرمان بەناو ئەو دوو زمانەدا بگەڕێین‌و لێکۆڵینەوە بکەین, وە بە شوێنکەوتنی ئەم میتۆدە دەگەینە ئەم دەرەنجامانەی خوارەوە:

أ- قسط, قسطاس:

بڕوامان وایە کە ئەم دوو وشەیە هەردووکیان لە حەقیقەتدا یەك زاراوەن, بنچینەکەیان یۆنانی نییەو لەوشەی (dikastes–قازی)یەوە دانەتاشراوە کە (فولر)وا پێشنیاری کردووە, وەنە لە وشەی extesی یۆنانیشەوە وەرگیراوە, ئەو ووشەیە وەك (مینجانا) پێشنیاری کردووە پێوانەیەکی ڕۆمانییەو ڕاڤەکارانی قورئانیش جەختیان لەسەر ئەوە کردووەو سەلماندوویانە, وە لە دوو لیستەکەی (زەرکەشی)و (سیوطی)دا هاتووە کە (قسط یان قسطاس) بەزمانی ڕۆمانی واتە دادپەروەری, جا نەوشەی dikastes (قازی)و نە وشەی xestes (پێوانە) ئەو مانایە دەگەیەنێت.

لەبەرئەوە پێمان وایە کە بنەڕەتی ئەم دوو زاراوە قورئانیە دەگەڕێتەوە بۆ وشەی لاتینی (justus) یان (justitia) واتە (دادپەروەر – دادپەروەری) لەبەرئەوە ئەم وشەیە بەتەواوی لەگەڵ دوو زاراوە قورئانییەکەدا دەگونجێت, بەتایبەتیش ئەگەر پیتی (ق) بە (أ) دەربرِین وەك ئەوەی لەشێوەزارە گشتییەکەدا –عامی–یان ڕەشۆکیەکەدا لەسەری دەڕۆن, شێوەی دوو وشەکەش (قسط, قسطاس) گەڕاوەتەوە بۆ وازهێنان یان لابردنی جوڵەی کۆتایی لەوشە لاتینییەکەدا (US), ئەوەش دیاردەیەکی ڕاهاتوو پەیرەوکراوە لە بەعەرەبیکردنی زاراوە یۆنانیو لاتینییەکاندا بۆ نمونە (وشەی سقراط Socrates هەندێك جار بەو جوڵەیەوە دەکرێتە عەرەبی (سقراطیس) هەندێك جاری تریش بەبێ جوڵەی کۆتاییو دەبێتە (سقراط).

2ـ برج –قەڵا– تاوەر:

ئەم وشەیە کە جیفریو ئەوانی تریش خۆیانیان لێگێل کردووە دەگەڕێتەوە سەر وشەی لاتینی (burgus) واتە (قەڵای پارێزەر) کە نووسەری سەربازی (فیجیتیوس ریناتوس) لەماوەی ژیانیدا لەنێوان سەدەی چوارەمو پێنجەمی زاینیدا بەکاریهێناوە ئەوەش لەکتێبەکەیدا بەناونیشانی Epitoma rai militaria 17. 10.

3ـ الكهف – ئەشکەوت:

ئەم زاراوەیە کە لیستەکان ئاماژەی بۆ دەکەن جگە لە داتاشراوی وشەی لاتینی (Gavea) کە واتای (ناوەوە یان بۆشایی) (جوف) دەگەیەنێت چی تر نییە, Pline 1 Par .livv xl ,Naturalis Historia ,Ancien3.

4ـ قنطار:

ئەوەش وشەیەکی لاتینییە بنچینەکەی (Genium Librae)ە واتە (مکیال) کە دەکاتە 100 ڕەتڵ –رطل– (یەکسانە بە (45.300کگم) (چونکە هەریەك ڕەتل= 453گم) –وەرگێڕ–, پاشان وشەکە گۆڕاوە بۆ وشەی quintulium یان quintal وە لەوێشەوە وشەی فەڕەنسی quintal وەرگیراوە.

5ـ صراط:

ئەویش وشەیەکی لاتینییە (Strata) بەواتای ڕێگەی پەرستگە یان ڕێگایەکی گەورە.

(اتروبیوس (کۆتایی سەدەی چوار): کورتەی مێژووی ڕۆمانی, چاپی: ریل ساڵی 1887ز, لاپەڕە–9, 15, سان أوجستین الخطیب, چاپی– مایو 9, 21).

دەمێنێتەوە ئەوسێ وشەیەی کە (زەرکەشی) لە دوو لیستەکەیدا ڕوونی کردوونەتەوە کە هەرسێکیان وشەی (ڕۆمین)و (سیوطي)یش لە (شهیدالله)وە هەروا دەڵێت, ئەوسێ وشەیەش بریتین لە (رقیم, طفقا, سری) بۆ زانین (شهید الله, ناوێکە (عەزیزی ابن عبدالملك)ی پێناسراوەو خاوەنی کتێبی (البرهان ڤ مشکلات القرآن)و فەقیهو وتاربێژ بووە ساڵی (449کۆچی= 1100 زانینی) لەبەغدا کۆچی دوایی کردووە هیچ کەسێکی تریش بەم نازناو یان ناوە هەڵبژاردەیەوە نییە.

سەبارەت بەوشەکانیش, ئێمە ناتوانین بنچینەیەکی یۆنانی یان لاتینیان بۆ وەدەست بخەین, وە ئەوەی پەیوەستە بە وشەی (رقیم)ەوە پێویستە ئاماژە بەوە بدەین کە بە چەند شێوەیەکی جیاجیا وەرگێردراوە, لەلای موسڵمانە ڕاڤەکارەکانی قورئان وتراوە (رقیم ناوی سەگە (الکهف ئایەتی 9), وەوتراویشە ناوی شوێنێکە لەلایەکی نزیك لە ئەشکەوتەکەوە, بەڵام لەلای ڕۆژهەڵاتناسەکان (توری Torrey) باوەڕی وایە کە ئەم وشەیە گۆڕینی وشەی (دیکلوس Declus) ئیمبراتۆری بێزەنتییە (249ز– 251ز) کەلەماوەی فەرمانڕەوایی ئەودا بووئەوحەوت لاوە مەسیحییە پەنایان برد بۆ ئەشکەوتێکی نزیك لە (ئیفاز Ephese)ەوە وە (هورفیتز) لە (دراسات قرآنیة– لاپەڕە 95)دا گریمانەی ئەوە دەکات کە (رقیم) نووسینێکە بەسەر دیواری ئەشکەوتەکەوە نووسراوە ، ئەوەش گریمانەیەکی هەڵەیە.

هەروەك گریمانەکەی (تووری) کە لە (دراسات شرقیة مقدمة الی إ–ج براون– 1922 لاپەڕە (457, 459)دا دەیکات.

بەڵام سەبارەت بە کرداری (طفق) کەناوی دوانی (طفقا)ی لێتاشراوە ئەویش لە فەرهەنگە عەرەبییەکاندا لە کردارەکانی (المقاربە)یە (نزیك خستنەوە) ئیتر چی پاڵی بە (شهیداللە)وە ناوە بەشوێن بنەڕەتێکی یۆنانیدا بۆی بگەڕێت؟

هەمان شت دەربارەی وشەی سێیەمیش (سری) دەڵێین, من وا تێگەیشتبووم کە وشەی (سری) سیفەتێکە بەواتای (جوان– ڕازاوە– پەسەند) دێت, بەڵام لە فەرهەنگە عەرەبییەکاندا واتایەکی دیکەی هەیە کە بریتییە لە (جۆگە ئاوێك بەمەبەستی ئاودانی دارخورما بەژێریدا دەڕوات) (فەرهەنگی فەڕەنسی– عەرەبی, کازیر مسکی).

ئەوەش ئەو مانایەیە کە دوو لیستەکەی (زەرکەشی)و (سیوطي) دەیبەخشێت کەوای لە (شهید الله) کردووە باوەڕی وابێت بنچینەی ئەو وشەیە (یۆنانی یان لاتینییە), وەلە (لسان العرب)ی (ابن منظور)یشدا وای دەخوێنینەوە کە (سری) واتە (ڕووبار) هەروەها (ثعلب)یش دەڵێت "جۆگەیەکە یان لێشاوێکە کە دارخورما ئاودەدات, کۆکەشیی (جمع) بریتییە لە (أسریەو سریان) (سیبویە) باسی کردووە, هەروەها (ابن عباس) دەڵێت (سری) واتە جۆگە, وە ئەوەش ڕای زمانەوانەکانە.

وە (أبو عبیدە)یش درێژەی شیعرێکی (لبید)ی شاعیری هێناوەتەوە کە تیایدا بەباخی خورمایەکدا هەڵدەدات کە لەدەورووبەری ڕووبارێکدا چێنراوە.

سحق یمتعها الصفا وسریە

عم نواعم بینهن کروم

وە ئەم دێڕە شیعرە دەیسەلمێنێت کە وشەی(سری) بەر لە ئیسلام هاتووەتە ناو زمانی عەرەبییەوەو مانای جۆگە ئاوێکە لەژێر دارخورمایەکەوە دەڕواتو ئاوی دەدات.

بەبێ ئەنجام گەڕاین بەدوای وشەیەکی ئیغریقی یان لاتینیدا کەلە نووسینیدا لەوشەی (سری) بچێتو واتای جۆگەی ئاو ببەخشێت, دواجار لە زمانی یۆنانیدا (ئیغریقی) ئەم وشانەمان دۆزییەوە (Solen, Hudra gogos, Ochetos) وە لەزمانی لاتینیشدا ئەم وشانە (Salonsfossa, Canalis, Canalicus, Inclia, Elices, Euripus, Rirus) وە هیچ کام لەم وشە یۆنانیو لاتینیانە لەگەڵ وشەی عەرەبی (سری)دا لێکچوونێك لەنێوانیاندا نییە, لەوانەیە وشەی (Solen)ی یۆنانیو (Sculus)ی لاتینی لەنێوان ئەو وشانەدا نزیکتربووبن, بەڵام بەهەرحاڵ هەردوو وشەکە دوورن لەوشە عەرەبییەکەوە بەلای کەمەوە لەگریمانەی گۆڕینو لادانیشیدا لەیەك ناچن.

أ- ریلاند (Reland)و بەرگریکردن لە ئیسلام:

لە پەراوێزی لێکۆڵینەوەکەم دەربارەی ئایین لەلای (کانت) (بەرگی چوارەم لە قسەکردنم لەسەر فەلسەفەکەی) لەوکاتەدا خۆمم بینییەوە بەرەولای ئەو سەرچاوانە دەبرێم کە ئەو فەیلەسووفە فەلسەفەکەی لێ پێکهێناونو لەوەدا کە تایبەتە بە ئیسلامەوەو ئەوەی کە زۆرێك لەلایەنەکانی کتێبەکانی بۆ تەرخان کرووە[1] , وەلەو پێناوەدا گرنگیم دا بەکارەکانی (ئادریان ریلاند), کە لە ساڵی (1676ز, لەهۆڵەندا لەدایکبووە, لە ساڵی 1718ز, لە (أوترخت) کۆچی دواییکردووە). بەتایبەتی یەکێك لەکارەکانی بەناونیشانی (الديانه المحمديه) چاپی یەکەم– ساڵی 1705ز, وە چاپی دووەمی ساڵێ 1718ز)[2].

ئەوەی لەو کتێبەدا سەرنجی ڕاکێشام میانرەوی‌و قووڵی‌و بیرورا زۆر بابەتییەکانی بوو بەرامبەر بە ئیسلام‌و موحەممەد (ﷺ) پاش ئەو لێشاوە زۆر گەورەیە کە لەلایەن ئەو هێرشبەرانەوە لەسەدەی سیانزەهەمەوە بگرە پێشتریش وە تاوەکو کۆتایی سەدەی حەڤدە بەشوێن یەکدا هاتوون[3] , "هەروەها (آدریان ریلاند) لە نامەیەکیدا کە بۆ (بیرا ریلاند)ی برای کە لە(أمستردام پارێزەر بووە) نووسیویەتی‌و پێشکەشی کردووە سەر سوڕمانی خۆی دەربڕیوە لەوەی ئەگەر ئیسلام بەو شێوەیە بووە کە ئەو هێرشبەرە مەسیحییە ئەورپییانە باسی دەکەن ئەوا عەقڵ نایبڕێت ئەو هەموو خەڵکە زۆرە بتوانن باوەش بکەن بە ئاینێکی بێ سوودو بی ئەنجامدا, وە ناشکرێت واتێ بگەین کە شوێنکەوتوانی موحەممەد هەموویان گێلو نەزان بن, هەروەها ئەوە ڕێگەی گومانکردنمان پێنادات کاتێك بگەڕێینەوە بۆ ئاسەوارو نووسراوەکانی ئەم ئوممەتەی کە چەندین کەسانی بلیمەتو گەورەی لێ دەرچووەو جیهان تا ئێستا هاوشێوەی ئەوانەی لەناو هیچ گەلێکی دیکەدا نەبینیوە, ئەگەرنەڵێین عەرەب ئەوانەی کەلە سایەی چاکەو گەورەیی ئەم ئاینەدا لەدایکبوون پەرچەمی زانستو هونەرە جوانەکانیان بۆ چەند سەدەیەك تەنها لە دەستی ئەواندا بووە, بەتایبەتیش سەدەی دەیەم لەکاتێکدا مەسیحییەکان هەموو شتێکیان واز لێهێنا تاوەکو لە ڕۆژئاواکەی ئێمەدا وشك ببێتو بمرێتو گێل ببێت".

لەبەرئەوە گرنگیداوە بە دیراسەکردنی ئاینی ئیسلام لەسەرچاوە عەرەبییەکاندا کە ئەوەش ڕێگەی بۆخۆشکرد تاوەکو لەڕێگەیەکو شێوازێکی تەواو جیاواز لەو وێنە جێگیرو چەسپاوەی لەڕۆژئاوادا هەیە لە ئیسلام تێبگات و لەم بارەیەشەوە دەڵێت: "پاش دیراسە کردنێکی عەقڵانی بۆ ئاینی موحەممەدی پێویستە بەتەواوی دڵنیایی‌و بێگومانییەوە دان بەوەدا بنێم کەمن ڕوویەکی تەواو جیاوازی موحەممەدم بینی لەوەی کەدەربارەی وتویانە, ئەمەش ئەو خواستەی لەلادروستکردم تا بەو ڕەنگانەوە کە لەگەڵیدا شیاوو لەبارەن بەجیهانی بناسێنم ".

کاتێك لەو عەقڵیەتو بیرکردنەوەیەدا نوقم بوو ڕیلاند گەیشتە چەند دەرەنجامو حوکمێك دەربارەی ئیسلام کە هەزارجار وردترو ڕاستترن لەوەی نووسەرە هاوچەرخەکان وتوویانە, وە ئەگەر ئەوانە بیانویستایە کارێکی باش ئەنجامبدەن ئەوا دەگەڕانەوە بۆ حوکمەکانی ڕیلاند بەرلەوەی زۆرێك لە قسەکانیان بکەن.

ریلاند کاسۆلیکی بوو بەڵام لەو ڕوانگەیەوە لە ئیسلامی نەکۆڵیوەتەوە کە (بابەوییەکان) پرۆتستانەکان و مسوڵمانەکان بەیەکتری بەراورد دەکەن, بەڵکو وەك خۆی دەڵێت پاڵنەری کارەکەی ئەمە بووە "گەڕان بەدوای حەقیقەتدا لەهەرکوێدا

---

[1] ئیمانوئیل کانت ( الاعمال الكاملة).

[2] ئادریان ریلاند _الدين المحمدية, کتێبێکە لەدوو بەشدا, بەشی یەکەمی (بنچینەکان, بنەماکانی ئاینی محمدی بۆ یاسای عەرەبی چاپکراوو شیعری لاتینی چەند سەرنجو تێبینییەکی ڕوونکەرەوەی تیادا خستتووەتەڕوو, لەبەشی دووەمیشدا گفتوگۆی ئەو درۆو بۆختانانە دەکات کە بۆ موحەممەد (ﷺ) هەڵبەستراون.

[3] بڕوانە ئەو خستنەڕووە زۆر کورتو زۆر بەسوودە (نورمان دانیال) بەناونیشانی (الاسلام والغرب) ایدنبرگ, 1958ز.

دەستبکەوێت, داخستنی دەرگا بەڕووی نرۆکاندا لە هەموو دەنگێکەوە لەهەموو کاتێکدا کارێکە شایەنی ستایشکردنە, ئەگەر هاتوو ئاینێکی بڵاویووەوەی لەڕێ لانەدراو کەهەوری غەییەتو دلڕەقی قورسی نەکردبێت ئاشکرا بکەین و ئاینێك بەشێوە ڕاستەقینەکەی وەك ئەوەی کە لە پەرستگاو قوتابخانە موحەممەدییەکاندا دەوترێتەوە بۆ خەڵکی دەربکەوێت ئیتر تەنها ئا لەو دەرچەیەوە دەتوانین بەسەرکەوتوویی هێرشی بۆ بیەین, وە ئەگەر نەتوانین تێکی بشکێنین, ئەوا بەلای کەمەوە دەتوانین بوونی لە فیکرماندا تێك بشکێنین".

هەروەها ئەو بەدوای ئەو بۆچوونە لێکچواندنانەی نێوان (لۆسەرییەکان)[1] و (موحەممەدییەکاندا) چووەو لەم وانەیەی خوارەوەدا کورتی کردووەتەوە:

1ـ موحەممەد شانازی بەوە دەکات کە ئینجیلی ڕاستەقینە بە تەنها لەلای ئەوە, ئەوەش مانای وایە جەختکردن لەسەر دەستگرتن بە (العهد القديمو العهد الجديد)یشداو دوورخستنەوەی کەسانی دیکەی جگە لەخۆی, هەمان شت لای (مارتن لوثر)ە کە زاتی کرد بلێت ئەڵمانیا پێش ئەو ئینجیلی نەبووە.

2ـ ئیسلام دابەش دەبێت بۆ (70) کۆمەڵ, بەهەمان شێوە ئینجیلییەکانیش. (ئینجیلیەکان ناوێکە پرۆتستانتەکان بەسەر خۆیانیاندا بڕیوە).

3ـ موحەممەد فەرمانی داوە حوکم بەسەر هیچ کارێکدا نەدرێت تەنها بەپێودانگی کتێبەکانی خۆی نەبێت, بەهەمان شێوە بێ سەرپەرشتەکانیش (مەبەستیان شوێنکەوتوانی لوسەر)ە.

4ـ موحەممەد (10) ڕۆژی لەڕۆژوو کەمکردەوەو کردوویەتی بە مانگێك کە ڕەمەزانە, بەلام (لوثر) تەنها ڕۆژووی نەگۆڕی بەلکو هەڵیوەشاندەوەو هەروەها هەموو جۆرەکانی ڕۆژووشی هەڵوەشاندەوە.

5ـ موحەممەد ڕۆژی یەکشەممەی گۆڕی بەڕۆژی هەینی, بەلام (لۆسەرییەکان) لەلای خۆیانەوە هەموو جۆرە ئاهەنگێکی تایبەت بە جەژنەکانیان هەڵوەشاندەوە.

7ـ موحەممەد گاڵتەی بەپەرستشی هەموو قەشەکان کردووە, هەروەها شوێنکەوتوانی (لۆسەر)یش.

8ـ موحەممەد ڕێگەی بە رووتێکردن نەداوە, لەکاتێکدا (کالڤان) بەکارێکی ناپێویستی داناوە.

9ـ موحەممەدییەکان هەرچەند بیانەوێت ژنێکی زۆر بۆخۆیان هەڵدەبژێرنو بەبێ مەرجیش, ئەم ڕەفتارو هەڵسوکەوتە (بوسر)و (اولمدارب) یش دانی پێدا دەنێن.

10ـ مسوڵمانەکان دان نانێن بەگرنگی کردەوە چاکەکاندا بۆ جگە لەوکەسانەی ئەنجامیانداوە (مەبەست لەوەیە کردەوەی چاکە تەنها سود بەو کەسە خۆی دەگەیەنێت کە کردەوەکەی ئەنجامداوە) لۆسەرییەکانیش جەخت دەکەن کە "باشترین کردەوەکانمان بریتییە لە تاوانەکان".

11ـ لەکۆتاییدا (موحەممەد) ئازادی( ویست –ئیرادە–) ڕەد دەکاتەوە, هەروەها لۆسەریەکانیش دانی پێدادەنێنو ئەو هەڵوێستە پەسەند دەکەن.

سودبەخشە ئەگەر لەم هەوڵی بەراوردکردنەی نێوان ئیسلامو پرۆتستانتیەدا چەند نوسەرێکی مسوڵمانی هاوچەرخو نوێخواز وە یاد بهێنینەوە[2], ئەوانەی وا بیریان کردووەتەوە کە ئاشکراکردنێکی مەزنیان ئەنجامداوە کاتێك ئاماژەیان بۆ ڕووە لێکچووەکانی نێوان ئیسلام و پرۆتستانییەت کردووە! ئەو بەراوردەش کە (دوم مارتینی ڤیڤالدۆ) Dom Martini Vivaldo پێی هەستا (ریلاند) گەواهی تا ڕادەیەك دروستی لەسەرداوە ئەگەر ئیسلامو پرۆتستانت بەشێوەیەکی گشتی

---

[1] "لۆسەری– اللوثريين" بەو پرۆتستانت مەزهەبانە دەوترێت کەشوێنکەوتەی (مارتن لوسە ر)ن.

[2] بۆ نموونە شێخ موحەممەد عەبدە لە (رسالە التوحيد)و شێخ ئەمین الخولی لە (رسالة المؤتمرالأديان المنعقد في مدينة لين 1934ز.

وەربگرین واتە بیروڕا تاکییەکانی ناو هەریەك لە ئاینیەکان جیا نەکەینەوە, بەڵام بەهەرحاڵ بەراوردەکە چەند سەرنجو تێبینییەك دەوروژێنێت کە ئەمانەن:

أ- بە پێی زانیاریمان هیچ مێژوونووسێك تایەفە (لۆسەر)یە پرۆتستانەکانی دابەش نەکردووە بە 70 بەشەوە, بێگومان (ڤیڤاڵدو) دەتوانێت چۆنی بوێت بیانژمێرێت, بەڵام ژمارە (70) بە پێی زانیاری من ناکرێت ژمارە بێت (لەبەر هەمەجۆری کەنیسە پرۆتستانتیەکان) وەك لە فەرمودە بەناوبانگەکەی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) باسکراوە "تفترق أمتي الى سبعين فرقه (وتراویشە 71, 72, 73) كلها في النار الا اللتي عليها أنا وأصحابي" واتە: ئوممەتەکەم دابەش دەبێت بە 70 یان (71, 72, 73) کۆمەڵو گروپەوە هەموویان لە ئاگردان جگە ئەوەیان نەبێت کەمنو هاوەڵانم پەیڕەوەی لێدەکەینو لەسەری دەڕۆین.

ب - ئەوەی پەیوەندی بە خاڵی (9)وە هەیە, ئێمە دەزانین کە (لۆثر) خۆی بیانووی فرەژنی دێنێتەوەو ڕای لەمەسەلەکەی (کارلستات 1524) وە بەتایبەتی لە مەسەلەکانی (هنری شەشەمو لاندگراف)دا تێگەیشتنی خۆی سەبارەت بە فرەژنی ڕووندەکاتەوە[1], وە ئەو پێداگری لەسەرئەوە دەکات کە فرەژنی زۆرجار لە (العهد القديم)دا باسکراوە کە کارێکی شەرعیو ڕێ پێدراوە هەروەها (العهد الجديد)یش بەڕاشکاوانە ئیدانەی ئەوکارەی نەکردووە, بەڵام (کالڤن) ئیدانەی فرەژنی کردووەو حاڵەتی (بطارقة)کانی لە (العهد القديم)دا بە ئیمتیازێك لەلایەن خوای گەورەوە لێکداوەتەوە ئەوەش لەبەر شەڕانی بونییان, بەڵام بیروڕاکانی (بوسر) دەربارەی ژنهێنان بەشێوەیەکی گشتی شیاوی ئەوەن لەنزیکەوە دیراسە بکرێن.

ج - بەڵام دەربارەی خاڵی کۆتایی کە پەیوەستە بە ئازادی (ویست، ئیرادە، خواست)ەوە ئەوەش بەوردی بەشێوەیەکی گشتی لە مەزهەبی (ئەشعەری)یەکانو (ئەهلی سوننە) دا لەبابەتی ئازادی ئیرادەدا سەرهەڵدەدات. لێرەدا (ریلاند) ئەوە هەڵناوەشێنێتەوە کە (ڤیڤاڵدو) خستوویەتییە پێش چاو بەڵام بەبوونی لایەنی لێکچوونی دیکە لەنێوان (موحەممەد)ییەکانو (کاثولیك)ەکاندا وەڵامی دەداتەوە, ئەوەش ئەوەیە کە لە وتەکانی (ڤیڤاڵدو) خۆیەوە کورتی کردووەتەوە کاتێك چەند خاڵێکی بەیەکگەیشتنی نێوان ئیسلامو کاسۆلیکدا دەخاتەڕوو, وە دەڵێت: بەپێی ئەوەی لە (بوردروك نید)ەوە هاتووە "زۆر شت هەیە موحەممەدییەکانو ئێمەی مەسیحی کاسۆلیك تیایدا لەیەك نزیك دەبینەوە", ئەمەش بۆچوونەکانی (ڤیڤاڵدۆ)یە دەربارەی لێك نزیکبوونی ئیسلامو مەسیحییەت:

ئەوان (واتە مسوڵمانەکان) خودای حەق دەپەرستنو بتپەرست نینو وە ئەگەرچی مەسیح بەکوڕی ڕاستەقینەی خوا نازانن بەڵام بەهەرحاڵ ڕێزی لێدەگرنو بە پێغەمبەرێکی مەزنو دوایین پێغەمبەری بەنی ئیسرائیل لەقەڵەمی دەدەنو دان بەوەدا دەنێن کە ئەولەروحی خواو لە کچێکی خاوێنو داوێن پاك (مەریەم) بەبێ دەستێوەردانی هیچ پیاوێك لەدایکبووەو وە لە خواوە توانای زۆری وەرگرتووە بۆ ئەنجامدانی کارە موعجیزەکانی وەك چاککردنەوەی هەموو نەخۆشییەکو هەموو دەردوبەڵایەکو دەرکردنی شەیتانو زیندووکردنەوەی مردوان, بەشێوەیەکی گشتی هەموو ئەوەی کە لە ئینجیلیەکانماندا هاتووە قبوڵی دەکەنو پێی ڕازین, لەسەرو ئەوانەشەوە ئەوان باوەڕیان وایە کە خودی عیسا کە بە (یەسوع) ناوی دەبەن هەموو نهێنیو شارراوەکانی ناو دڵی زانیوەو دەیانزانێت هەروەك چۆن لەهەموو کتێبەکانو حوکمەکانی موساش دەزانێتو شارەزایە بەهەموو ڕەوشێکو هەموو ئەوەی کە مرۆڤەکان لەماڵەکانی خۆیاندا دەیکەنو هەموو ئەو شتانەی

---

[1] بروانە ئەم بابەتانە :

أـ ستراف "مارتن لوثر" في الزواج.

ج - كريستياني: لوثر واللوثرية, الدراسة السابقة, ص207, 255, باريس 1909.

ب - زالفيلد: لوثر وتعاليمه عن الزواج.

لەگەنجینەکانیاندا کۆی دەکەنەوە, هەروەها باوەڕیان وایە ئەو ڕقی لەسەروەتو سامان بووەو سەرزەنشتی هەموو جۆرە چاوچنۆکییەکی کردووەو ڕقیشی لەهەموو جۆرێك لەجۆرەکانی گوناهکردنی ئاشکرابووە.

هەروەها موحەممەدییەکان لە مامۆستاکەی خۆیانەوە زانیویانە کە مەریەمی خاوێنو داوێن پاك (جوبرەئیل) سڵاوی لێکردووەو پێی وتووە (ئەی مەریەم بەڕاستی خوا تۆی هەڵبژاردووە بەسەرهەموو ژنان و دایکی هەموو منداڵو پیاواندا, وە تۆی لە شوێنێکو پلەو پایەیەکی ڕێزدارداو لەبەهەشتەکەی خۆیدا لەنێوان پیاوانو فریشتە نزیکەکانی خۆیەوە دایناوی, هەروەها ئەوان باوەڕیان بەوە هەیە هیچ کەسێك نییە شەیتان زەفەری پێنەباتو فریوی نەدات جگە لە مەسیحو دایکی نەبێت, ئای کە شایەتیدانێکی بەنرخە, بەڕاستی مایەی سەرسوڕمانە ئەوەی تایبەتە بەو تێگەیشتنە پوختەوە بۆ پاکترینو بەڕێزترین کەس کەمەریەمی کچو داوێنپاکە.

لەسەروو ئەمانەشەوە ئەوان (مەزموور)ەکانی (داود) بەتەواوی وەکو ئێمەی مەسیحی دەیانخوێنێتەوە وە کاتێك سەردانی گۆڕی پێغەمبەرەکەیان دەکەن وای دەبینن هێشتا وەك پێویست دڵسۆزی خۆیانیان نەنواندووە ئەگەر نەڕۆنو سڵاو لەگۆڕەکەی مەریەمیش نەکەن.

لەکۆتاییشدا ئەگەر جولەکەیەك بیەوێت بچێتە ناو ئاینەکەیانەوە پێش هەموو شتێك لەسەری پێویست دەکەن کە باوەڕ بەمەسیح بهێنێتو لەسەر ئەوەش لێی دەپرسن ئایا باوەڕت هەیە کە عیسای مەسیح لە کچێك بەفوو یان بەڕۆحی خوا لەدایکبووەو ئەو دوایین پێغەمبەری بەنی ئیسرائیلە, جا ئەگەر پۆزەتیڤانەو بەبەڵێ وەڵامی دایەوە ئەوا دەبێتە (موحەمەدی).

(ڕیلاند) لەسەر ئەم لێك نزیکبوونە بەشێوازێکی گاڵتەئامێز بە (ڤیڤالدۆ) دەڵێت: (بەپێی ئەم شێوازە جوانەی تۆبێت لەئاکامدا ئێمە هەموومان موحەممەدیین).

وە دەبینین کە (ڤیڤالدۆ) ملی ئایەتە قورئانییەکان بادەداتو خواریان دەکاتەوە تاوەکو بگات بە سەلماندنی ئەو لێك نزیکییە, جابا لەنزیکەوە ئەوە بپشکنین:

أ- کاتێك ئایەتی 42ی سورەتی (آل عمران) پوخت دەکات (وَإِذْ قَالَتِ الْمَلاَئِكَةُ يَا مَرْيَمُ إِنَّ اللّهَ اصْطَفَاكِ وَطَهَّرَكِ وَاصْطَفَاكِ عَلَى نِسَاء الْعَالَمِينَ) ئەنجامەکەی ئەوەیە کە قورئان چەمکی پاکییەتی مەریەم دەچەسپێنێت.

ب - کاتێك دەڵێت موحەممەدییەکان (مەزموور)ەکانی (داوود) دەڵێنەوە وەك مەسیحییەکان ئەوە پڕاوپڕی ساختەیەو لەڕاستیەوە دوورە چونکە موحەممەدییەکان نە ئەم (مەزموورانە) دەڵێنەوە نەدەشیانزانن تەنانەت لەلای مەسیحییەکانیش ناوترێنەوە, قورئانیش دیاری نەکردووە جگە لەناوی (زەبور) نەبێت کە ئەویش کتێبێکی پیرۆەو بۆ سەر (داود) دابەزیوە وەك چۆن تەورات بۆ موساو ئینجیلیش بۆ سەر عیسا دابەزێنراون.

ج - (ڤیڤالدۆ) درۆگەلێك دروستدەکات کاتێك وای بۆ دەچێت کە مسوڵمانەکان کاتێك سەردانی گۆڕی پێغەمبەرەکەیان دەکەن وا دەزانن بەتەواوەتی دڵسۆزی خۆیانیان نەنواندووە وەکو پێویست ئەگەر سەردانی گۆڕی (مەریەم) نەکەن, چونکە موسڵمانەکان هەرلەسەرەتاوە نازانن گۆڕی مەریەم کەوتووەتە کوێوە, ڕاستییەکەشی گۆڕی مەریەم لەمەدینەوە نزیك نیە کە گۆڕی پێغەمبەری تیایە (ﷺ), کەواتە ڤیڤالدۆ ئەم بەڵگە بێ کەڵکەی لەکوێوە هێنا؟

د- ئەوەی دەیڵێت تایبەت بە مسوڵمانبوونی جولەکەو هاتنە ناو ئیسلامو پێویست بوونی ئەوەی کەدەبێت دان بەوەدا بنێت عیسا لە کچێك بەفووی خوا یان ڕۆحی خوا لەدایکبووە, ئەوە ئاماژەدانێکی سادەیەو سەرچاوەکەی ئەوەیە کە هەموو مسوڵمانێك پێویستە بڕوای بەهەموو ئەو شتانە هەبێت کە لە قورئاندا هاتوون کەواتە لەکاتی هاتنە ناو ئیسلامدا پێویستە لەسەر هەموو یەهودییەك کەدەیەوێت ببێتە مسوڵمان ئیمان بەهەموو ئەو شتانە بێنێت کە لە قورئاندا هاتوونو بە حەقیان

بزانێت, بەڵام بەشێوەیەکی گشتی نەك بە جیاوازی خستنە نێوان شتێك‌و شتێکی دیکە واتە فەزڵی شتێك بەسەرشتێکی تردا بدرێت وەك لە قورئاندا هاتووە.

هـ ـ بەڵام لەمەسەلەکانی دیکەدا ئەوەی تایبەتە بە بابەتی مەسیحەوە (عیسا) تا ڕادەیەکی زۆر (ڤیڤالدۆ) لەویارەیەوە لە ڕاستییەوە نزیکە.

پێویست بوو پاش ئەو لێك نزیکبوونەوەیەی نێوان موحەممەدییەکان‌و کاسۆلیکییەکان کە ڤیڤالدۆ پێی هەستاو هیچ لەمپەرێکی نەبینی لەوەدا کەهەریەکەیان کتێبی پیرۆزی ئەوی تریان بخوێنێتەوە, بەڵام بەپێچەوانەوە لەهەمان کتێبی (قنديل من الذهب في كنيسة الرب يسوع المسيح)دا جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە کتێبەکەی موحەممەد نابێت بخوێنرێتەوە بە پێچەوانەوە پێویستە سوکایەتی‌و گاڵتەی پێبکرێت‌و فڕێ بدرێتەوە ناو ئاگرەوە بۆ ئەوەی لەهیچ شوێنێکدا نەیبینینەوە (ریلاند ئاماژەی پێداوە) بەڵام (ریلاند) ڕایەکی تری هەیە بەتەواوی پێچەوانەی ئەم ڕایەیە, لەبەرئەوەدا کە ئەو ڕێزی قورئان‌و ئیسلام دەگرێت, چونکە ئەویش لەم خاڵەدا لە (ڤیڤالدۆ) کەمتر نییە لەتوندوتیژیدا بەرامبەر بە ئیسلام, بەڵام پێشوازی لەخوێندنەوەی قورئان دەکات تاوەکو بەشێوەیەکی باش لە ئاینی ئیسلام بزانێت‌و بتوانێت پاش ئەوە بە سەرکەوتنێکی گەورەوە هێرشی بکاتە سەرو لەهەموو لایەنەکاندا بەسەریدا زاڵ ببێت, وەبە پشت بەستن لەسەر کێشەکەی ئاماژە بە قسەیەکی (مەراکشی) وەرگێڕی بەناوبانگی قورئان دەکات کەلە سەرەتای پێشەکییەکەیدا جەخت لەوەدەکات کە ئاینی ئیسلام پارێزگاری کردووە لەهەموو ئەوەی زیاتر عەقڵانی ترو گونجاوترە لەناو مەسیحییەتدا وە بەهەموو ئەوەی کە لەڕوانینی ئێمەوە وا دیارە لەگەڵ یاساو سوننەتی سروشتدا گونجاوە وە ئیسلام لە عەقیدەی خۆیدا هەموو جۆرە نهێنی‌و پەنهانییەکانی ناو ئینجیلی دوورخستووەتەوە کە بەلای ئێمە وادەردەکەوێت کە نەشیاوو نەزانراون هەروەها لەڕەوشتەکانیشدا هەموو پرەنسیبیە توندوەرگیراوەکانی دوورخستۆتەوە کە جێبەجێکردنییان قورسە بەجۆرێك وای لەبتپەرستەکانی ئەمڕۆ کردووە وا هەست بکەن کەزیاتر مەیلیان بەلای وازهێنان‌و دەستبەردار بوونی بتپەرستیەکەیان بڕۆن بە سنگێکی فراوانەوە باوەش بە ئیسلام‌و شەریعەتی موحەممەدیدا بکەن زیاتر لە شەریعەتی ئینجیلی.

لەکتێبی (بحض القرآن – لێکۆڵینەوەی قورئان)دا (مەراکشی) بەوپەڕی ڕوون‌و ئاشکراییەوە جارێکی تریش دەڵێت: "هەمیشە بڕوام وابووە قورئان‌و ئینجیل کاتێك دەخرێنە بەردەست کەسانی بێباوەڕ ئەوکاتە ئەوان قورئانیان لە ئینجیل پێ باشترە, وە پێویستە گومان لەوەنەکەین کە کتێبەکەی موحەممەد ئەو فیکرانە نابەخشێتە عەقڵ کە عەقڵ تێگەیشتنیانی بەلاوە قورس‌و گران بێت بەتایبەتیش ئەگەر عەقڵێك بێکەڵك بێت‌و دوژمنی شتی پەنهان‌و نادیار بێت.

بۆ نمونە جگە لەخوایەکی تاك‌و تەنهاو داناو بەتوانا خوایەکی تر نییە, بەدیهێنەری هەموو شتەکان و هەڵسوڕێنەریانە وە پێویستە بەکڕنوش‌بردن‌و ملکەچییەوە نوێژی بۆ بکرێت, مرۆڤ پێویستە لەگەڵ هەژاران لێبوردە بێت, دروشمەکانی حەج جێبەجێبکات‌و لەشی بەڕۆژوو پاك بکاتەوە, پارێزگاری لە دادپەروەری‌و میانڕەوی‌و دڵسافی‌و بەزەیی بکات, هەروەها هەموو شتە باشە ئاسانەکانی دیکەش, وە نابێت ئازاری مرۆڤ بدرێت, بەڵکو پێویستە هەرکەسێك بێت لەدزی‌و کوشتن‌و زیناو هەر تاوانێکی تر بپارێزرێت, وە پێویستە هەموو ئەوەی لەدنیادا هەیە بیبوغزێنێت بەو پێیەی ئەو ڕێبوارەو جێگیر نییە, وە تەنها دەست بەکردەوە چاکەکانەوە بگرێت کە پاداشتیان بزر نابێت و لەکۆتاییدا بۆمان دەمێنێتەوە ئەو ڕۆژەی تیایدا دەگەڕێینەوە بۆلای خودا تاوەکو پاداشتی ئەوەی کە کردوومانە وەری بگرین, وە کەسە چاکەکان لە ئاسماندا خۆشگوزەرانی بەردەوامیان دەست دەکەوێت ئەوەی ئارەزووی دەکەن بۆیان هەیەو خراپەکارانیش لەدۆزەخدا سزایەکی بێ کۆتایی دەچێژن.

هەموو ئەم پرەنسیپانەو زۆرێکی تریش لە قورئاندا بەشێوەیەکی زانراوو ڕونترلە پرەنسیپەکانی ئینجیل بلاوبوونەتەوەو هەن, لەلایەکی تریشەوە ئەگەر بتپەرستێك کە خواوەندی حەق و تاکو تەنها ئەوەی ئەو لەبارەیەوە قسە دەکات یەکێکەو لەهەمانکاتیشدا سیانیشە, خودا لە پیاوێکدا جێگیربووە کە هەژارەو ناخۆشی زۆری چێشتووەو لەخاچ دراوەو مردووەو خراوەتە گۆڕو وە ئەو بۆخۆی موعجیزە بوو, وە لەنهێنی قوربانیی پیرۆزدا نهێنی تەوبەکردن بەرەهایی پێویستەو زەواجی یەکلایەنە هەردەبێ ببێتو هاوسەرگیری پیرۆز هەڵناوەشێتەوە, وە ژیان پێویستە خاچێکی بەیەك گەیشتووی پێوەند کراوبێت, پێویستە مرۆڤ لەگەڵ دوژمنەکانیدا چاکە بنوێنێت, خۆشبەختیو کامەرانی ڕاستەقینە لەشتانێکدایە کەچاو نایانبینێتو گوێ نەیبیستوونو بەدڵی هیچ مرۆڤێکیشدا نەهاتوون, پەندو ئامۆژگاری دیکەی هاوشێوە لەبەردەست بیستنی مرۆییدا دەبێت یان ئەگەر مەحاڵیش نەبێت زۆر قورس دەبێت سەبارەت بە ژیانمانو نەزانینی سروشتیمان, جا هەر بێباوەڕێك کە ئەم قسانە دەبیستێتو بەراوردیان دەکات لەگەڵ مەزهەبی قورئاندا بڕوانە بۆ چ لایەکیان دەڕوات؟"

بەبێگومان ڕووبەلای ئیسلامدا دەکات, (ریلاند) لەسەری دەڕواتو دەڵێت: "کە مەراکیشی بەڕاشکاوی رایدەگەیەنێت کە ئەو باوەڕی وانیە ئەو ئینجیلەی بەوشێوەیە پیشانی خەڵکی بدرێت بتوانێت شوێنکەوتوان بەلای خۆیدا ڕابکێشێت, وە دەڵێت کە بێباوەڕەکان موحەممەدییان بەلاوە باشترو پەسەندترەو لەهەموو دڵێشیانەوە گەردنگیری ئاینەکەی دەبن".

ئەم بابەتی بوونەی وتەکانی (مەراکیشی)[1] شایەنی گەواهی بۆ دانن چونکە خستنەڕووەکەی بۆ عەقیدە ئیسلامییەکان ئاشکراو وردنو خاڵین لەهەر حوکمێکی پێشوەخت, وە زۆر پێویستیشە زۆر بەوردی بڕوانینە ڕاکانی (مەراکشی) ئەوەش لەبەرئەوەی هەوڵدراوە بەشێوەیەکی جیاواز بیانخەنە ڕوو چونکە ئەوانە ڕاستەوخۆ لەکارەکەی خۆیەوە نەیانخوێندوونەتەوە, بەڵام ئەوەی پێشینەکانی خۆیان باسیانکردووە هەموو هەرئەوە دەڵێنەوە لەگەڵ هەڵبەستنو دروستکردنی جۆرەها درۆو دەلەسەشدا.

ئێستا دەگەڕێینەوە بۆلای (ریلاند) کە باسی ئەوە دەکات بۆچی پێویستە سەرچاوە ئیسلامییەکان بخوێنینەوە لەپێناوی تێگەیشتنی ئاینی ئیسلامدا تەنانەت ئەگەر کاربگاتە سەر جێبەجێکردنیشی.

بۆ ئەوە لەپێشەکییە دوورو درێژەکەیدا (بەشی10) فەسڵێکی تایبەت کردووە بۆ ئاماژەدان بە گرنگی زانینو ناسینی ئیسلام ڕاستەوخۆ لە سەرچاوە نووسراوەکانیەوە, چونکە ئەو کتێبانەی ئەوروپییەکان نووسیویانن کەموکورتو ساختەنو پڕن لەدرۆ, وە نووسەرانی ئەو کتێبانە هێرشیان کردووەتەوە سەر ئاینی موحەممەدیی کەمتر لە هێرشکردنە سەر خەیاڵو ئەندێشەکانیان لەبەرئەوە ریلاند دەڵێت "چەند بەڵگەیەکی ڕوون دەخەمە ڕوو تیایاندا هەموو ئەو نوسەرانە دەبینیت کە وەك هیچیان نەکردبێت وایە, یەکێکیان دێتو هەموو بۆچوونەکانی خۆی دەخاتەگەڕ دەربارەی (میتا فیزیکیا) تاوەکو بە پێچەوانەی مسوڵمانەکانەوە ڕوونی بکاتەوە کەخودا لاشە نییە بەڵکو ڕۆحە, یەکێکی تر بەزۆر دەیسەلمێنێت کە ناکرێت شەیتانەکان دۆستی خوابن بەڵکو دوژمنی خوان, یەکێکی تر هەوڵدەدات ئەوەمان پیشان بدات دەستنوێژ شۆردنی لاشەیی هیچ ڕۆڵێکی لەخاوێنکردنەوەی ڕۆحدا نییە, وە شتگەلێکی دیکەی هاوشێوەی ئەوانە, وە کاتێك بەقینو بێزارییەوە بیردەکەنەوە ڕاستی لەو خاڵانە ون دەکەنو وای بۆدەچن ئەوشتانە زۆرێك لەهێزی مسوڵمانەکان هەڵدەوشێنێتەوە لەکاتێکدا نە موحەممەدو نەشوێنکەوتووەکانیشی هیچ زیانێکیان لەم بیروڕا بێبەڵگەو ڕەهایانە پێناگات, لێرەوە هێرش دەکەنە سەر سۆفییەکانو بە (جۆشو خرۆشێکی نەزانانە) ناوی دەبەن, لەڕاستیشدا ئەوانە تەنها هێرش دەکەنە سەر خەیاڵو دالغەکانی عەقڵیان (نووسەرە ڕاپەڕیوەکانمان لەدژی موحەممەدییەکان ورەو تواناکانیان بەزۆرێك لەگرنگی پێدانو

---

[1] لوڤیکو مراکشی: (1612, 1700ز) زانایەکی لاهوتی (خوایی, ئاینگەری) وعەرەبناسەو دیراسەی سەرچاوە عەرەبییەکانی کردووەو لە گرنگترین کارەکانی (المقدمە في دحض القرآن) وە پێشەکیەکی نووسیوە بۆ ئەو وەرگێڕانەی بۆ قورئان کردوویەتی لەژێرناوی (القرآن نص عالمي).

زیندوێتییەوە تیژ دەکەن نەك دژ بە دوژمنانێکی ڕاستەقینە, بەڵکو دژ بە دژانێکی وەهمیو خەیاڵی, بەم شێوەیەش سەرکەوتنیان مسۆگەر دەبێت کاتێك کەسێك نەبێت ململانێیان لەگەڵدا بکات, بەڵام تاوەکو ئیسلام لەسەرچاوە بنەڕەتییەکانیەوە بناسین هەردەبێت زمانی عەرەبی بزانینو بیناسین, هەروەها ناسینی زمانی عەرەبی بەسودە بۆ ڕاڤەکردنی وشە گرانەکان ئەوانەی کە تەنها یەك جار لە نووسیندا دەبینرێن وەك ئەوانەی لە کتێبی (جوب) سفر الأنبياءو کتێبەکانی دیکەدا هەن) (ریلاند مەبەستی لەوەیە کە وشە ئارامییەکانی هەندێك شوێنی ناو تەورات دەکرێت بە یارمەتی زمانی عەرەبی ڕاڤەبکرێنو لێك بدرێنەوە ئەوەش لەبەرئەوەی ئێستا زمانی ئارامیی بوونی نییە). وە ئەگەر ڕەخنە لەوەبگیرێت کە هەر وشەیەکی عەرەبی زۆرجار مانایەکی جیاواز تری هەیە لەواتای وشە بەرامبەرو هاوشێوەکەی لەزمانی ئارامییو عیبریدا, ئەوا (ریلاند) ئەوە ڕووندەکاتەوە کە لەهەندێك کاتدا وەك بنەماو یاسایەکی گشتی هەمان وشەکانی ناو زمانی عیبریو سریانیو عەرەبی واتای نزیکیان لەیەکترییەوە هەیە.

کتێبەکەی (ریلاند) لەدوو بەش پێکدێت:

أ- بەشی یەکەم، بریتییە لە چاپی دەقە عەرەبییەکەی کتێبی (العقيدة) لەگەڵ وەرگێڕانێکی لاتینیو چەند تێبینیو ڕوونکردنەوەیەك.

ب - بەشی دووەمی پێکدێت لە ڕوونکردنەوەکانی سەبارەت بە ئاینی موحەممەدییو لە (41) بڕگەدا هاتووە, تیایدا گفتوگۆ لەبارەی ئەو ڕاو بۆچوونە هەڵانەوە دەکات کە دراونەتە پاڵ موحەممەد.

أ- عەقیدە:

(ریلاند) دەربارەی ئەو دەستنووسەی لە چاپەکەیدا بەکاری هێناوە هیچمان پێ ناڵێت تەنها دەڵێت: "ئەو زۆرێك لە سیستمە ئاسانکراوەکانی لە عەقیدەی موحەممەدیدا دەستکەوتووەو هەمووشیان قورساییەکی گەورەیان هەیە, لەنێوانیشیاندا ئەوەیە کە زانا عەرەبە زۆر بەناوبانگەکان نووسیویانەو لە نێوانیاندا کەوتم بەسەر ئەم کتێبەدا کەوا بۆم دەرکەوت کورترینو چڕوپڕترین کتێبیانە وە بۆ وەرگێڕانی بۆ سەر زمانی لاتینی هیچ ڕێگرێکم لەبەردەمی خۆمدا نەبینی".

دەقە عەرەبییەکە بەمشێوەیە دەست پێدەکات: "الحمد لله الذي هدانا الى الايمان وجعلنا أهلا لدخول الجنان, وسترا بيننا وبين خلود النيران والصلاة والسلام على محمد (ﷺ) أفضل العباد الهادى الى سبيل الرشاد وعلى آله وأصحابه الأمجاد صلاة متوالية متنامية الى أبد الآباد".

واتە: (سوپاسو ستایش بۆ ئەو خودایەی ڕێگەی ئیمانی پیشانداینو وای لێکردین شایستەی بەهەشت بینو نێوان ئێمەو مانەوەی هەتا هەتایی ناو ئاگری داپۆشی, درودو سڵاو لەسەر موحەممەد (ﷺ) باشترین بەندەو ڕێنیشاندەری ڕێگای تێگەیشتن, وە بۆ سەر یارو یاوەرە بەڕێزەکانی, درودێك بەردەوامو گەشەسەندووبێت بۆ هەمیشەو هەتا هەتایە, پاشان, ئەمە ئاشکراکردنی سیفەتی ئیمانو واتاکەیەتی, بزانە کە ئیمان یەکەم پایەیە لە پایەکانی ئیسلام وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت ئیسلام لەسەر پێنج پایە بنیات نراوە), پاشان بە فەسڵێك دەربارەی حەج بەمشێوەیە دێتە کۆتایی: "بەشی حەج: ڕوکنەکانی حەج پێنج شتن: ئیحرامو نیەتو وەستان لەعەرەفەو قژتاشین یان کورتکردنەوەی لە (مینا)و سوڕانەوە بەدەوری کەعبەداو هاتوچۆ لەنێوان سەفاو مەروادا, کتێبەکە تەواو".

وتارەکە زۆر کورتە (305)دێڕە هەر دێڕێك (6) وشەی مامناوەندی تێدایە, وە دەقە عەرەبییەکە پاش بەشی یەکەم دابەش دەبێت بەچەند فەسڵێکەوە کە ئەو بەشەش بەشە عەقیدەییەکەی ئاین دەخاتە ڕوو وە بەم شێوەیە بەدوای یەکدا هاتووە.

أ- بەشی خاوێنی.

ب - بەشی نوێژ.

ج ـ بەشی زەکات.

د ـ بەشی ڕۆژوو.

هـ ـ بەشی حەج.

دەتوانین بەشی یەکەم ناوبنێین بەشی ئیمانو دابەش دەبێت بەسەر ئەم فەسلانەی خوارەوەدا:

أ ـ باوەڕ بەشێوەیەکی گشتی.

ب ـ باوەڕ بەخوا.

ج ـ باوەڕ بە فریشتەکان.

د ـ باوەڕ بە پێغەمبەران.

و- باوەڕ بەڕۆژی دوایی.

ز- باوەڕ بە قەزاو قەدەر (چارەنووس).

(ریلاند) بەشوێن دەقو وەرگێڕانە لاتینیەکەدا چەندین سەرنجو تێبینی بەنرخی نووسیوە کە گەواهی زانیاری قوڵی لەهەندێك سەرچاوەی عەرەبیو فارسیدا بۆ دەدەن کە زۆریەیان لە سەردەمی ئەودا بڵاونەبوونەتەوە, وە لیستێکی تایبەت بە دەستنووسەکانی لە کۆتایی کتێبەکەیدا داناوەو لەو دەستنووسانەش (24) دانەیان هی ناو کتێبخانە تایبەتییەکەی خۆیەتیو داوانیشیان لە کتێبخانەی (ئەمستردام)و چواریشیان تایبەتن بە کتێبخانەی (سیکە)ی مامۆستای زمانی عیبری لە (کمبردج).

ب ـ ڕوونکردنەوەکان:

بەشی دووەمی کتێبەکەی (ریلاند) بەنرخترو بەسوودترە, دابەش دەبێت بەسەر (40) پرسیارو ڕونکردنەوە دەربارەی مەزهەبی موحەممەد لەبەر ڕۆشنایی ئەو ڕایانەی دەربارەی وتراون "یەکەمجار ڕاکەی بەناوی بێژەرەکەیەوە خستووەتەڕوو پاشان هەڵەکەی ئاشکرا دەکات, وە بێگومان ئەوەش بنچینەی خودی هەڵەکەیە, وە لە ڕێگەی چەندین بەڵگەوە کەبواری گفتوگۆکردنیان تێدانییە بە درۆی خستوونەتەوە وەئەوەش بەهەمە جۆری سەرچاوەکانو شیاوبوونیان نەبێت ناکرێت, وە هەموو هیوایەکیشم ئەوەیە کە مەسیحییەکان لەداهاتوودا لەیەکتری بەویژدانترین لەبەرامبەر دوژمنەکانیانداو خۆیان بەدووربگرین لەوەی کە باوەڕ بەو هەموو بیروڕا وەهمی و خەیاڵیانە بکەن کە دەدرێتە پاڵ موحەممەد.

ئەمەش ناونیشانی ئەو ڕوونکردنەوانەیە:

1- ئایا هەر بەڕاستی مسوڵمانان بڕوایان بەم بنەمایە هەیە "کەهەموو تاکێك دەشێت پارێزراو بێت لە ئاینەکەیدا ئەگەر بە زیندەگییەکی خێرئامێزەوە ژیا؟".

2- ئایا موحەممەدییەکان بڕوایان بەخودایەکی بەرجەستە هەیە؟

3- ئایا موحەممەدییەکان بڕوایان هەیە کە خودا کاری شەڕو خراپە بکات؟

4- ئایا موحەممەدییەکان هەسارەی زوهرە دەگەڕێننەوە؟

5- ئایا ڕاستە موحەممەدییەکان هەموو دروستکراوەکان دەگەڕێننەوە؟

6- ئایا موحەممەدییەکان خۆیان لەگرنگی پێدانو چاودێری خوا هەڵە دەکەن؟

7- ئایا باوەڕیان وایە خودا بۆخۆی سڵاواتی لەسەر موحەممەد داوە؟

8- ئایا موحەممەدیەکان دۆزەخ ڕەد دەکەنەوە؟

9- موحەممەدییەکان لەنوێژەکانیاندا ڕوودەکەنە چ قیبلەیەك؟

10- ئایا موحەممەدییەکان وادەزانن کە دەستنوێژ پیسیو چڵکنی ناخو دەروون خاوێن دەکاتەوە؟

11- ئایا لە بنەماکانی ئایینی موحەممەدییەکاندا ئەوە هەیە کەدەڵێت شەیتانەکان هاوڕێی خوداو موحەممەدن؟
12- ئایا بەڕای موحەممەدییەکان فریشتەی مێینە هەیە؟
13- ئایابەپێی ڕاوبۆچونی موحەممەدییەکان فریشتە بیٚ گوناهەکانیش هەڵە دەکەن؟
14- ئایا موحەممەدییەکان ئەوە دەڵێن کە شەیتانەکان نابیستن؟
15- ئایا موحەممەدییەکان لە شوێنکەوتوانی زانای(ئایینگەر خوایی) (أوربچين)ن؟
16- ئایا فیردەوس لەلای موحەممەدو کامەرانی هەتاهەتایش لەلای موحەممەدییەکانە؟
17- ئایا بەگوێرەی ڕای موحەممەدییەکان ژنان لە ئاگر ڕزگاریان دەبێت؟
18- ئایا موحەممەدییەکان دەڕۆن بۆ مەکە بۆ سەردانی گۆڕی موحەممەد؟
19- بۆ چی ئەوە چەسپاوە کە قورئان مەریەمی ناوناوە خوشکی موسا؟
20- ئایا قورئان لە سەردەمی فیرعەونو موسادا هامانی بە هاوچەرخی (مردوخی) داناوە؟
21- ئایا موحەممەد ئەوەی ڕەد کردۆتەوە کە عیسای مەسیح مردبێت؟
22- بەپێی ڕای موسڵمانەکان ئایا مەریەم بۆ ئەوە سکی بوو تاوەکو خورما بخوات؟
23- ئایا سە گ ئاژەڵێکی پاکە لەلای موحەممەدییەکان؟
24- ئایا موحەممەدییەکان بڕوایان وایە کە دەتوانن بەپێی شەریعەتەکەیان پەیمانیان لەگەڵ ناموسڵمانەکاندا هەڵبوەشێننەوە؟
25- ئایا دانەری قورئان دژایەتی خۆی دەکات لە ناو قورئاندا (یان پێچەوانەی خۆیەتی)؟
26- ئایا ڕاستە ئەو فیرعەونەی کە موسای بەخێو کردو ئەو فیرعەونەش کە دوایین گەلی خوا(یەهود)ی دەچەوساندەوەو پاشان لە دەریای سوور دا نوقوم بوو موحەممەد تێکەڵیان دەکات؟
27- ئایا بەڕاستی موحەممەد شمشێرێکی خراپ بووە لە جوگرافیادا بەشێوەیەکی وا کە مەککەی خستۆتە ریزی وڵاتی(حەموتیەکان)ەوە؟
28- ئایا موحەممەد لە قورئاندا پێچەوانەی خۆی بووەتەوە, جارێك دەڵێت نووسین نازانێتو جارێکیش دەڵێت دەیزانێت؟
29- ئایا جارێکی تریش موحەممەد پێچەوانەی خۆی بووەتەوە کە جارێك دەڵێت ئەو خەڵکی بۆسەر ڕێگەی ئاشتیو ئارامی ڕێنموویی دەکاتو جارێکیش دەڵێت نازانێت خۆیو شوێنکەوتوانی چین؟
30- ئایا قورئان هیچ باس ناکات دەربارەی خولیەکی بەدیهێنەرو هەتاهەتایی؟
31- ئایا موحەممەدیەکان بەپێی شەریعەتەکەیان ڕێگەیان پێدراوە چەندیان پیٚ خۆشە ژن مارە ببڕن؟
32- ئایا موحەممەدیەکان کاتێك دەمووچاویان دەشۆن هیچ شتێکی تر لەبەر چاو ناگرن؟
33- ئایا موحەممەدیەکان بڕوایان وایە کەمووسا لەڕیزی نەفرەتلێکراوەکانداییە؟
34- ئایا موحەممەدیەکان جگە لە موساو عیساو موحەممەد دان بە هیچ پێغەمبەرێکی تردا نانێن؟
35- ئایا موحەممەد دەڵێت کەمرۆڤ لە پارچە گۆشتێك دروست بووە؟
36- ئایا موحەممەد مانەوەی هەتاهەتایی ڕۆحی ڕەدکردۆتەوە؟
37- ئایا موحەممەد دەڵێت هەرکەسێك دوژمن بکوژێت یان دوژمن بیکوژێت لە ئاگر ڕزگاری دەبێت؟
38- ئایا ڕاستەدەوترێت کە موحەممەد کۆترێکی بەخێو کردووە هەرکاتێك نۆرەی فێکەی بهاتایە لەلای گوێچکەیەوە گمە گمی دەکرد؟

39. ئایا موحەممەدیەکان بڕوایان بە فرەجیهانی هەیە؟
40. ئایا موحەممەد نەریتی خەتەنەکردنی لە سەردەمی خۆیدا لە یەهودەوە وەرگرت؟
(ج) یاکوب أیرهاتو ڕوونکردنەوەکانی:
لەکاتێکدا کە بەشوێن ئەم ناونیشانەدا دەڕۆین لیستێکی تەواو لە هەڵەی ئەو ئاینگەرە مەسیحیانەمان بەرچاودەکەوێت کە دژ بە ئیسلام نووسیویانەو ئەنجامیان داوە هەر لەسەرەتای سەدەی حەڤدەهەمەوە تاوەکو کۆتاییەکەی, ئەمەش بە بەراورد لەگەڵ ئەو لیستەی (یاکوب ایرهارت)کە پاش 14 ساڵ‌و لە ساڵی (1731ز)دا خستوویەتیە ڕوو کە شارەزاییەکی زیاتری پێوەدیارەو زانستیانە تریشە لەڕاستیشدا کتێبەکەی ( یعقوب ایرهارت) لەم دوانزە بەشەی خوارەوە پێکهاتووە :
1. موحەممەد کەسێکی ئاساییەو خواردن دەخواتو ئاو دەخواتەوە.
2. هێرشکردنەسەر موحەممەد لەلایەن کەسانێکەوە هیچ نازانن.
3. نەزانینی زمانی عەرەبی دەبێتە هۆی ئەنجامدانی هەڵە بەرامبەربە موحەممەد.
4. هەڵەی جوگرافو مێژوویی پەیوەندییان بە نیشتمانەکەی موحەممەدەوە هەیە.
5. دەربارەی موحەممەدو سیستەمەکانی قورئان لە سەردەمی خۆیدا.
6. هەڵەو هەڵەکاری لەوەی دەربارەی موحەممەد نوسراوە.
7. ئەوەی دەربارەی لێوەرگرتنو گۆڕینەوە وتراوە.
8. دەربارەی کاریگەری موعجیزەکان.
9. ئەو هەڵانەی پەیوەندییان بەگۆڕی موحەممەدەوە هەیە؟
10. خەیاڵو ئەندێشەکانی موحەممەدیەکان؟
11. وێنە گرتنو نیگارکاری لەلای موحەممەدو چەند نموونەیەك لە سەری.
12. دەربارەی فێ لەلای موحەممەد.
لە میانەی ئەم ناونیشانانەوە دەبینین کە ئەم کتێبەی (أیرهارت) بەشێکی کەم لەو بابەتانە دەخاتە بەر دەست کە(رولاند) خستونیەتە ڕوو.
لە بەرامبەریشدا ئەو دوورو درێژتر گفتوگۆ لەسەر هەندێك لە خاڵەکان دەکات کە(ریلاند) چارەسەری کردوون وەك بانگەشەکردنی فێ لێهاتنی پێغەمبەر, وەلە زۆر شوێندا بەدوایدا دەچێتو(رودی) پێی وایە ئەوە (مەزهەبی ریلاند)ە, وە(ایرهات) لەگەڵ (ریلاند)دا کۆکە لەوە داکە جەخت لەوە دەکات کە نەزانینی زمانی عەرەبی هۆیەکە لە زانینی شتگەلێك کە پەیوەندیان بە موحەممەدەوە هەیە.
بناغەی بەشی سێیەمی کتێبەکەی بۆ ڕوونکردەوەی ئەو حەقیقەتە داناوە, وە ڕوونیشی دەکاتەوە کە ژمارەیەکی زۆر هەڵە ئەنجامدراون بەهۆی نەشارەزایی بە زمانی عەرەبیو ئەو هەڵانەش پەیوەستن بە وشەکانی (ئیسلام, مسوڵمان, قورئان) وشەی ئیسلام لە ناو زەینییاندا بەستراوەتەوە بە وشەی ساویلکەییەوە, وەڕاڤەی وشەی مسوڵمان بەمجۆرە دەکرێت: مسوڵمان (مسلم) وشەیەکی بنەڕەتی نیەو لە ووشەی (حرب) واتە جەنگەوە هاتووە پاشان موحەممەدییەکان جوانیان کردوە تاوەکو دەلالەت بێت لەسەر واتای تەسلیمبوونی نەفسو ڕۆح وەبەمە مانایەکی ناسكو جوانی پێبەخشیوە (سال, دەستنووسی لایان – کونستاتو هیرورزدل, کتێبی ـ2ـ لاپەڕە, 92).
لەوەش گێلانەتر واتای وشەی قورئانە کە (شوستروس) ڕاڤەی دەکات بەجۆرێك جەخت دەکات کە قورئان تێکەڵەیەکی هەڕەمەکیو ناڕێکە, چونکە قورئان دەستکردە, وەمامەڵەکردن لەگەڵیدا مامەڵەکردنە لەتەك کارێکدا کە پڕیەتی لە پشێوی

وەك يەكێك كە پینەدۆزەو پێلاو چاكدەكاتەوەو ڕێگەی پێنادرێت بە كارێكی باش هەستێتو ناشتوانێت, لەبەرئەوە هەڵدەستێت بە پینەكردنی پێڵاوەكۆنەكان جارێك بە نەعلی كۆنەو جارێكیش بە نەعلی تازە.

جارێك لەسەرەوە پینەی دەكاتو جارێك لەژێرەوە وە جارێكی تریش لەناوەڕاستەوە وەك چۆن مامەڵە لەگەڵ كەسێكی شێتدا دەكات.

لەبەرئەوە هەردوو نووسەر (ریلاندو ئیرهارت) لەسەر ڕوونكردنەوەی كاریگەری شوومی هەندێ نووسەری یۆنانی ڕێككەوتوون كە ئەو درۆیانەیان بلاوكردووەتەوەو بەدییان هێناوە, ئەو یۆنانیانە ئەو بێزەنتیانەن كەپاش ڕووخانی قوستنتینییە لە ساڵی (1453ز) لەناو ئیمپراتۆرییەتی بێزەنتیدا دەركرانە دەرەوە, وە بەمەبەستی تۆڵە سەندنەوەو ڕقو كینە دەربارەی ئیسلام كە ئاینی ئەو توركانە بوو كە دەریانكردن بۆیە دەستیان كرد بە بلاوكردنەوەی وتەی پڕاوپڕ لەدرۆو دەلەسە, وە لەم بارەیەوە (ئیرهارت) بەدوای ئەو دەستەواژەیەی (كروزیو)دا دەچێت لە "مقالات تأريخية حول موضوعات متعددة, لاپەڕە 21" كە دەڵێت ئێمە ئەمڕۆ ڕۆشنبیریمان زیاترە لەسەدەكانی پێشوو چ لەبیروباوەڕەكانو چ لەڕێڕەوی ژیانیشدا, وە لەوەشدا كە پەیوەندی بە موحەممەدی پێغەمبەرو بەو داستانانەوە هەیە كە یۆنانییە كۆنەكان لە بنچینەی ئاینی ئیسلامەوە كۆییان كردووەو لە سایەی گەواهییە كۆنەكاندا بوونەتە جێگای گومان" (لاپەڕە 47), وە لەناو ئەوانەدا ناوی (پیوفون)ی ئیغریقی دێنێت (لاپەڕە 48).

(ریلاند) بەگاڵتەپێكردنەوە لێیاندەدوێت, لەپاش ئەوەی ڕوونی كردەوە یەكەم شتێك كە هۆكاری ئەم هەڵانەیە لەبەرامبەر ئیسلامو دامەزرێنەرەكەیدا ئەوەیە كە نووسەرە ڕۆژئاواییەكان زمانی عەرەبی نازانن, پاشان دەڵێت "ئەم نەزانینە لەلایەن نووسەرە ڕۆژئاواییەكانمانەوەو جگە لەوەش ئەو جۆشو خرۆشە درۆزنانەی هەندێك گەندەیۆنانی كە لە نێوان موسڵمانەكاندا دەژینو لەجیاتی ئەوەی بیانناسنو دیراسەیان بكەنو فێری زمانە پیرۆزەكەیان ببن كەچی ئەوانە لە سەردەمێكی دوورەوە دێنو هەموو بەدرەفتارییەك كە خۆراكی ناچاریو هەستكردن بەڕقو كینەی تێدایە بەرامبەر بە دوژمنە سەركەوتووەكەیان پێشكەش دەكەن, لەهەمان كاتیشدا لەلاكەی تریشەوە جۆشو خرۆشی ئاینی هەبووە.

بابەڕاشكاوانەش بدوێین كە ئێمە سەبارەت بە ئاینی موحەممەدی جگە لەدرۆ هیچی ترمان لەبەردەستدا نییە, ئەوەش پاڵی پێوەنام بڕیار وەرگرم نەك تەنها بۆ وتنی حەقیقەت بەكورتیو ئەوەی تایبەتە بە عەقیدەوە بەڵكو بۆ ڕاستكردنەوەی هەندێك لەو هەڵانەش كەلەم بوارەدا ئەنجامدراون.

د- مەریەم— ئەی خوشكی هارون:

لەنێوان ئەو (40) پرسیارەدا كە (ریلاند) وروژاندونی پرسیاری ژمارە (19)یە: ئایا ڕاستە ئەوەی كە لە قورئاندا هاتووە گوایە (عەزرا— مەریەم) خوشكی هارونە؟ ئەوەش پرسیارێكە لەمەودوا ڕوونی دەكەینەوە چونكە تا ئەمڕۆش دەوروژێنرێتو قسەی لەسەر دەكرێت, ئەوەی لەدەقە لاتینییەكەی (ریلاند)دا هاتووە دەشێت بەمشێوەیەی لای خوارەوە كورتی بكەینەوە:

أ- وا دەڵێت كە موحەممەد لە قورئاندا جەخت لەوەدەكات كە مەریەمی دایكی گەورەمان مەسیح خوشكی (هارونو موسا)یە.

ب - ئەم تۆمەتە لەلای (یوحەننای دیمەشقیش) لە كتێبی (الطوائف)دا بەرچاو دەكەوێت, (نیكولادی كوزا)ش لەكتێبی (غربلة القرآن— لە بێژنگدانی قورئان)دا دووبارەی دەكاتەوە, هەروەها (جان أندروس) لە كتێبی (التعاليم المحمدية المبهمة, ڕێنماییە موحەممەدییە نایارەكان)داو بەهەمانشێوەش (هورثبك واثیموس زیجابینوس)و زۆرێكی دیكەش كە ئەم جیاوازیو لێك دوورییە مێژووییە بەشێوەیەك وەك كۆڵەكەیەكی بنەڕەتی دەخەنەڕوو تاوەكو سەرچاوەی خوایی بوونی قورئانی پی بەدرۆ بخەنەوە.

ج ـ (ریلاند) دەڵێت ڕێگەپێدراوە گریمانەی ئەوە بکەین کە موحەممەد نەشارەزا بووە بە مێژوو و ڕێکخستنی زەمەنی, لەبەرئەوەیە تێکەڵی لەنێوان سەردەمی موساو سەردەمی عیسادا دروستکردووەو شوێن هەڵەی هەندێك داستان لەبارودۆخە مێژووییە جیاوازەکاندا کەوتووە, زیاد لەوەش ئەو خۆی بە پێغەمبەرێکی نەخوێندەوار –ئوممی– ناوبردووە.

د ـ بەلام شتێکی دیکەی سەلمێنراو: ئەوەیە کە قورئان لە ئایەتی (28ی سورەتی مەریەمدا) مەریەمی بەخوشکی هارون ناوبردووە (يَا أُخْتَ هَارُونَ مَا كَانَ أَبُوكِ امْرَأَ سَوْءٍ وَمَا كَانَتْ أُمُّكِ بَغِيّاً) (مريم : 28 ).

هـ ـ ئەگەر لێم بپرسی: بەڵام ئەو هارونە کێیە؟

ئەگەر براکەی موسا نەبێت؟

ئەوکاتە وەڵامتان دەدەمەوە: ئەوە تەنها ڕاڤەکردن و لێکدانەوەیە کە مەسیحییەکان پێی هەستاون, نەك لێکدانەوەی موحەممەد یان لێکدانەوەی من بێت. ڕێی تێدەچێت کە (مەریەم) برایەکی هەبووبێت و ناویشی (هارون) بووبێت بەڵام جگە لە قورئان هیچ نووسەرێکی دیکە نە تۆماری کردووەو نەناویشی بردووە.

و ـ گریمانەیەکی دیکەش هەیە کە ئەوەیە ئێمە لەناو مسوڵمانەکاندا کەسانێکمان نەبینیوە بڵێن مەریەمی خوشکی موسا بە موعجیزەیەکی خوایی لەسەردەمی موساوە تاوەکو سەردەمی عیسا هەر بەزیندوویی ماوەتەوە تاوەکو ببێتە دایکی عیسا.

ز ـ گریمانەیەکی سێیەمیش هەیە کە (د. هربلوت) لە (المكتبة الشرقية) لاپەڕە (583)دا باسی کردووە, ئەوەیە کە مەریەم لە بنەماڵەی (عمرانی باوکی موساو هارونە) چونکە لەسەری (حەننە)ی دایکییەوە دەچێتەوە سەر بنەماڵەی هارون, واتە لەبنەماڵەیەکی (کەهەنوتی – قەشەگەری)یە لەوەدا ئینجیل بڕوانە لۆقا (36) دەڵێت "اليصابات" ی خزمی (مەریەم) شۆڕدەبێتەوە سەر بنەماڵەی هارون (بڕوانە, لۆقا 1:5) وە ئەوەش ڕای هەندێك مسوڵمانە ڕاڤەکارەکانی قورئانە.

ح ـ ئەو ڕاڤەکارانە ئەوەش زیاد دەکەن کە (عمران)ی باوکی (مەریەم) کوڕی (ماثان) بووە بۆیە ئەوە (عمران)ێکی دیکەیە جگە لە (عمران)ی باوکی (مەریەمی خوشکی موسا) بە پێی وتەی ئەوان ئەم (عمران)ە ئەوەیە کەلەلای مەسیحییەکان بە (یواقیم) ناسراوەو مێردی (حەننە)ی ژنە قەشەو باوکی (مەریەم)ی دایکی عیسایە, کەواتە دوو (عمران) هەیە یەکەمیان باوکی مەریەمی خوشکی هارون و موسایە دووەمیشیان باوکی مەریەمی دایکی حەزرەتی عیسایە.

ط ـ (ریلاند) کە باس لەم چوار گریمانەیە دەکات لەهەمانکاتدا هیچ کامیشیان بە پەسەند نازانێت چونکە هیچ یەکێکیان نەسەلمێنراون, بەڵام ئەوەی کە سەلمێنراوە لەلای ئەو ئەوەیە کە ناکرێت ڕەخنە لە قورئان بگیرێت لەسەرئەوەی وتویەتی مەریەمی دایکی حەزرەتی عیسا خوشکی حەزرەتی موسایە, لەبەرئەوە ناکرێت دوژمنەکانی قورئان و ئیسلام شتێك لەم وتە قورئانییەوە (يا أخت هارون – ئەی خوشکی هارون)ەوە هەموو تۆمەتەکانی دیکە کەلەسەر ئەم ئایەتە وەستاوە دەربێنن کە جێگای گومان نەبێت و بناغەیەکی ڕاستی نەبێت.

گفتوگۆکردن لەسەرئەو چوار گریمانەیە:

ئەگەر لەنزیکەوە گفتوگۆ لەسەر ئەم چوار گریمانەیە بکەین دەبینین:

1ـ گریمانەی یەکەم کە دەڵێت مەریەمی دایکی عیسا برایەکی هەبووە ناوی هارون بووەو ئەوەش لەبەڵگەنامە مەسیحیی یان یەهودییەکاندا باسنەکراوەو تەنها قورئان ناوی بردووە, ئەم گریمانەیە ئەگەر لەخودی خۆیدا مەحاڵیش نەبێت ئەوا لەوەدا کە هیچ بەڵگەنامەیەکی دیکە نییە کە پشتی پێ ببەستێت لاوازە.

2ـ گریمانەی دووەم ئەوەیە کە مەریەمی خوشکی موساو هارون بە موعجیزەی خوایی زیاتر لە پانزە سەدە ژیاوە بۆ ئەوەی ببێتە دایکی عیسا, ئەوەش بێگومان گریمانەیەکی بێهودەو هەر لەخۆوەیە.

هەروەها شتی وام لە نووسینی هیچ ڕاڤەکارێکی قورئاندا نەبینییوە, وە دەشێت لێرەدا بپرسین بۆچی خوای گەورە ئەم موعجیزەیە بەدی دەهێنێت؟ لەکاتێکدا کە قورئان ناوی ئەم مەریەمەی خوشکی موسای نەبردووەو تەنانەت ئاماژەشی پێنەداوە.

کەواتە بۆچی ئەم موعجیزەیەی بدەینە پاڵو بیخەینە سەر موعجیزەکانی دیکە کە دەربارەی مەریەمی دایکی عیسا باسکراون؟

ڕووی ئەم گریمانە بێ ئەنجامە بەرەو کوێ وەرگێڕین!

3- گریمانەی سێیەم کە مەریەمی دایکی عیسا لە بنەماڵەی (عمران)ی باوکی موساو هارون بێت زیاتر جێگەی پەسەندکردنەو شیاوی لێکۆڵینەوەو لێراسە لەسەرکردنێکی دوورودرێژە, ئەوەش پاش ئەوەی بەخێرایی گریمانەی چوارەم باسدەکەین بەدرێژی لەو بارەیەوە دەدوێین.

4- گریمانەی چوارەم کەوەك گریمانەی یەکەم وایەو بەجۆرێك گریمانەی بوونی دوو (عمران) دەکات:

یەکێکیان باوکی حەزرەتی موسا, دووەمیشیان باوکی مەریەمی دایکی حەزرەتی عیسا وە ئەوەش هیچ سەرچاوەیەکی (تەوراتی) باسی ناکات, وە هەریەك لەدوو گریمانەی یەکەمو چوارەم بێبەڵگەنو پێویستییەکانی مەسەلەکە دروستی کردوون.

دەمێنێتەوە گریمانەی سێیەم ئەوەی ئێستا بە قووڵی لێی دەکۆلینەوە.

أ- مەریەم لە بنەماڵەی (هارون)ەوە شۆڕبووەتەوە:

بەمەسەلەی پەیوەندی نەژادی -ڕەچەڵەکی- نێوان مەریەمی دایکی مەسیحو هارونی کوڕی عیمرانو برای موسا دەستپێدەکەین, وە لەڕێگەی (ئیلیسابات) کە بەزمانی عیبری بە (ئیلیشا) دەردەبڕدرێت و ژنی حەزرەتی زەکەریاو دایکی (یوحەننای مەعمەدان) واتە (حەرزرەتی یەحیا)یە ئەم ژنە لە بنەماڵەیەکی (کەهەنوتی- قەشەگەری) بووەو یەکێکە لەوانەی کەلە وەچەکانی (هارون)ەوە هاتووەو ئینجیلی (قەشە لۆقا: 1-5) باسی کردووەو دەڵێت "لەسەردەمی هیرۆدوسی پاشای یەهودەکاندا قەشەیەك هەبوو ناوی زەکەریا بوو لە چینی (ئەبیا) بوو ژنەکەی لەوەچەکانی هارونەوە هاتووە - شۆڕبووەتەوە - ناوی الیصابات بوو".

هەمان ئینجیل دووپاتی دەکاتەوە کە (ئیلیسابات) خزمێکی نزیکی مەریەم بووە (لۆقا: 1-36) (ئەمە ئیلیسابات بوو).

لەلایەکی تریشەوە (هیپۆلیت)ی قەشە جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە بەپێی وتەی (کالکست هیست) دایکی مەریەمو دایکی ئیلیسابات خوشك بوون دایکی مەریەم ناوی (حەننە) بووەو دایکی ئیلیسابات ناوی (صوبا) بووە, هەروەها (میناجون) کە خشتەی شەهیدەکانە لە کەنیسەی یۆنانیدا بەهەمان شێوە پەیوەندی نەژادی -ڕەچەڵەکی- نێوان مەریەمو ئیلیسابات دووپات دەکاتەوە.

بەپێی ئەم دوو سەرچاوەیەی (قەشەلۆقا)و (قەشە هیپۆلیت) مەریەم خزمی نزیکی ئیلیساباتەو بەپێی سەرچاوەکەی (هیپۆلیت) مەریەم کچی پووری ئیلیساباتە, هەروەها خودی (لۆقا)ش ئەوە دووپات دەکاتەوەو هیچ کەس لەم بارەیەوەو بەرهەڵستی ناکاتو ڕەخنەی لێناگرێتو دەڵێت "ئیلیسابات لە وەچەی هارونەوە شۆڕبووەتەوەو دەشێت ئەنجامەکەشی ئەوە بێت کە مەریەمو کچە پورەکەی لەهەمان بنەماڵەی (هارون)ەوە هاتبن ئیتر لەسەری باوکەوە بێت یان دایکەوە ئەوەیان گرنگ نییە".

ب - بنەماڵەی (عیمران):

ئەگەر (ئیلیسابات)و (مەریەم) لەبنەماڵەی هارونەوە شۆڕبووبێتنەوە, وە هارونیش کوڕی (عیمران)ە کەواتە مافی خۆمانە کە هەرسێکیان لە خێزانی (عیمران) بیانژمێرینو هەروەها منداڵەکانیشیان (یوحەنای مەعمەدان- یەحیا)و یەسوعی

مەسیح (عیسا)ش بەهەمان شێوە, وە ئەمەش ڕاڤەی ئەوە دەكات بۆچی لە سورەتی (آل عمران)دا قورئان قسەی لەسەر (دایكی یەحیاو مەریەمو یەحیاو عیسا) كردووە وەك یەك خێزان كە ئەویش خێزانو بنەماڵەی (عیمران)ە بەوپێیەی ئەوانە هەموویان لەوەچەی (هارون)ن.

كەواتە با ئەم ڕاڤەیە جێبەجێ بكەین بەسەر ئەو شوێنانەدا كە تیایدا ناوی (عیمران)ی هێناوە: (وەرگێڕانی س– بلاشیر).

1ـ سورەتی (آل عمران ئایەتی 33– 34) (إِنَّ اللّهَ اصْطَفَى آدَمَ وَنُوحاً وَآلَ إِبْرَاهِيمَ وَآلَ عِمْرَانَ عَلَى الْعَالَمِينَ* ذُرِّيَّةً بَعْضُهَا مِن بَعْضٍ وَاللّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ).

2ـ هەمان سورەت ئایەتی (35) (إِذْ قَالَتِ امْرَأَةُ عِمْرَانَ رَبِّ إِنِّي نَذَرْتُ لَكَ مَا فِي بَطْنِي مُحَرَّراً فَتَقَبَّلْ مِنِّي إِنَّكَ أَنتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ).

3ـ سورەتی (التحريم) ئایەتی (12) (وَمَرْيَمَ ابْنَتَ عِمْرَانَ الَّتِي أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا فَنَفَخْنَا فِيهِ مِن رُّوحِنَا وَصَدَّقَتْ بِكَلِمَاتِ رَبِّهَا وَكُتُبِهِ وَكَانَتْ مِنَ الْقَانِتِينَ).

ئایەتی یەكەم لەگەڵ تەفسیرەكەماندا ڕێكدەكەوێت، چونكە خێزانی (عیمران) (آل عمران) ئەمانە دەگرێتەوە, ئیلیساباتی ژنی زەكەریا, یەحیا, مەریەم, عیسای كوڕی مەریەم, هەروەها موساو هارونیش وە ئەوانە گروپێك پێكدێنن لەبەرامبەر خێزانی ئیبراهیم (آل إبراهيم)دا كەلە دوو كوڕەكەی ئیسماعیلو ئیسحاقو وەچەكانیان بەتایبەتی یەعقوبو یوسفی كوڕی پێكهاتووە.

دەشێت ئایەتی دووەمیش بچەسپێنین ئەگەر مەبەستی بە دەستەواژەی (إمرأة عمران– ژنەكەی عیمران) مانایەكی دیاریكراو نەبێت واتە ژنێك لەبنەماڵەی عیمران یان عیمران لێرەدا بەناوی بنەماڵەیی (فامیلی) دەژمێرێت نەوەك ناوێك بۆ مێردەكەی وە بێگومان زۆر ئاساییەكە بوترێت (إمرأة من عمران) واتە (ژنێك لە بنەماڵەی عیمران).

ئایەتی سێیەمیش بەمشێوەیە ڕاڤە دەكەین: (مريم ابنة عمران) مریەمی كچی عیمران واتە "ابنة من آل عمران– كچێك لە بنەماڵەی عیمران).

لەوانەیە كەسێك بپرسێت ئەی بۆچی ناوی مەریەمی بەتەواوی نەهێناوە؟ دەشێت وەڵام بدەینەوەو بڵێین: كەناوی باوكی مەریەم لە (العهد الجديد)دا باس نەكراوە وە خزمەكانیشی هەربە بیستنو وتی وتی زانراونو ناسراون, وەكۆنترین ئەو كتێبانەی كەبەسەرهاتیان دەگێڕێتەوە ئەو ئینجیلانەن كە پشتیان پێ نابەسترێت وەك ئینجیلی لەدایكبوونی مەریەمو ئینجیلی قەشە سان چاك, (العهد الجديد, لاپەڕە 13–67).

تیایدا دەگێڕنەوە كە باوكی (Anne– حەننە)ی دایكی مەریەم قەشەیەك بووە لە شاری (بەیت لەحم) وە (حەننە)ش شووی كردووە بە پیاوێك ناوی (یواكیم یان یواقیم) بووەو خەڵكی شاری (جەلیل) بووە, وە ئەم (یواقیم)ە بەنەناسراوی ماوەتەوەو نازانرێت كێیەو چی بووە, وە قەشە (گریحوار) كە ئەم چیرۆكە دەگێڕێتەوە دەڵێت ئەم بەسەرهاتە لە چیرۆكێكی (پشت پی نەبەستراوەوە) وەرگیراوە كە برتییە لە ئینجیلی (قەشە چاك) كەلە سەدەی دووەمی زاینیدا نووسراوە (بڕوانە: فەرهەنگی كتێبی پیرۆز بەرگی 4, بەشی یەكەم, لاپەڕە 790), جا ئەگەر (العهد الجديد) ناوی باوكی مەریەمی باس نەكردبێت ئەوا باشتر وایە كە پێمان وابێت قورئان ناوی نەبات چاكترە چونكە ناوێكی نەناسراوە, وە هەموو ئەوەی لە بارەیەوە دەزانرێت كەسێك بووە لە (آل عمران) بنەماڵەی عیمران.

ج ـ چۆن دەستەواژەی ئەی خوشكی هارون (يا أخت هارون) ڕاڤە بكەین؟

ماوەتەوە لەدەستەواژەی ئەی خوشكی هارون كە لە سورەتی (مريم ئایەتی 28)دا هاتووە بكۆڵینەوە.

بەڵام بەڕای ئێمە ئەم کارە ئاسان نییە, چونکە (ریلاند) بە پێی (المکتبة الشرقیة) باسی لەڕاڤەی هەندێك ڕاڤەکاری مسوڵمان کردووە ئەوانەیان کە دەڵێن ئەم دەستەواژەیە واتە "ئەی مەریەمی شۆڕبووەوە لەبنەماڵەی پیرۆزی هارون".

بەڵام سەرەڕای دروستی ئەم ڕاڤەیە ئەوەتا هەندێك ڕۆژهەڵاتناس هەوڵی دووبارەکردنەوەی هەمان تۆمەتی گاڵتەجاڕی پێشوویان داوە کە ڕاڤەمان کرد, ئەوەتا (یوحەنای دیمەشقی) باسی هەندێکیان دەکات (الطوائف, 675–749) وە بۆ ئەوەی وێنەکەمان بۆ تەواوبێت ڕاوبۆچوونی هەندێك لەو ڕۆژهەڵاتناسانە دەخەینەڕوو:

1ـ هربرت گریم: محمد (بەشی 2, لاپەڕە 92– 93 مانچستیر– 1895ز).

"لەماوەی بەیەکگەیشتنی ژێر درەختەکەدا موحەممەد ڕێنماییە مەسیحییەکانی بەتەواوی وەرگرتو کۆتایی بەوەرگرتنەکانی هێنا لەڕێگەی شارەزابوونی بە هەندێك کەسایەتی (سەردەمی نوێ– العهد الجدید) وەك عیساو مەریەمو یەحیاو زەکەریا کە ئەوانەش لەوەچەکانی پێغەمبەرە پیرۆزەکانن, وە لە سەردەمی (مەدەنی– مەدینە)دا ئەوانەی وا ناساند کە گروپێکنو بنەماڵەیەکی پیرۆز پێکدێنن لەژێر ناوی (آل عمران)و سورەتی (آل عمران) بنەماڵەی عیمراندا, وە لە ژێر ئەو ناوەدا کەوانراوە زنجیرەیەك هەڵەی مێژوویی باسکردووە بەشێوەیەك کە (مەریەمی خوشکی موساو هارونی) یەکسان کردوون, هەروەها (عیمران)ی باوکی ئەوسێ کەسەشی کەلە ئینجیلدا باسکراوە بەستوویەتییەوە بە باوکی بنەڕەتی ئەو بنەماڵە پێغەمبەرییەوە کەلەلای مەسیحییەکان پیرۆزە.

2ـ یوسف هورفیتز – البحوث القرآنیة– برلین, 1926ز, ئەوەش لە دوو شوێندا:

أـ لاپەڕە (128) عیمران وەك ناوێك بۆ باوکی مەریەم باسنەکراوە جگە لەسەردەمی (مەدەنی)دا نەبێت لە سورەتی (التحریم) ئایەتی (22) وە سورەتی (آل عمران ئایەتی 30) وە دوای ئەوە تێکەڵیو بەناویەکدا چوون لە نێوان ئەوو باوکی مەریەمی خوشکی موسادا دروست بووە.

ب ـ "هەمان سەرچاوەی پێشوو لاپەڕە (138, 139)" مەریەم وەك دایکی عیسا لەماوەی دووەمی سەردەمی (مەکیی)دا ناوبراوە بۆ نمونە سورەتی (مریم ئایەتەکانی 16, 35, 23, 52) وە لە ئایەتی (57)دا وەك کچی عیمرانیش باس نەکراوە تەنها لە (ئایەتی 3ی سورەتی آل عمران)و (ئایەتی 12ی سورەتی التحریم)دا نەبێت.

وە هەردووکیان بەشوێن قۆناغی (مەدەنی)دا دێن و (لە سورەتی مریم ئایەتی 28)دا بەشێوەیەك باسکراوە کەخوشکی هارونە ، بەو جۆرە تێکەڵکردنی نێوان مەریەمی خوشکی موساو هارون دەگەڕێتەوە بۆ قۆناغی پێشوو, موحەممەد هەمان شێوەی دەقە ئیغریقییەکانی بۆ ئینجیلیش بەکارهێناوە لەوەدا کە تایبەتە بە مەریەمی دایکی عیساوە.

لەدەقە سریانییەکاندا (مەریەمو ماریا) وەك خوشکی موساو هارون ناسراوە، هەردووکیشیانی بەیەك کەس لەقەڵەم داوە.

3ـ ڤینسنك لەو دوو ڕۆژهەڵاتناسەی تر لەوتارێکدا بەناونیشانی "مەریەم لە ئینسکلۆپیدیای ئیسلامدا" (بەرگی 3, لاپەڕە 359– چاپی یەکەمدا) زیاتر ئاگاداری خۆی بووە بەشێوەیەکی وا کە دەڵێت بەرپرسیارێتی لە ئەستۆی ئەوانی تردایەو نووسیویەتی:

أـ گریمانە دەکرێت کەناوی عمران کە بێگومان بەسەر شێوازی تەوراتی ناوەکەدا دەچەسپێتو (عمرانو موسا لەوەشدا کە مەریەم نازناوی خوشکی هارونی وەرگرتووە لە سورەتی (مەریەم ئایەتی 28)دا هەمان شتە, وە ئەمەش سەردەکێشێت بۆ تێکەڵبوونی نێوان مەریەمو مەریەم لە تەوراتدا: سال Saleو جیروك Gerockو کەسانی دیکەش وا گومان دەبەن کە ئەم تێکەڵبوونە مەحاڵە, بەهەرحاڵ مسوڵمانەکان بۆمان دووپات دەکەنەوە کە ماوەیەکی زەمەنی کە 180 ساڵ دەبێت لەنێوان عیمرانی تەوراتو عیمرانی باوکی مەریەمو ژنەکەی عیمرانی دایکی مەریەمو نەنکی عیسادا هەیە کەناوی لە قورئاندا بەرچاوناکەوێتو ناوی (Anne– حەننە)یە لەسەرچاوە مەسیحیو هەروەها سەرچاوە ئیسلامییەکانیشدا, وەتەنها

سەرچاوە ئیسلامییەکان باس لەڕەچەڵەکی (حەننە) دەکەن کە کچی (فاقوذ)ەو خوشکی (إشباع)ە کە لەتەوراتدا (ئیلیسابات)ە.

ب ـ لاپەڕە 360ی سەرچاوەی پێشوو "بەڵام دەربارەی دەستەواژەی (ئەی خوشکی هارون) دەشێت ئەوە زیاد بکەین کە بەپێی سەرچاوەکانی ڕاڤەکارەکان ئەم هارونە برای مەریەم نەبووە بەڵکو هاوچەرخی مەریەم بووەو پیاوێکی خراپەکاربووەو مەریەمیان بەو چواندووە یان برایەکی بەبەزەیی بووە لەتەکیا.

4ـ ریجیس بلاشیر (القرآن– وەرگێرانی بەپێی ڕێکخستنی سورەتەکان) بەرگی 2, پاریس 1949, تێبینی دەربارەی ئایەتی 28ی سورەتی مەریەم "یا أخت هارون" وە لە ئایەتی 35ی سورەتی آل عمران دایکی مەریەم بە "إمرأة عمران– ژنەکەی عمران" ناو دەبرێت, وە لە ( ئایەتی 12ی سورەتی التحريم)دا "مريم ابنة عمران– مەریەمی کچی عمران) ئەمانە لەگەڵ سەرچاوە مەسیحییەکاندا کە لە ئینجیلە پشت پێ نەبەستراوەکاندا خۆیان دەنوێنن دژی یەکترین (ئەوسەرچاوە مەسیحیانەش تاکە سەرچاوەن کەلەم بوارەدا دەیانزانین) بەشێوەیەك باوکی مەریەم بە (یواکیم– یواقیم) ناو دەبات, وە ئەوەش مشتومڕی مەسیحییەتی دژ بە ئیسلامی درێژکردووەتەوە لەوانەشە بووبێتە دڕندەییەکی توندتر دژ بە موحەممەد: وە لەلاپەڕە (59ی طبری)دا هاتووە "ئەو ڕەخنەیەی کە مەسیحییەکانی نەجران شوێنی کەوتوون کە گوایا ئەوان تێکەڵییەك دەبینن لەنێوان مەریەمی دایکی عیساو مەریەمی خوشکی هاروندا (سفر الخروج) إصحاح 15 ئایەتی 20و سفر العدد إصحاح 12 ئایەتی 1, کە تایبەتە بەم هێرشکردنەوە قسەیان لەسەرکردووە.

قورئان پێشنیاری ئەوە دەکات کە لە هارونی ناوبراو لێرەدا کەسایەتییەکی دیکە ببینین جگە لە براکەی موسا یان مانای (ئەی خوشکی هارون) واتە (ئەی لەبنەچەی هارونەوە هاتوو) بگەیەنێت.

5ـ رودی پارێت Rudi Paret:

(القرآن تعليق وتوفيق) ، فبرلگو کونیتا لە شتوتگارت… هتد 1971, تێبینی دەربارەی ئایەتی 44ی سورەتی (آل عمران).

ئەویش هەمان تۆمەتی تێکەڵاوکردنی نێوان مەریەمو مەریەم دووبارە دەکاتەوە, پاشان بەدوای ساناکردنی مەسەلەکەو کەمکردنەوەی گرنگییەکەیدا دەگەڕێتو دەڵێت: پێویست ناکات تێکەڵی بکرێت لەنێوان ڕەچەڵەکی مەریەم لە (العهد الجديد)داو لەنێوان مەریەم لە (العهد القديم)دا ئەم بابەتە لەبنەڕەتەوە پەیوەندی بەناوەکانەوە هەیە لەبەر ئەوە ناکرێت گفتوگۆی لەسەر بکەین, لەڕاستیدا مەسەلەی تێکەڵکردن لەنێوان (ماریاو مريام)دا بەو پێیەی کە موحەممەد ڕۆژێك لەڕۆژان باوەڕی وابووبێت کە عیسای کوڕی مەریەم کوڕی مەریەمی خوشکی موسایەو لەسەردەمی خۆیدا لەهەمان نەوە بووە, ئەوا موحەممەد هەرگیز بڕوای وا نەبووە.

بەڵام پاش ئەم بەڵگە ڕوونو ڕاشکاوانەیە (رودی) دەگەڕێتەوە سەر هەمان تۆمەتی تێکەڵکردن کاتێك لەچەند دێڕێکی پاش ئەوەدا دەڵێت:

ئەوەی سەرنج ڕاکێشە ئەوەیە لەهەمان دەقی ئایەتی (28)ی سورەتی مەریەمو ئەوەی پاش ئەوەش دێت مەریەم وا باسکراوە کە دایکی عیسایەو هەروەها خوشکی هارونە وە ئەمەش واتە خوا بەبەزەییو بەخشندەیی خۆی هارونی ناردووە بۆ یارمەتی موسای برای, وە لێرەدا هارون وەك برای مەریەمو موسا باسکراوە.

ئەمە بەڕاشکاوی کۆتاییەکی درۆیە, چونکە لێرەدا پەیوەندی نییە لەنێوان ئایەتی (28) (يا أخت هارون)وئایەتی (51) کەسەربە چیرۆکێکی دیکەیەو بریتییە لە چیرۆکی موسا کە بەتەواوی دابڕاوە لەم چیرۆکە ( واذكر في الكتاب موسى انه كان مخلصا وكان رسولا نبيا) لەحەقیقەتدا تێبینییەکەی (رودی پارێت) لێڵو ناڕیارەو پڕیەتی لە دژواری.

هـ ـ پێنج چارەسەرکە ڕاڤەکاران پێشنیازیان کردووە:

أ- گریمو هورفیتز هیچیان نەکردووە جگە لەدووبارە کردنەوەو وتنەوەی تانە –ڕەخنە– کۆنەکە, کە بریتییە لەتێکەڵکردن لەنێوان مەریەمی دایکی عیساو مەریەمی خوشکی هاروندا بەبێ هیچ بەڵگەیەکی زیادەو تەنانەت چوار گریمانەکەی (ریلاند)یش کە لە ساڵی (1705ن)ەوە باسی کردوونو ئەوەی کەبەهەرحاڵ گریمانەگەلێکی زۆر نامۆشن.

ب ـ بەڵام دەربارەی ڤنسنك ئەمیان بەخستنەڕووی بیروڕاکانی ئەوانی دیکە وازدێنێت بەبێ جیاوازی لەنێوان ئەوەیاندا کە ئایا بەڕەخنەکە ڕازی بووەو پەسەندی کردووە یان ئەوەیان بوویێت کە لە دژی بوویێت, وە ئەو لەهەمان کاتدا شوێن ڕای هەندێك لە موسڵمانە ڕاڤەکارەکانی قورئانیش کەوتووە.

ج ـ ئەوەی لای (بلاشیر) تازەیە ئەوەیە ئەو گریمانەی ئەوەی کردووە کەلەوانەیە ئەو ڕەخنەیە لە ژیانی موحەممەد خۆی گیرابێت, لەوەشدا دەگەڕێتەوە بۆ (طبری, 59) کە ئەوە سەرچاوەیەکە نەمتوانی لەسەر دووپاتکردنەوەی بوەستم چونکە (طبری) بەلای ئەوەوە واتە تەفسیر, کەواتە ئەو ژمارەیە (59) دەلالەت لە هیچ شتێك ناکات, لەواقیعیشدا پێویستە بگەڕێینەوە بۆ ئەوەی (طبری) لەڕوونکردنەوەکەیدا لەسەر ئایەتی 28ی سورەتی مەریەم وتویەتی (بەشی 16, لاپەڕە 51, 52, چاپخانەی المیمنیة لە قاهیرە).

لەڕاستیدا (طبري) دەڵێت "شارەزایانی تەفسیر ڕای جیاوازیان هەیە لەسەر نهێنی بانگکردنی مەریەم بە (ئەی خوشکی هارون) وە لە بارەی ئەوەی ئەو هارونە کێیە کە خوا باسی کردووە, دەڵێت ئەوانە جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە مەریەم خوشکیەتی, وە کەسیان نەیان وتووە (ئەی خوشکی هارون) بە واتای (الصلاة) دێت چونکە (أهل الصلاة– نوێژگەرەکان) لای ئەوان بە هارون ناودەبران, وە دووپاتی دەکەنەوە کە هارون لێرەدا ئەو هارونەی برای موسا نییە, ئەم ڕایەش حەسەنی کوڕی عبدالرزاقو موعەمەر لە قەتادەوە باسیان کردووە, قەتادە لە میانەی قسەکردنی لەسەر "ئەی خوشکی هارون" دووپاتی دەکاتەوە کە ئەم هارونە پیاوێکی خواناسی ناو بەنی ئیسرائیل بووەو ناوی هارون بووەو لەگەڵ مەریەمدا بەراوردیان کردووەو وتویانە "ئەی خوشکی هارون" چونکە لەتەقواو خواناسیدا وەك ئەو هارونە وابووە.

(بیشر لە یەزیدەوە ئەویش لە سەعیدەوە) دەگێڕێتەوە کە (قەتادە) دەربارەی ئایەتی (يَا أُخْتَ هَارُونَ مَا كَانَ أَبُوكِ امْرَأَ سَوْءٍ وَمَا كَانَتْ أُمُّكِ بَغِيّاً)– ئەی خوشکی هارون نە باوکت پیاوێکی خراپ بووەو نە دایکیشت داوێن پیس بووە– وتویەتی: "مەریەم لە بنەماڵەیەکی ناسراو بووە بە خواناسیو ناوو ناوبانگی چاك ، وە لەنێو خەڵکیدا وا زانراوە کە ئەوانەی بەچاکەخوازی بەناوبانگن نەوەی چاکو باشیان لێدەکەویتەوە, وە ئەوانەش کە بە خراپەکار بەناوبانگن نەوەی خراپ دەخەنەوە, وە ئەم هارونە خۆشەویستی ناو هۆزەکەی بووە وە هارونی برای موساش نییە بەڵکو هارونێکی دیکەیە.

(ئیبن سیرین) دەڵێت زانیومە کە (کەعبی أحبار) لەمیانەی قسەکردنی لەسەر (ئەی خوشکی هارون) وتویەتی ئەم هارونە مەبەست پێی هارونی برای موسا نییە, بۆیە (عائیشە) پێی دەڵێت تۆ درۆ ئەکەی، ئیبن سیرین دەڵێت کەعب وەڵامی دایەوە وتی: ئەی دایکی ئیمانداران ئەگەر ئەوە پێغەمبەر وای وتبێت ئیتر ئەوە ئەو لەکەسانی تر شارەزاترە, بەڵام من دەبینم لە نێوانیاندا 1200 ساڵ هەیە, ئیتر عائیشە بێدەنگ بوو, وە یونس لەکوڕی وەهەبەوە بۆی گێڕامەوە کە کوڕی زەید دەربارەی ئایەتی (یا أخت هارون) وتویەتی ئەوە ناوێکە لەگەڵ ناوەکانی ئێوەدا ڕێك دەکەوێت لەڕاستیشدا لەنێوان هارونو مەریەمدا چەندین نەوە لەناو گەلەکاندا بەدوای یەکدا هاتوون.

هەروەها موغیرەی کوڕی شوعبە دەڵێت پێغەمبەر (ﷺ) ناردمی بۆلای دانیشتوانی نەجران پێیان وتم: ئایا (یا أخت هارون) ناخوێننەوە؟ وەڵامم دانەوە: بەڵێ ، وتیان : ئایا نازانن ماوەیەکی دوورو درێژ لەنێوان عیساو موسادا هەیە, ئەی ئەوە وانییە؟ کە گەڕامەوە بۆلای پێغەمبەری خوا ئەوەی ڕوویدابوو بۆم گێڕایەوە, ئەویش لەوەڵامدا فەرمووی "دەبوایە بەرپەرچیان بدەیتەوە, بەوەی ئەوان نەریتێکیان هەبووە کە خەڵکی بەناوی پێغەمبەرەکانیانەوە ناو بنێن ئیتر لەوانەبوو سەری بنێنەوە".

هەندێکی دیکە دەڵێن کە هارون (لەم ئایەتەدا) هارونی برای موسایەو مەریەمیش بە خوشکی ناوبراوە چونکە لە بنەماڵەی ئەوەوە شۆڕبووەتەوە, لەواقیعدا بە پیاوێك لەهۆزی تەمیم بۆ نمونە دەوترێت برای تەمیم (سەدی) دەڵێت ئەوەی ئەم ڕایە دوویات دەکاتەوە لە بابەتی (ئەی خوشکی هارون)دا ئەوەیە مەریەم لە نەوەی هارونی برای موسا بووە وەك ئەوە وایە بڵێیت ئەی برای نەوەی فلان.

(سەدی) دەڵێت ئەوەی ئەم ڕایە لە بابەتی (ئەی خوشکی هارون)دا دوویات دەکاتەوە ئەوەیە کە مەریەم لەنەوەی هارونی برای موسا بووە وەك چۆن دەوترێت (ئەی برای کوڕی فلان).

هەندێکی دیکە دەڵێن: بەڵام ئەم هارونە پیاوێکی خراپەکار بووەو بە ئاشکرا کاری خراپی ئەنجامداوە, بۆیە وەك لێکچواندنێك مەریەمیان داوەتە پاڵ ئەو.

تەبەری دەڵێت: "ڕای دروست ئەوەیە کە لە پێغەمبەری خواوە دەگێردرێتەوە و پێشتر باسمان کرد ئەویش ئەوەیە (مەریەم کە بە خوشکی هارون ناوبراوە واتە گەڕاندنەوەی ڕەچەڵەکی بۆلای پیاوێك لەناو گەلو هۆزەکەی خۆیدا)".

بەپێی دەقەکەی (طبري) ڕاو بۆچوونەکان دەربارەی (ئەی خوشکی هارون) دەشێت دابەشبکرێت بەسەر دوو گروپدا:

أ- ڕاوبۆچوونێك کە دەڵێت ئەو هارونەی کەمەبەستە هارونی برای موسا نییە.

ب - ڕای دووەم وایدەبینێت کە هارونی برای موسایە.

لە گروپی یەکەمدا دەشێت سێ ڕاوبۆچوون لەیەکتر جیا بکەینەوە:

1- ڕاوبۆچوونی ئەوانەی دەڵێن کە هارون پیاوپاشێك بووە لەبەنی ئیسرائیلو هەموو ئەو شتانەی بەچاکەو باشە دەناسران دەدرانە پاڵ ئەو –دەیانگێڕایەوە بۆلای ئەو–.

2- ڕاوبۆچوونی ئەوانەی دەڵێن پیاوێکی خراپەکار بووەو خراپەکاریەکانیشی ئاشکراو لەبەرچاوبوون لەبەرئەوە ویستیان مەریەم لەگەڵ ئەودا بەراورد بکەن چونکە وای بۆ دەچوون کەمەریەم زینای کردووە وبەبێ ئەوەی شووی کردبێت منداڵێکی بووە.

3- ئەو ڕاو بۆچوونەی دوویاتی دەکاتەوە کە مەریەم برایەکی دایکو باوکی خۆی هەبووەو هارونی ناوبووە لەهەمان کاتیشدا پیاوپاشێکی ناو بەنی ئیسرائیل بووە, (فخر الدين الرازى لە تەفسیرەکەیدا بەشی 4, لاپەڕە 371) ئەم ڕایە دەچەسپێنێت.

گروپی دووەم کە دوویاتی دەکاتەوە هارون لە دەستەواژەی (ئەی خوشکی هارون)دا برای ڕاستەقینەی موسایە و جەخت لەسەر بۆچوونەکەیان بەوە دەکەنەوە کە ئەوە گوزارشتێکی زمانەوانی خواستراوە بەواتای (لەوەچەی هارونەوە شۆڕ بووەتەوە) وەك چۆن بە پیاوێك لەهۆزی (تمیم) دەڵێین ئەی برای تەمیم.

ڕای یەکەم قەتادەو کەعبو ئەبو زەیدو موغیرەی کوڕی شوعبە پشتگیری لێدەکەن.

بەڵام ڕای دووەم (طبري) دیاری نەکردووە کێ پشتگیری لێدەکات بەڵام (ابن كثير) لە لاپەڕە (119)ی بەشی یەکەمی تەفسیرەکەیدا دەڵێت "ئەوە ڕای سەعیدی کوڕی جوبەیرە".

بەڵام بۆچوونی چوارەم لە گروپی دووەمدا (سەدی) باسی کردووە.

ئەی ڕاو بۆچوونی (طبري) کامەیە کە دەڵێت ڕای پەسەند ئەوەیانە کە لە پێغەمبەرەوە دەیگێڕنەوە کە ئەوەیە (مەبەست هارونی برای موسا نییە, بەڵکو پیاو چاکێك بووە لەناو هۆزەکەی مەریەمدا).

بەڵام (فخرالدين الرازى) لە ڕونکردنەوەی ئایەتی (28)ی سورەتی مەریەمدا پێچەوانەکەی دوویات دەکاتەوە, بەشێوەیەك کە دەڵێت "پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی مەبەست لە هارونی ناو ئایەتەکە هارونی پێغەمبەرەو مەریەمیش

لەوەچەی ئەوە بۆیە گوزارشتی (ئەی خوشکی هارون) بە ئاسانی مەبەست پێی وەك گوزارشتی (یا أخا همذان– ئەی برای هەمزان) وایە واتە (تۆ ئەی ئەو کەسەی لەهۆزی هەمزانیت) (فخرالدین الرازی, التفسیر, بەرگی 4 لاپەڕە 371, چاپی بولاق, قاهیرە 1862ز).

وە دەربارەی ئەوەی (طبري) ریوایەتی کردووەو بەستویەتییەوە بە موغیرەی کوڕی شوعبەوە کاتێك نێردرا بۆلای دانیشتوانی (نەجران) ئێمە هەمان بەسەرهات لەهەرسێ سەرچاوە باوەڕپێکراوەکەی فەرمودەدا دەبینینەوە کە (صەحیحی موسلیمو تیرمزیو نەسائی)یە (بڕوانە تەفسیری ابن کثیر, بەرگی 2, قاهیرە, 1954ز) لە فەرمودەی عەبدوڵڵای کوڕی ئیدریسەوە لە باوکییەوەو لە (سەماك)ەوە تیرمیزی دەربارەی وتویەتی: فەرمودەیەکی (حسن صحیح غریب)ە.

ئەگەر بەسەرهاتەکەی موغیرەی کوڕی شوعبە ڕاست بێت ئەوا دەکرێت هەموو ئەو شتانە هەڵبگێڕێتەوە کە بەخشیویانەتە ئەم مەسەلەیە:

أ- چونکە مانای وایە کە تۆمەتی تێکەڵکردنی مێژوویی کاتێك سەری هەڵداوەو بووە کە هێشتا پێغەمبەر (ﷺ) لە ژیاندا بووە.

ب - وە (یوحەنای دیمەشقی) شتێکی نەکردووە جگە لەوتنەوەی تۆمەتێکی کۆن کە بەر لە پێشینەکانی خۆی بە 100 ساڵ وتراوە.

بەڵام ئەگەر ڕاست بێت کە ئەم تۆمەتە لەلایەن مەسیحییە عەرەبەکانەوە لەماوەی ژیانی پێغەمبەر (ﷺ)دا ئاراستەکرابێت, دەشێت بپرسین ، بەڵکو پێویستە بپرسین ئەی بۆچی بۆچوونی مسوڵمانەکان دەربارەی ئەم تۆمەتە جیاوازە کە بەتەنها لەلای (طبري) چوار ڕاوبۆچوونمان ژماردو هی تریش دەبینین؟ ئەم جیاوازییە چۆن ڕوویداوە لەکاتێکدا پێغەمبەر (ﷺ) یەك وەڵامی دروستی خستووەتە بەردەستمان؟

بۆیە مسوڵمانەکان جگە لەباسکردنی ئەم تاکە وەڵامە دروستەی پێغەمبەر(ﷺ)بۆ هەموو ئەوانەی کە زاتی ئەوە دەکەن هەمان ڕەخنە دووبارە بکەنەوە هیچی تریان لەسەر نەبوو.

بێگومان شتێکی سروشتی دەبوو وە چاکتریش بوو کە مەسیحیو یەهودییەکان لەکاتی بیستنی ئەم ئایەتی (28)ەی سورەتی مەریەمداو دوو ئایەتەکەی سورەتی (آل عمران)دا کە هەموویان لە قۆناغی (مەدەنی)دا دابەزیوون ئەم ڕەخنەیەیان بگرتایە, بەڵام هیچمان دەربارەی ڕەخنەی مەسیحی یان جولەکەکانی مەدینەوە نەبیستووەو پێ نەگەیشتووە, بۆچی نەسرانییەکانی نجران بۆچوونیان سەبارەت بەم جیاوازییە مێژووییە دەوروژێنن؟ لەکاتێکدا قورئانی پیرۆز لەوکاتەدا بەردەوام دەهاتە خوارەوەو ئامادەیی هەبوو بۆ وەڵامدانەوەی ڕەخنەکانی یەهودو نەسرانییەکان, ئەی بۆچی دەربارەی ئەو ڕەخنەیە وشەیەکی باس نەکردووەو ئەو دەقەی بە ئایەتێکی دیکە هەڵنەوەشاندووەتەوە کەبووەتە جێگەی تانە لێدانو جیاوازی؟

هەموو ئەم پرسیارانە دووپاتی دەکەنەوە بەڕای ئێمە ئەو بەسەرهاتەو ئەو فەرمودە پەیوەستکراوەی بەو بابەتەوە کە (موغیرەی کوڕی شوعبە) دەیگێڕێتەوە ڕاست نییەو بۆ ئەوە دروستکراوە تاوەکو بۆ مەسیحییەکانی سەدەی دووەمو سێیەمی کۆچی کە ئەم تۆمەتەیان وروژاندووە بسەلمێنن کە ئەوە تۆمەتێکە خودی پێغەمبەر (ﷺ) بەدرۆی خستووتەوەو هەڵیوەشاندووەتەوە.

### چارەسەرمان بۆ کێشەکە

یەکەمجار دەبینین کە کێشەکە لە ژیانی پێغەمبەردا (ﷺ) نەوروژێنراوە لەبەرهۆیەکی سادە، ئەویش ئەوەیە کە نەسرانیو مەسیحییەکانی مەدینە هیچ کێشەیەکیان نەبینییوە لە ئایەتی (یا أخت هارون)دا، لەبەرئەوە تێگەیشتبوون کە

ئەو ئایەتە مانای (ئەی لەوەچەی هارونەوە هاتوو) دەگەیەنێت, هەروەك ئەوەی كە ئەوانو كەسانی دیكەش لە عەرەبەكان ڕاهاتبوون لەسەر ئەو جۆرە گوزارشت كردنانەی وەك "ئەی برای نەوەی فلان" بەمانای ئەی ئەوەی لە بنەماڵەی فلانەوە هاتووی, وە ئەوە لەو ماوەیەدا بە خەیاڵیاندا نەهاتووە, ماوەكەش ئەو كاتەیە كە زۆرێك لە ڕۆژهەلاتناسەكان[1] باسیدەكەن كەلەو كاتەدا موحەممەد نەیزانیوە كە لەنێوان هارونو مەریەمو دایكی عیسادا ماوەیەكی زەمەنی دووورودرێژ هەیە كە ئەوەش شتێكە لەو ماوەیەدا لەناو شاری مەدینەدا بەلای كەسەوە گرنگ نییە, خۆ بەلای كەمەوە یەهودییەكان لەمەدینەدابوون بۆ ئەوەی هەموو خەڵكی تێبگەیەنن.

لەلایەن خۆشمانەوە بۆ نموونەكانی (طبري) كە بۆ ڕاڤەكردنی واتای گوزارشتنی (ئەی برای فلانو ئەی خوشكی فلان) باسی كردوون ئەم نموونانەی خوارەوە زیاد دەكەین:

1ـ لە قورئاندا لە سورەتی (هود, ئایەتی50)دا ئەم گوزارشتە قورئانییە دەخوێنینەوە (وَإِلَى عَادٍ أَخَاهُمْ هودا) (هود : 50 ) واتە (بۆ گەلی عادیش براكەیان هودمان نارد).

(بلاشیر) وشەی (أخاهم– براكەیان) بەمانانی (كوڕی هۆزەكەیان) لێكدەداتەوەو وەری دەگێڕێت (ترجمة القرآن, ج2, لاپەڕە 441).

ئەمەش نمونەیەكی ئاشكرایەو لەخودی قورئانەوە وەرگیراوەو تاوەكو ڕوونی بكاتەوە كە وشەی (برا) یان (خوشك) دەكرێت بەواتای (ئەندامی ناو هۆزێك یان كەسێك لەوان) بەكار بهێنرێت.

2ـ لەوتارێكی بەناوبانگی عەلی كوڕی ئەبو تالیبدا لە كتێبی (ڕێبازی ڕەوانبێژی– نهج البلاغه)دا باسی دوو دێڕە شیعر دەكات بەمشێوەیە دەست پێدەكات "كما قال أخو هوزان" هەروەك برای هەوزان وتی, وە مەبەستی لە (دریدی كوڕی صمه)یە كە لە خێڵی هەوزان بووە.

3ـ زۆر جار بە (حەجاجی كوڕی یوسفی سەقەفی) دەوترێت (أخو ثقیف– برای سەقیف) چونكە لە خیلّی (سەقیف) بووە.

4ـ هەروەها ئەوەی ئەمڕۆ تەنانەت لەوتاری گۆڤارو ڕۆژنامەكانیشدا وا باوە كاتێك كەسێك سەرزەنشتی كەسێك دەكات بەم زاراوەیە ناوی دەبات (یا أخا العرب– ئەی برای عەرەب) واتە ئەی كەسێكی ناو نەتەوەی عەرەب.

دەشێت زۆر زۆرترمان لەم جۆرە نمونانە لە كاری عەرەبەكاندا لەهەموو چاخو سەردەمێكدا چاوپێبكەوێت, لەبەرئەوە هەر لەسەرەتای ئەم فەسڵەوە دووپاتمان كردەوە لەوە ئاسانتر نییە كە ڕاڤەی (ئەی خوشكی هارون) بكەین بەو واتایەی (ئەی ئەو كەسەی لەڕەچەڵەكو بنەماڵەی هارونەوە هاتوویت) چونكە ئەوە ڕاڤەكردنێكی زمانەوانی زۆر ڕوونو ئاشكرایە بۆ كەسێك بەباشی لە زمانی عەرەبی بزانێتو لەسەر زاراوەكانی ڕاهاتبێت.

بەڵام دەشێت لێرەدا ڕەخنەیەك بوروژێت پاڵپشتەكەی ئەوەبێت: بۆچی لەم بابەتەدا قورئانی پیرۆز مەریەم بە (ئەی خوشكی هارون) بانگ دەكات؟ وەڵامەكەی ئەوەیە چونكە كارەكە سەرزەنشتكردنێك دەخوازێت ئاراستەی مەریەم بكرێت چونكە بەبێ ئەوەی شوی كردبێت منداڵێكی بووە, وە ئەم سەرزەنشتكردنە بێ بەزەییانەتر دەبێت ئەگەر لەبنەماڵەو خێزانێكی پیرۆزیش بێت, لەبەرئەوە وشەی (هارون) لێرەدا هاتووە بۆ ئەوەی مەترسی ئەو گوناهو تاوانەی كە كردوویەتی

[1] لەناو نوێترین ئەو كەسانەدا ئەوەیان وتووە, ناوی (موریس گودفروا دیمومبین) دەهێنین لە كتێبی (محمد, لاپەڕە 384, ساڵی 1958ن) كە لە زیادەڕۆیی بۆچوونەكەی خۆی كۆڵیوەتەوە كاتێك بە (لەوانەیە) قسەی كردووەو وتویەتی "لەوانەیە موحەممەد گومانی وا بردبێت كە تەوراتو ئینجیل لەهەمان ماوەدا هاتوونەتە خوارەوە".

بیری بخاتەوە, وە ئەم سەرزەنشتکردنە زۆر دەربڕو ڕەوانبێژیانەیەو ئەمەش لەگەڵ ڕەوانبێژی قورئانیدا گونجاوە کە کورتبێژیو کورت کردنەوە لەگرنگترین ڕەگەزەکانی ئەو ڕەوانبێژییەن.

لەبەرئەوە ئێمە دووپاتی دەکەینەوە کە لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) وتەی "ئەی خوشکی هارون" هیچ کێشەو گرفتێکی نەوروژاندووە نەلەلایەن جولەکەوە وە نەلایەن نەسرانییەکانو مسوڵمانەکانیشەوە چونکە ئەوان بەم مانایە لێی تێگەیشتبوون "ئەی ئەو کەسەی لەڕەچەڵەکی هارونەوە هاتوویت".

ئەوەی بەڕاستی مایەی سەرسوڕمانە ئەوەیە نە (طبري)و نە (فخرالدین الرازی) پشتگیری ئەم تەفسیرەیان نەکردووە, چونکە (طبري) لەم بۆچوونە دڵنیا نییەو (ڕازی) ڕای سێیەم بەباشتر دەزانێت کە بریتییە لەوەی مەریەم برایەکی دایكو باوکی هەبووەو ناوی هاڕون بووەو یەکێك بووە لە پیاوە چاکەکانی بەنی ئیسرائیل, وە ئەم سەرزەنشتە لەگەڵ ناوهێنانی ئەودا ڕوویەڕووی مەریەم کراوەتەوە تاوەکو سەرزەنشتەکە ئێشی زیاتر بێت, چونکە کەسێك برایەکی وەك ئەو برایەی هەبێت گوناهو تاوانەکەی مەترسیدارتر دەبێت.

## ڕایەکی نامۆی قەرزی (قرضي)

بەلاّم ئەوەی هیچ کام لە ڕاڤەکاران نەیان وتووە ئەوەیە کە لەهەموو ڕاکان نامۆترەو (موحەممەدی کوڕی کەعبی قەرزی) وتویەتی, ناوبراو لە خێڵێکی یەهودی شاری مەدینەیە کە (بەنوقورەیزەن) ، ئەو خێڵە جولەکەیەی کە پێغەمبەر (ﷺ) لەشاری مەدینە دەری کردنە دەرەوە, ئەم بنەچەیەش بۆخۆی ڕاڤەی بۆچوونەکەی (قەرزی) دەکات, ئەم کابرایە وا دەڵێت کە "مەریەم خوشکی دایكو باوکی هارونەو خوشکی موسا پێغەمبەریشە, وە شوێن ڕێبازی موسا کەوتووە و شەریعەتەکەی ئەوی وەرگرتووە" (إبن کثیر) ڕادەپەڕێتو بەتوندی وەلاّمی ئەم ڕایەی دەداتەوەو دەڵێت "ئەم ڕایە خراپیو بێکەڵکی ئاشکرایە, چونکە خوا لە کتێبەکەیدا فەرموویەتی کە عیسای لە پاش پێغەمبەرەکانەوە ناردووە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە عیسا دوایین نێردراوەو جگە لە موحەممەد کەسی تر لەدوای ئەوەوە نەهاتووە ئەمەش لە سەحیحی بوخاریدا چەسپاوەو ئەبو هورەیرە لە پێغەمبەری خواوە دەیگێڕێتەوە: "من لە پێشترم بە عیسای کوڕی مەریەم لەکەسێکی تری جگە لەمن, وە لەنێوان منو ئەودا پێغەمبەر نییە" جا ئەگەر ئەو پروپاگەندەیەی موحەممەدی کوڕی کەعبی قەرزی ڕاست بێت ئەوا جگە لە موحەممەد (ﷺ) پێغەمبەر لەدوایەوە نیەو وە پێش سولەیمانی کوڕی داودیشە چونکە خوای گەورە لەم ئایەتەدا فەرمویەتی کە داود لەدوای موساوە بووە (أَلَمْ تَرَ إِلَى الْمَلإِ مِن بَنِي إِسْرَائِيلَ مِن بَعْدِ مُوسَى إِذْ قَالُواْ لِنَبِيٍّ لَّهُمُ ابْعَثْ لَنَا مَلِكاً نُّقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللّهِ) (البقره : 246 ) واتە: ئایا سەیری ئەو دەمڕاستو پیاوە گەورانەی بەنی ئیسرائیل ناکەیت کاتێك بە پێغەمبەرێك لەخۆیانیان وت پاشایەکمان بۆ بنێرە تاوەکو لەڕێگای خوادا بجەنگێین"

پاشان چیرۆکەکە دەگێڕێتەوە هەتا ئەو شوێنەی کە خوای گەورە فەرمویەتی (وَقَتَلَ دَاوُودُ جَالُوتَ) – وە داود جالوتی کوشت –(سورەتی االبقرة, ئایەتەکانی 246ـ 251).

ئەوەی هانی (قەرزی) داوە لەسەر ئەم بۆچوونەی ئەوەیە کە لەتەوراتدا بینیویەتیو نووسراوە: پاش دەربازبوونی موساو بەنی ئیسرائیل لەدەریاکە فیرعەون و گەلەکەی نوقمبوون. (قەرزی) دەڵێت "لەوکاتەدا مەریەمی کچی عیمرانو خوشکی موساو هارونی پێغەمبەر هەستایەوەو دەستیکرد بەدەف لێدان ئەویشو ژنەکانی دیکەش تەسبیحاتی خوایان دەکردو سوپاسگوزارییان بۆ دەردەبڕی لە بەرامبەر ئەو چاکەیەی بەخشییە بەنی ئیسرائیل".

کەواتە مەبەستی (قەرزی) ئەوەیە ئەو (مەریەمە) مەریەمی دایکی عیسایە, ئەمەش هەڵەیەکی زۆر ترسناکە.

لە ڕاستیشدا دایکی عیسا بەمەریەم وتراوە, ئەوە نەریتێك بووە لەناو بەنی ئیسرائیلدا کەبەناوی پێغەمبەرەکانیانو پیاوچاکەکانیانەوە ناو ببەن ، وە ئەم دەقەی (ابن کثیر) گرنگە لە ئاشکرا کردنی نووسەری ئەم تێکەڵکردنەی نێوان

مەریەمی خوشکی موساو هارونو مەریەمی دایکی عیسادا, ئەو نووسەرەش کەس نییە جگە لە موحەممەدی کوڕی کەعبی قەرزی نەبێت, کە چیرۆکی مەریەمی لە (سفر الخروج, صحاح15 ئایەتەکانی( 20, 21) وە وەرگرتووە کە تیایدا ئەمە دەخوێنینەوە: "مەریەمی پێغەمبەر, خوشکی هارونو موسا, دەفەکەی گرت بەدەستییەوەو هەموو ژنەکان بەدوایدا هاتنە دەرەوەو بەدەفەکانەوە دەستیانکرد بە سەماکردنو مەریەمیش داوای لێدەکردن (گۆرانی بۆ خوا بڵێن ئەوەی بەگەورەیی خۆی, سوارچاکو سوار چاکەکانی فرێدایە ناو دەریا".

بەڵام ئەگەر (قەرزی) زانیاری تەواوی لەسەر تەورات هەبوایە چۆن بەمشێوەیە فریوی دەخواردو تێکەڵی لەنێوان مەریەمی خوشکی موساو هارونو مەریەمی دایکی عیسادا دروست دەکرد؟ ئەوە شتێکە کە ناتوانین لێی تێبگەین.

دەکرێت لێرەدا بپرسین ئەوە ئەگەر پێویستیش نەکات کە لەمبارەیەوە گریمانە بکرێت کە (قەرزی) سەرچاوەی ئەو رایە نییە کە ریلاند لەتۆمەتەکەیدا بە وتنی بوونی تێکەڵی لەنێوان (مەریەمو مەریەم)دا خستوویەتیە ڕوو, چونکە نە (طبري)و نە (رازی) باسی ئەو بۆچوونەیان نەکردووە کە دراوەتە پاڵ (موحەممەدی کوڕی کەعبی قەرزی) وە تاکە سەرچاوەیەك کە ئەویان تێدا بینییەوە ساڵی (701 کۆچی, 1301ز) لەدایکبووەو ساڵی (774کۆچی, 1373ز) مردووە, بێگومان ئەوزۆر درەنگ وەخت هاتووە.

بەڵام ڕاڤەی موعجیزەکەی لەلا نابینین کە بریتییە لە لواندنی ئەوەی کەهەردوو مریەمەکە یەك مەریەم بووبێت کەخوشکی هارونەو وەك موعجیزەیەك ژیاوە تا ئەوکاتەی کە پێویستە عیسای تێدا لەدایك ببێتو ریلاند لە (جادانولو)ەوە دەیگێرێتەوە (فیلپ جادانولو) ڕۆژهەڵاتناسێکی ئیتاڵیەو لە زانکۆی ڕۆما مامۆستای زمانی عەرەبی بووە, کتێبێکی لە (نەحو –ڕێزمان–ی عەرەبیدا) داناوەو ناونیشانەکەی بریتییە لە (بنەما کورتەکانی زمانی عەرەبی, ساڵی 1642ز, بلاوکراوەتەوە) وە فەرهەنگێکی عەرەبیشی داناوە بەناونیشانی (تیۆری فەرهەنگە عەرەبییەکان) کە ئەمە تائێستاش دەستنووسەو چاپنەکراوە, هەروەها چەند کتێبێکی بەرگریکارانەشی نووسیوە وەك: بەرگری لە ئاینی مەسیحی, ساڵی 1631ز, چەند تێبینییەك دژی ئایینی موحەممەد, 1649ز, وە بەشداریکردووە لەوەرگێڕانی تەوراتدا بۆ سەر زمانی عەرەبی (تەوراتی عەرەبی, 1671ز).

ئەوەی بەلامانەوە گرنگە ئەمەیانە (بەرگری لە ئایینی مەسیحی) کە لەوەڵامی کەسێکدا نووسیویەتی کەبە (ئەحمەدی کوڕی زەین لعابدینی فارسی ئەسفەهانی ناودەبرێت, کە بەزمانی فارسی دوو کتێبی نووسیوە بەناونیشانی (صاقل المرآة, سافکەری ئاوێنە) کە لەخۆیا بووە بەشێك لەکتێبێك بەناونیشانی (مرآة مرئیة الحق– ئاوێنەی بینینی حەق) لە ساڵی 1631ز, لە ڕۆما بلاویکردەوە, وە لە ساڵی 1637 زاینیدا بە هەمەڕەنگیو بەوەرگێڕانێکی عەرەبی بڵاویکردەوە بە ناونیشانی "وەڵامدانەوەی قەشەی ڕسوا فیلیپس کۆرانولوسی تۆقیو لە قەشەگەری– إجابة القسیس الحقیر فیلبس کورانولوس الراهب من رهبانیة) بەزمانی فارسی پێی دەوترێت کلریکوس مینور, بۆ ئەحمەدی شەریفی کوڕی زەینولعابدینی فارسی ئەسفەهانی, وە ئەو بەشەی لە چاپە لاتینییەکەیدا بەلامانەوە گرنگە ئەمەیە کەدێت: پاش ئەوەی تانەی بوونی تێکەڵکردنی نێوان هەردوو مەریەم دەخاتە ڕوو, لەم وشانەدا بەدووی وەڵامی مسوڵمانەکاندا دەچێت: "وەڵامی ئەم جیاوازییە مێژووییەم لەلای مسوڵمانەکان دەستکەوت, دەڵێن ئەوە دوو مەریەم نین بەڵکو یەك مەریەمەو وەك موعجیزەیەك لەسەردەمی موساوە هەتا سەردەمی عیسای مەسیح ماوەتەوە, لەوەشدا هەتا ئەمڕۆو بەم شێوەیە لەسەر جیاوازی مێژوویی تێکەڵکردنی نێوان هەردوو مەریەم گەواهی سەرچاوە مەسیحییەکان دەهێننەوە", وە بەپێی هەمان قسەکانی خۆی تەنانەت ئەم وەڵامەی مسوڵمانەکانی لەلای (أحمد بن زین العابدین الاصفهانی) رکابەریشی دەست نەکەوتووە, ئەی ئایا لەسەرچاوەیەکی عەرەبی یان فارسییەوە دەستی کەوتووە؟ هەرچۆنێك بێت دەکرێت ئەوە دووپات بکەینەوە چونکە

هیچ زانیارییەکی لەوبارەیەوە پێنەبەخشیوین, ئایا تەفسیرەکەی( ئیبن کثیر) ی لەو شوێنەدا کە باسمان کرد خوێندووەتەوە؟

بەلام ئەو شوێنە هەوالی مانەوەی ئیعجازیی مەریەمی خوشکی هارون هەتا سەردەمی عیسامان پێنادات, ئایا ئەوە پوختەی بۆچوونەکەی (ئیبن کەعبی قەرزی) بوو؟ بەلام لەکێوە وەریگرت؟ هەردەبێت لەنووسەرێکی مسولمانەوە وەری گرتبێت, چونکە (جادانولو) دەیبەستێتەوە بە مسولمانەکانەوە, کەواتە لەسەرمان پێویستە لەلای نووسەرە مسولمانەکان بۆی بگەڕێین بەتایبەتیش ئەوانەیان کەلەگەل نەسرانییە بەرگریکارەکان لە ئاینەکەیان مشتومڕیان کردووە, وا گومان دەبرا کە (جادانولو) کە یەکێکە لەمشتومڕکاری ئەوروپییەکان خۆی ئەم گەواهیانەی داهێنابێت, ئەوەش دوورنییە لەگیانی ئەو نووسینانەیەوە کە بەرگرییەکەیی پێ نووسیوە, لەڕاستیشدا جگە لەکەمێك سەرچاوە نەبێت لە سەرچاوە ئیسلامییەکان هیچی تری لەلا نابینین.

بۆ نمونە ئەو لەلاپەڕە (97)ی دەقە لاتینییەکەو لاپەڕە (557)ی وەرگێڕانە عەرەبییەکەدا باس لەدوو کتێبی پشت پی نەبەستراو دەکات بەناونیشانی "كتاب هاجر وكتاب تأريخ الأمام" وە کتێبێکیش ئەبەستێتەوە بە پێغەمبەرەوە (ﷺ) بەناونیشانی "تأريخ الأنوار" (لاپەڕە, 560, وەرگێڕانی عەرەبی, 303, دەقی لاتینی).

بەشێوەیەك کە زیاتر بی ئەنجامیو لەخۆوەبوونی پێوە دیارە دەلێت (موحەممەد) کتێبێکی داناوە کە لە (12 هەزار) فەرمودە پێکهاتووە, جا هەندێك لە مسولمانەکان لێی دەپرسن ئایا فەرمودەکانی ناوئەوکتێبە هەموویان ڕاستن, لەوەلامدا دەلێت تەنها (3 هەزار) فەرمودەیان ڕاستن (لاپەڕە 583 عەرەبی, 281 لاتینی), جا ئەو لێرەدا کاغەزەکان تێکەل دەکاتو بڕوای وایە کتێبەکانی سوننەت موحەممەد بەدەستی خۆی داناونو وە ئەوانە وەك کتێبێکی نووسراو لەسەردەمی پێغەمبەر خۆیدا (ﷺ) دانراونو هەبوون.

(جادانولو)ی مامۆستای زمانی عەرەبی کەسێکی نەزانو نەشارەزا بووە هەروەها نیەتیشی خراپ بووەو لە کتێبەکەیەوە (بەرگری لە ئایینی مەسیحی) هیچ شتێکی گرنگمان لێیەوە دەست ناکەوێت.

**(ابن كثير)و بەلگە زمانەوانییە مێژووییەکانی:**

با چەند وشەیەك دەربارەی (قەرزی) خاوەنی ئەو بۆچوونە ناوازەیە بلێین کە لە نێوان مەریەمی خوشکی موساو هارونو مەریەمی دایکی عیسادا تێکەلییەکی دروستکردووە.

(قەرزی) بە (ئەبو حەمزەی موحەممەدی کوڕی کەعبی قەرزی) ناودەبرێت, (سەمعانی) ڕەچەلەکەکەی بەتەواوی بەم شێوەیە باس دەکات "موحەممەد کوڕی کەعب کوڕی سولەیم کوڕی عەمر کوڕی لەعس کوڕی جەعن کوڕی قەرزە کوڕی عیمران کوڕی عومەیر کوڕی قورەیزەی کوڕی حارسەو خەلکی مەدینەیە, فەرمودەی لە ئیبن عەباسو ئیبن عومەرو زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە گێڕاوەتەوە, یەکێك بووە لەگەورەترین پیاوانی مەدینە لەهەردوو زانستی فەرمودەو فیقهدا, سالی 108 یان 117 لەمەدینە مردووە"[1] وە نەمانتوانی لەوەزیاتر زانیاری لەبارەیەوە کۆبکەینەوە, بۆ ئەوەی بەوردی لەبیروبۆچوونەکانی شارەزابین, پێویستە دیراسەی ئەو وتانە بکەین کە لە تەفسیری قورئاندا دراونەتە پال ئەو تاوەکو ببینین ئەگەر ئەو ڕاڤەکردنە قورئانیانە بەوەی کە بە (ئیسرائیلیات) ناو دەبرێت سواغ دراون یان نا؟ ئیسرائیلیات ئەو چیرۆكو بەسەرهاتانەن کە لە تەورات یان ئەجادا یان تەلمودەوە وەرگیراون.

بەهەرحال ڕاوبۆچوونەکەی لەبارەی مەریەم (مريام) بەلای کەمەوە وەك پێشتر باسمان کرد لەلایەن (ابن كثير)ەوە بەدرۆخرایەوە, چونکە پشت بە جیاوازییەکی مێژوویی ئاشکرا دەبەستێت, بەشێوەیەك وا دەردەخات کە (داودو سولەیمان)

[1] بڕوانە (السمعاني– الأنساب, ط .د.س مرجليوس– ليدن 1912 (بدون ترقيم).

لەدوای عیساوە هاتوون, ئەوەش دژو پێچەوانەی قورئانە چونکە قورئان ئەوە دووپات دەکاتەوە کە داودو سولەیمان لەدوای موساوە هاتوون هەروەك (ابن كثير) لە ڕاڤەی ئایەتەکانی (246– 251)ی سورەتی (البقرة)دا ئەوە دووپات دەکاتەوە (أَلَمْ تَرَ إِلَى الْمَلإِ مِن بَنِي إِسْرَائِيلَ مِن بَعْدِ مُوسَى إِذْ قَالُواْ لِنَبِيٍّ لَّهُمُ ابْعَثْ لَنَا مَلِكاً نُّقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللّهِ قَالَ هَلْ عَسَيْتُمْ إِن كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ أَلاَّ تُقَاتِلُواْ قَالُواْ وَمَا لَنَا أَلاَّ نُقَاتِلَ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَقَدْ أُخْرِجْنَا مِن دِيَارِنَا وَأَبْنَآئِنَا فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ الْقِتَالُ تَوَلَّوْاْ إِلاَّ قَلِيلاً مِّنْهُمْ وَاللّهُ عَلِيمٌ بِالظَّالِمِينَ* وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ اللّهَ قَدْ بَعَثَ لَكُمْ طَالُوتَ مَلِكاً قَالُوَاْ أَنَّى يَكُونُ لَهُ الْمُلْكُ عَلَيْنَا وَنَحْنُ أَحَقُّ بِالْمُلْكِ مِنْهُ وَلَمْ يُؤْتَ سَعَةً مِّنَ الْمَالِ قَالَ إِنَّ اللّهَ اصْطَفَاهُ عَلَيْكُمْ وَزَادَهُ بَسْطَةً فِي الْعِلْمِ وَالْجِسْمِ وَاللّهُ يُؤْتِي مُلْكَهُ مَن يَشَاءُ وَاللّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ* وَقَالَ لَهُمْ نِبِيُّهُمْ إِنَّ آيَةَ مُلْكِهِ أَن يَأْتِيَكُمُ التَّابُوتُ فِيهِ سَكِينَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَبَقِيَّةٌ مِّمَّا تَرَكَ آلُ مُوسَى وَآلُ هَارُونَ تَحْمِلُهُ الْمَلآئِكَةُ إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ* فَلَمَّا فَصَلَ طَالُوتُ بِالْجُنُودِ قَالَ إِنَّ اللّهَ مُبْتَلِيكُم بِنَهَرٍ فَمَن شَرِبَ مِنْهُ فَلَيْسَ مِنِّي وَمَن لَّمْ يَطْعَمْهُ فَإِنَّهُ مِنِّي إِلاَّ مَنِ اغْتَرَفَ غُرْفَةً بِيَدِهِ فَشَرِبُواْ مِنْهُ إِلاَّ قَلِيلاً مِّنْهُمْ فَلَمَّا جَاوَزَهُ هُوَ وَالَّذِينَ آمَنُواْ مَعَهُ قَالُواْ لاَ طَاقَةَ لَنَا الْيَوْمَ بِجَالُوتَ وَجُنودِهِ قَالَ الَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلاَقُو اللّهِ كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ اللّهِ وَاللّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ*وَلَمَّا بَرَزُواْ لِجَالُوتَ وَجُنُودِهِ قَالُواْ رَبَّنَا أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْراً وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ* فَهَزَمُوهُم بِإِذْنِ اللّهِ وَقَتَلَ دَاوُودُ جَالُوتَ وَآتَاهُ اللّهُ الْمُلْكَ وَالْحِكْمَةَ وَعَلَّمَهُ مِمَّا يَشَاءُ وَلَوْلاَ دَفْعُ اللّهِ النَّاسَ بَعْضَهُمْ بِبَعْضٍ لَّفَسَدَتِ الأَرْضُ وَلَـكِنَّ اللّهَ ذُو فَضْلٍ عَلَى الْعَالَمِينَ) (وەرگێڕانی بلاشێر).

ئەم بەڵگەیەی (ابن كثير) کە هێناویەتی پشتی بەخودی قورئان بەستووەو هەروەها (جورج سال)[1] یش لە تێبینییەکەیدا دەربارەی سورەتی آل عمران بەم وشانەوە ئەو بەڵگەیەی هێناوەتەوە "عمران یان عمران ناوێکە بۆ دوو کەسی جیاواز ئەمەش بەپێی سەرچاوەکانی مسوڵمانان یەکێکیان باوکی موساو هارونەو دووەمیشیان باوکی مەریەمی داوێن پاکە (الزمخشري– البيضاوي) بەڵام هەندێك نووسراوی مەسیحی باوکی مەریەم بە (یواقیم) ناودەبەنو ڕاڤەکارانیش بڕوایان وایە کەلەم جێگەیەدا مەبەست لە (یواقیم) یان یەکەمیانە یان دووەمیان, بەهەرحاڵ کەسی مەبەستدار لەدەقەکەدا بە ڕێککەوتن لەسەری کەسی دووەمیانەو ئەو لەگەڵ مەریەمی دایکی عیسادا باسکراوە کە ناوەکەی هاوشانی هارون هاتووە (قورئان سورەتی مەریەم).

کچێکی تریش کە بە (اشيا) یان (ايليسابات) ناوبراوە شووی بەزەکەریا کردووەو دایکی یوحەننای مەعمەدان (یەحیا) بووە, کەواتە بەو پێیەی کە مسوڵمانەکان دەیڵێن عیساو یەحیا یان یوحەنای مەعمەدانی کوڕە پوری یەکترن.

لەکەسایەتی ناوەکانا کە نووسەرە مەسیحییەکان بەشێوەیەکی گشتی وا خەیاڵیان کردووە ئەوەیە گوایا قورئان تێکەڵی دروستکردووە لەنێوان مەریەمی دایکی عیساو مەریەمی خوشکی موساو هاروندا, جا ئەگەر ئەم جیاوازییە مێژووییە ڕاستبێت ئەوا خۆی بەتەنها بەسە بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەوەی کە بانگەشەی دروستی ئەو کتێبە دەکات (بڕوانە ریلاند, محمد الحقيقي, لاپەڕە 211) (مراكشي, لاپەڕە 115).

بەڵام لەبەرئەوەی موحەممەد لەوانەیە نەشارەزابووبێت بە مێژووی کۆنو زنجیرەی ڕووداوەکان بۆیە ئەم هەڵە گەورەیەی ئەنجامداوە, وەتا ئێستاش نازانم چۆن دەکرێت ئەوە لەچوارچێوەی وشەکانی قورئاندا دەربهێنین.

ئەوەش ماندوویوونی ناوێت چونکە دووکەس کە هەمان ناویان هەبێت مانای ئەوە نییە هەمان کەس بن, لەسەروو ئەوەشەوە ئەو هەڵەیە بە ژمارەیەك هەڵەی دیکە لە شوێنەکانی دیکەی قورئاندا دووپات نەکراوەنەتەوە, لەمەشەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە موحەممەد زۆرباش زانیویەتی بەڵکو جەختیش دەکات کە موسا بەچەند سەدەیەك پێش عیسا

[1] جۆرج سال ساڵی 1734 قورئانی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی ئینگلیزی لەگەڵ چەند تێبینیو ڕوونکردنەوەیەکدا کە لەو تەفسیرانەوە وەری گرتوون کەزۆر پشتیان پێ نابەسترێت.

کەوتووە, وە ڕاڤەکارەکانیش ئەوە دووپات دەکەنەوە بەشێوەیەك قسە لەماوەیەك دەکەن کە هەردووکیانی کردووەتە شوێنکەوتەی کەسانێکی جیاواز, یەکەمیان (ابن شیار أزهار کاحاث بن لارا, دووەمیشیان إين ماثان) (الخروج 6, 18, الزمخشري– البيضاوي).

بەڵام ڕەچەڵەکەکەیان لە داوودەوە هەتا کروم بەشێوەیەکی ورد نەخستووەتە ڕوو, (ریلاند, سەرچاوەی پێشوو 211).

دەکرێت تێبینی ئەوە بکەین کەمەریەمی کچ لە قورئاندا بە خوشکی هارون ناو دەبرێتو بەخوشکی موسا ناونابرێت کەلەوانەیە بە موعجیزەیەك لەسەردەمی خۆیەوە هەتا سەردەمی عیسای مەسیح بەزیندوویی مابێتەوە تاوەکو ببێتە دایکی عیسا (فليپ جادانيولو– ضد أحمد, السابق, ص 279).

ئەم ڕایە کە لەکۆی گشتیدا دانایانەو پڕ لەزانیارییە ، لەڕاکانی تر بابەتیانەترو سەرکەوتووترە لەڕووی زانستییەوە زیاتر لەوانەی بە پێنووسەکانی گریمو هورفیتزو ڤنسنكو دیمومبینو پارێتو عەرەبناسەکانی دیکە لە پاش دوو سەدەوە بینیمانو چاومان پێیان کەوت.

بەبەراورد لەگەڵ (ریلاند)دا دەبینین نووسەری ئەم دەقە, سەرکەوتنی بەدەستهێناوە, چونکە هەڵوێست وەردەگرێتو بەچەند بەڵگەیەکی دروستو لۆژیکیو زمانەوانیو بەسود وەرگرتن لە ریلاندو ڕاڤەکارە مسوڵمانەکانی وك (الزمخشري لە الكشاف)و (البيضاوي لە أنوار التنزيل وأسرار التأويل) بەرگری لەڕاکەی خۆی دەکات.

ناتوانین ئەوە دیاریبکەین کەئەگەر (سال) ئەو بەلگەیەی خوێندبێتەوە کە لە تەفسیرەکەی (ابن كثير)دا هەیە چونکە ئەو خۆی باسی ئەوە ناکات وە لەوانەیە بە شێوازێکی سەربەخۆ بەم بەڵگەیە گەشتبێت.

### لەکۆتایی ئەم بەشەدا

لەپاش ئەم باسو خواسە بەربلاوە دەگەینە پوختەی ئەمەی خوارەوە:

1- دەستەواژەی قورئانیی (یا أخت هارون) (ئایەتی 28, مریم) جگە لە (ئەی وەچەی هارون) هیچ مانایەکی دیکەی نییە, وە ئەو تۆمەتی زیناکردنەی کە جولەکە مەریەمی دایکی عیسایان پێ تاوانبار کرد زۆر ناشیرین تربوو لەچاو ئەوەدا کە ئەو سەر بە بنەماڵەیەکی پیرۆزە, وە (لۆقا) ئەم ڕەچەڵەکە دووپات دەکاتەوە, چونکە مەریەم خزمی ئیلیساباتی دایکی یەحیایە هەروەها هیپۆلیت دووپاتی دەکاتەوە کە کچی پووری مەریەم بووەو سەرچاوە مەسیحییەکانیش ئەم خزمایەتییە دووپات دەکەنەوە.

2- جولەکەو نەسرانییەکانی مەدینەو دوورگەی عەرەبی بەو شێوەیە لێی تێگەیشتوون, وە لەڕووبینی زمانەوانییەوە بەکارهێنانی (برا یان خوشك یان ئەی برا یان ئەی خوشك) ئەگەرناوی هۆزیان خێڵ یان وڵات یان شارێك بەدوایدا هات واتە ئەی وەچەی ئەو هۆزە یان ئەو خێڵە یان ئەو شارو وڵاتە, وە ئەوەش بەکارهێنانێکە تا ئێستاش لە مێژووی زمانی عەرەبیدا باوە, وە (طبري)و بەشوێن ئەویشدا زۆرێك لە ڕاڤەکارە مسوڵمانەکان ئاماژەیان پێداوە, وە لەوبارەیەوەشەوە نمونەی زۆری هێناوەتەوەو هەروەها ئێمەش بەخودی قورئانو قسەی نووسەرە گەورەکان چەند نمونەیەکی دیکەمان هێنایەوە کە نمونەگەلێکن بە زیادیشەوە دەگەنە ڕادەی تێروپڕکردنی بابەتەکە.

3- هەروەها بڕوامان وایە کە گوزارشتی (ئەی خوشکی هارون) لە ژیانی پێغەمبەرداو ئەوەی موسلیمو نەسائیو تیرمزی باسیان کردووە هیچ کێشەیەکی نەوروژاندووە, لەگەڵ پارێزکردنمان بۆ ئەوەی کە (طبري) باسی کردووە لەوتوێژی نێوان موغیرەی کوڕی شوعبە و دانیشتوانی شاری نەجراندا, بەڕای ئێمە ئەوە دروستکراوە بۆ پشتگیری کردنی ئەو ڕەخنەیەی کە خودی پێغەمبەر (ﷺ) لەجیاتی ئەو وەڵامی دایەوە.

لەلایەکی دیکەشەوە لەوەی کە (طبري) باسی کردووەو (فخرالدين الرازي) پشتگیری دەکات گوایا مەریەم برایەکی بەناوی هارونەوە هەبووە پەسەند ناکرێت لەبەرئەوەی پشت بەستوو نیە بە هیچ پێدراوێکی مێژووییەوە.

4- بۆمان هەیە بپرسین چی وای لەیەکەم کەس کرد ئەم تۆمەتە بەجیاوازی مێژووییەوە دابڕێژێت یان لەنێوان مەریەمی خوشکی موساو هارون و مەریەمی دایکی عیسادا ئەم تێکەڵییە دروست بکات؟

یەکەم نووسەری مەسیحی کەباسی لەوە کردووە یوحەننای دیمەشقییە, وە ئەگەر ئەو خاوەنی ئەو تۆمەتە نەبێت دەکرێت بیگەڕێنینەوە بۆلای مەسیحییەکانی شام لەکۆتایی سەدەی یەکەمی کۆچیو حەوتەمی زاینی یان سێیەکی یەکەم لەسەدەی دووەمی کۆچیو هەشتەمی زاینیدا, بەجۆرێك کە یوحەنای دیمەشقی کۆی کردووەتەوەو لە کتێبی ( Haere Sibus)دا هێناویەتیو باسی کردووە.

5- وە لەمیانەی ئەوەدا ئەم تۆمەتەش دەبێتە یەکێك لەو تۆمەتانەی کە هەمیشە ئاراستەی قورئانو پێغەمبەرکراون لەسەدەی هەشتەمەوە هەتاوەکو ئەمڕۆ, ئەوەش لەلایەن پیاوانی ئایینیو هەندێك زاناوە لەمیانەی مشتومڕەکانیاندا لە دژی ئیسلامو لێکۆڵینەوە زانستیو تێبینییەکانیان پەیڕەو کراوە.

6- تاوەکو وەڵامی فەرمودە دروستکراوەکەی موغیرەی کوڕی شوعبە بدەینەوە کە هەندێك خۆگۆڕو مێژوونووس هێناویانەتەوە.

7- وە بەڵگەیەکی دیکە جگە لەبەڵگە (سوننەتییەکان) لەلای (ابن كثير) دەبینین کە بەڵگەیەکی عەقڵییەو لەسەر ڕەخنەی مێژوویی بنیاتنراوە ئەویش ئەوەیە کە مەحاڵە قورئان ئەو جیاوازییە مێژووییەو ئەو تێکەڵکردنە بهێنێتەوەو باسی بکات لەکاتێکدا لە ئایەتی دیکەدا ئیحتیاتی ئەو جیاوازییە مێژووییە دەکات کەلەنێوان سەردەمی هارونو سەردەمی مەریەمی دایکی عیسادا هەیە.

ئەم بەڵگە حاشا هەڵنەگرەش (جۆرج سال)یش لەسەرنجی ئەم بابەتەداو لەوەرگێڕانە ئینگلیزیەکەیدا بۆ قورئان کە ساڵی 1734ز بەدەرکەوت شوێنی کەوتووە.

دووپاتی دەکاتەوە کە مەحاڵە قورئان ئەم تێکەڵکردنە دروست بکات لەنێوان مەریەمی دایکی عیساو مەریەمی خوشکی موساو هاروندا چونکە ئەم جیاوازییە بەپێی ئەم ئاخاوتنانە لەگەڵ زۆرێك لە بابەتە قورئانییەکان یەکناگرێتەوە وە تیایشیدا دەردەکەوێت کە موحەممەد بەتەواوەتی ئاگاداری ئەوەیە کە موسا بەچەند سەدەیەکی زۆر پێش عیسا کەوتووە.

8ـ کەواتە شتێکی زۆر نامۆیە کە دەبینین (گریمو هورفیتزو ڤنسنكو بلاشیرو دیمومبینو پارێت) تەنانەت کە بەپارێزو مەرجەوە قسەدەکەن کەچی هەمان تۆمەت بەبێ بەڵگە دووبارە دەکەنەوە بەبێ ئەوەی زەحمەتی گفتوگۆکردنی ئەو چارەسەرانە بخەنە سەرشانیان کە ڕاڤەکارە مسوڵمانەکان پێشنیاریان کردوونو هەندێك نووسەری ئەورووپی وەك (ریلاندو جۆرج سال)یش پشتگیریان کردووەو لاشیان وایە کە ئەم تۆمەتە حوکمێکی پێشینەیەو بەڵگەی لەسەر نییە.

دەشێت نمونەی ئەم هەڵوێستە لە قەشەو پیاوە ئایینیو مژدەدەرەکانی وەك (یوحەنای دیمەشقیو نیکۆلاس دی کوزیو جادانولۆ)وکەسانی دیکەی جگە ئەوانیش تێبگەین, بەڵام کاتێك کارەکە پەیوەندی بە کۆمەڵە زانایەکەوە هەبێت کە پێویستە بابەتیبوونو بێ لایەنیان پێوە دیاربێت ئەوا لەوەیان تێناگەین.

یەکێك لەو کێشانەی کە ڕەخنەگرانی قورئان وروژاندویانە بریتییە لەوەی کە پەیوەستە بە (هامان)ەوەو ئەوەی کە لە قورئاندا وەك هاوکارو وەزیری فیرعەون شەش جار ناوی هاتووە, ئەو ئایەتانەش کە ناوی هامانیان تێدا هاتووە ئەمانەن:

1ـ (وَنُمَكِّنَ لَهُمْ فِي الْأَرْضِ وَنُرِيَ فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَجُنُودَهُمَا مِنْهُم مَّا كَانُوا يَحْذَرُونَ) (ئایەتی 6, سورەتی القصص).

2ـ (فَالْتَقَطَهُ آلُ فِرْعَوْنَ لِيَكُونَ لَهُمْ عَدُوّاً وَحَزَناً إِنَّ فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَجُنُودَهُمَا كَانُوا خَاطِئِينَ) (ئایەتی 8, سورەتی القصص).

3ـ (وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَا أَيُّهَا الْمَلَأُ مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَهٍ غَيْرِي فَأَوْقِدْ لِي يَا هَامَانُ عَلَى الطِّينِ فَاجْعَل لِّي صَرْحاً لَّعَلِّي أَطَّلِعُ إِلَى إِلَهِ مُوسَى وَإِنِّي لَأَظُنُّهُ مِنَ الْكَاذِبِينَ) (ئایەتی 37, سورەتی القصص).

4ـ (وَقَارُونَ وَفِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَلَقَدْ جَاءهُم مُّوسَى بِالْبَيِّنَاتِ فَاسْتَكْبَرُوا فِي الْأَرْضِ وَمَا كَانُوا سَابِقِينَ) (ئایەتی 39, سورەتی العنكبوت).

5ـ (وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَى بِآيَاتِنَا وَسُلْطَانٍ مُّبِينٍ* إِلَى فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَقَارُونَ فَقَالُوا سَاحِرٌ كَذَّابٌ) (ئایەتی 23, 24, سورەتی غافر).

6ـ (وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَا هَامَانُ ابْنِ لِي صَرْحاً لَّعَلِّي أَبْلُغُ الْأَسْبَابَ * َسْبَابَ السَّمَاوَاتِ فَأَطَّلِعَ إِلَى إِلَهِ مُوسَى وَإِنِّي لَأَظُنُّهُ كَاذِباً وَكَذَلِكَ زُيِّنَ لِفِرْعَوْنَ سُوءُ عَمَلِهِ وَصُدَّ عَنِ السَّبِيلِ وَمَا كَيْدُ فِرْعَوْنَ إِلَّا فِي تَبَابٍ) (ئایتی 36, 37, سورەتی غافر).

لەم ئایەتانەوە ڕوون دەبێتەوە کە دەبێت (هامان) وەزیری فیرعەون بووبێت, لەبەرئەوە ڕاڤەکارە دێرینەکانی قورئان دووپاتیان کردووەتەوە کەهامان وەزیری فیرعەونی میسر بووە ئەوەی کەلەگەڵ موسادا چیرۆکو بەسەرهاتێکیان هەبووە, وە تاکە کێشەیەك کە لێرەداو لەم ئایەتانەوە دەوروژێت ئەوەیە ئایا هامان هەر بەڕاستی ئەو قەڵایەی بۆ فیرعەون دروستکرد؟ هەندێك دووپاتی دەکەنەوە کە قەڵاکە بەڵێ بەڕاستی دروستکراوەو دەگێڕنەوە کەهامان بۆ تەواوکردنی ئەو ئەرکە (50هەزار) وەستای بانگکردووە تاوەکو قەڵاکە تەواوبووە, وە لەگەڵ تەواوبوونیدا فیرعەون سەردەکەوێتە سەر قەڵاکەو پاشان تیرێکی بەرەو ئاسمان هاوێشتو ئاسمان بووە چەند پەڵەیەك لەخوێن لەوکاتەدا فیرعەون دەڵێت "ئەوەتا خواکەی موسام کوشت".

لەکاتێکدا هەندێك ڕاڤەکاری دیکە وایدەبینن کە فیرعەون ئەو قەڵایەی بنیات نەناوە چونکە بەگوێرەی وتەی (فخرالدین الرازی) دوورە کەسی ژیر بیر لەوە بکاتەوە بەسەرکەوتنی بۆسەر قەڵایەك یان تاوەرێك ئیتر بەرزییەکەی هەرچەندە بێت لە ئاسمان نزیك دەبێتەوە.

لەڕاستیشدا ئەوەی سەربکەوێتە سەر چیایەکی بەرز ئاسمان لەوە دوورتر دەبینێت کەلەسەر زەوییەوە بینیویەتی وەهەر پیاوێکی ژیر ئەوە بەتەواوەتی دەزانێت کە ناکرێت تەقاندنی تیرێك بەر ئاسمان بکەوێت, وە هەرکەس هەوڵی کارێکی لەو جۆرە بدات ئەو کەسە بەشێت دەژمێردرێت, بۆیە ناکرێت نەبەپێی ئاینو نە بەپێی ژیری ڕاڤەی ئەم ئایەتانە بەشێوەیەك بکەین کە عەقڵ ڕەدی دەکاتەوەو قبوڵی ناکات.

هەروەها (ڕازی) دووپاتی دەکاتەوە ئەو تەفسیرەی کە زیاتر جێگەی باوەڕە ئەوەیە کە بڵێین فیرعەون ئاماژە —سوسە—ی بە دروستکردنی ئەو بورجە داوە بەڵام لەڕاستیدا بنیاتی نەناوە, وە دەربڕینی فیرعەون بەم وشانە (یا هامان ابن لی صرحالعلی أبلغ الاسباب * أسباب السموات....).

ـ ئەی هامان بورجێك یان قەڵایەکم بۆ بنیات بنێ بەڵکو بگەمە دەرگاکان —یاخود ڕێگەکان— ڕێگەکانی ئاسمان.

لەڕووی گاڵتەپێکردنەوە بووە تاوەکو بیسەلمێنێت کەمەحاڵە بوونی خواکەی موسا بسەلمێت وە ئەگەر نا سەیری ئاسمانەکان دەکات تاوەکو دڵنیا بێت ئەگەر ئەوە بلوێت, وە چ بەرزییەك و لەسەر چ بورجێك—تاوەرێك— تاوەکو بەرزترین بەرزاییش شتی وا دەلوێتو دەکرێت؟

ئا بەم ڕاڤە جوانە (فخرالدين الرازي) توانى تيشك بخاتە سەر بێهودەيى قسەكەى فيرعەون.

(فخرالدين الرازي) تفسير القرآن – القاهره (ج24 ص53) بەلاَم هيچ يەكێك لە ڕاڤەكارە مسوڵمانەكان هيچ گرفتێكيان نەوروژاندووە كە پەيوەندى بە كەسايەتى هامانەوە هەبێت.

ئەوەش كە ئەوەى پێويست كردووە ئەوەيە كە هيچ يەكێك لەڕەخنەگرەكانى قورئان لە مەسيحييەكان يان يەهودييەكان بيريان لەوروژاندنى وەها مەسەلەيەك نەكردووەتەوە ئەگەرنا لەلايەن مسوڵمانە بەرگريكارەكانى قورئانەوە وەلاَمى ڕوونو ئاشكرايان چاوپێدەكەوت, لەڕاستيشدا هيچ يەكێك لەمشومڕكارە مەسيحييەكان لەبوحەناى ديمەشقييەوە هەتاوەكو سەردەمى ڕێنيسانس ئەو كێشەيەيان نەوروژاندووە كە تايبەتە بەهامانەوە (عادل تيودور خوري– علماء اللاهوت البيزنطيين والاسلام, لوڤان 1969ن). بەلاَم ئەوەمان تەنها لەمشتومڕى مەسيحييە نوێيەكاندا چاوپێدەكەوێت.

تاوەكو دوورنەكەوينەوە لە مێژووى مشتومڕى مەسيحييەكان لەسەر ئەم بابەتە بە قسەيەكى تيودۆر نولْدكەى ڕۆژهەلاَتناسى ئەڵمانى بەناوبانگ وازدەهێنين كە لەوتارێكدا يەكەمجار لە ئينسكلۆپيدياى بەريتانى چاپى نۆيەم بەرگى 16 لاپەڕە 597 لە ساڵى 1887 زاينيدا بلاوكراوەتەوە, وە لەكتێبەكەيدا (لمحات من التأريخ الشرقى, 1892, لاپەڕە– 21, 59)دا باسكراوە, نۆلدكە لەوێدا دەڵێت "نەزانترين يەهود ناتوانێت تێكەڵى دروست بكات لەنێوان هامان (وەزيرى أحشويروش)و هامانى وەزيرى فيرعەوندا.

ئەم بەڵگەيەى نۆلْدكە ئەم تێبينيانەى خوارەوە دەخوازێت:

1ـ لەچ لايەكەوە وتراوە كە هامانى ناو قورئان هەمان ئەو هامانەيە كە لە (سفر استر 13–1, 15–7)دا باسكراوە ئەو هامانەى كە لە (شا أحشويروش)ەوە پادشاى فارسو مێردى (أستر)ەوە نزيك بووە, نەلە تەوراتو نە لەداستانە يەهودييە (ئاجادييەكاندا)[1] و نەلە هيچ شوێنێكى ديكەوە باس نەكراوە, چونكە ئەوە ئەو هامانە نييە كە لە پێشيەوە هەستاوە بە بنيات نانى بورجى بەناوبانگى بابل (سفر التكوين – الاصحاح 11, 1–9) كە واديارە بەماوەيەكى كەم پاش لافاوەكەو پاش دابەزينى نوحو ئەوانەى لەگەڵيدا بوون بنيات نراوە, لەلايەكى ديكەشەوە پايتەختى (شوشن) قەلاَى شوشن بووە لە (سوسيانا) ئەويش لەولاَتى فارسدايەو هيچ پەيوەنديەكى نييە بە بابل يان بابليۆنەوە (سفر أستر 1, 203) وە هەمان كوڕى (هەمداثا)يە لەولاَتى (ئەجاجى) كە ولاَتێكى كۆنو نەزانراوە, كەواتە تەوراتيش كە دەڵێت لەم كێشەيەدا سەرچاوەى قورئانە هامان نابەستێتەوە نەبە بابلو نەبە بورجى بابلەوە, كەواتە ئەم تيكەڵكردنەى نێوان هامانى وەزيرى (شا أحشويروش)و هامانى باسكراو لە قورئاندا لەكوێوەهات, ئەوە ئەگەر هامانى يەكەم واتە هامانى وەزيرى (شا أحشويروش)يش بوونى هەبووبێت؟ بەلاَم نۆلْدگە هەوڵى سەلماندنى كێشەكەى نادات كە بەڵگەى لەسەر نييە, ئەوەش شتێكى سەيرە بۆ پياوێك وا هەست دەكات كە (زانايەكى گەورەو يەكێكە لە پايەكانى ڕۆژهەلاَتناسى!).

2ـ ئەگەر مەسەلەكە وايە كە وتراوە گەورەترين نەزانەكانى يەهود لەمەدينەدا ئەو دوو هامانەيان تێكەڵ نەكردووە بێگومان موحەممەديش ئەو ڕەخنەيەى لەدەمى ئەو نەزانە يەهودييانەوە بيستووەو ئەو هەڵە گەورەيەى ڕاست كردووەتەوە, وە ئەو هەڵەيەش پێويست دەكات كە لەدەقى قورئانيدا كە دواى ئەو گوازراوەتەوە نەمێنێتەوە لەكاتێكدا ئەو دەقە لە دابەزينى قورئانەوە تاوەكو ئەمڕۆش هەردەبينرێت.

كەواتە گريمانەكەى نولدكە پڕاوپڕ هەڵەو بێ ئەنجامە.

[1] ئەجادى: بريتييە لەبەشى مێژوويى لە كتێبى (العهد القديم)و دەبێت بە دووبەشەوە:

أـ هالاخا (عەقيدە)

ب ـ ئاجادا (مێژوو).

گریمانەیەکی دیکە کەلەم گریمانەیە بێ هودەیی کەمتر نییە گریمانەیەکی (دیمومبین)ە پاش ئەوەی بەم شێوە کورتە باس لە ئایەتەکانی پێشوو دەکات (وقال فرعون یا هامان أوقد لی علی الطین فاجعل لی صرحا لعلی أطلع الی إله موسی) پاشان دەڵێت ئەمە یادکردنەوەیەکی نورانییەو خاڵی نییە لەتێکەڵکردن, چونکە ئەو هامانە بەوە ناسراوە کە دوژمنێکی سەرسەختی یەهودبووە, لە ئایەتە قورئانییەکەدا پەیوەندی بە فیرعەونو قارونی دەوڵەمەندترین پیاوی سەرزەوییەوە هەیە، ئەو سێ کەسە شەیتان دەستی لێوەشاندوون هەروەك شیعری کۆنی عەرەبیش ئەمەی تۆمارکردووە (موریس جود فروا دیمومبین– محمد– پاریس (ص360). ئەم دەقە ڕوون نییە چونکە هەرسێ کەسایەتییەکە تێکەڵ دەکات و دیاریشی ناکات تێکەڵاوکردنەکە لە چ شتێکدایە کەباسی دەکات, لەبەرئەوە ئەو لەتۆڵدکە ناڕوون ترە, لەلایەکی دیکەشەوە ئەو وتەیەی کەهامان بەدوژمنێکی سەرسەختی یەهود ناسراوە ئەوە ڕوون ناکاتەوە بۆچی لە قورئاندا بە وەزیری فیرعەون لەقەڵەم دراوە, خۆ یەهود دوژمنێکی دیکەیان هەبووە کەلەو سەرسەخت تربوونو هەروەها لەتەوراتدا باسکراون بەڵام قورئان هیچی لەبارەیانەوە باس نەکردووە نەشی کردوونەتە پاشکۆی فیرعەون.

لەبەرئەوە قسەکەی "دیمومبین" نەزانانەترو بۆنی نا ئاشکراییەکی لێوەدێت کەبەسەر بیرکردنەوەیدا زاڵ بووە.

پاش ئەوەی ڕووی ڕاستی بۆچوونەکانی (تۆڵدکەو دیمومبین)مان ئاشکراکرد, ئێستا ئەو کێشە درۆینە لەبابەتی هاماندا چییە؟!

بەڕای ئێمە هامانی باسکراو لەشەش ئایەتە قورئانییەکاندا کەلە پێشەوە باسکران ناوی کەسێك نییە بەڵکو نازناوی کاهینی گەورەی فیرعەون بووە, چونکە لەمێژووی میسرەوە زانیومانە کە کاهینی گەورەی (ئامون) سەرەتا لە خێزانی نۆزدەهەمەوە دەسەڵاتێکی گەورەی لە فیرعەونەوە پێدەبەخشرێت بەوە کۆتایی هاتووە کە کۆنترۆڵی ناوچەی نیلی سەرووی کردووەو بووەتە سەرکردەی سوپاو جێگری پادشای (کوش)و خەزنەداری گەورەی ئیمبراتۆریەتو بەرپرسی بالای خانووی خواوەندەکان.

لەواقیعدا بووەتە وەزیری فیرعەون بۆ هەموو کارە گشتییەکانو داراییەکان, لەنێوان ئەو پۆستانەدا کەبە (تباح هوتەب)ی وەزیردراوە "چاودێریکردنی هەموو کاروبارەکانی پادشا" دەخەینەوە یاد, کەواتە کاهینی گەورەی (ئامون)[1] پلەی وەزیری فیرعەونی ڕاپەڕاندووە.

ئەمەی پێشنیارکردووە: ناوی (هامان) لە قورئاندا بەرامبەری ناوی (ئامون)ە وە نزیك خستنەوەی نێوان هەردوو ناوەکە زۆر ئاسانە چونکە (ئامون) بە (ئامانا)ش دەردەبڕرێت 0بڕوانە, ئینسکلۆپیدیای بەریتانی, بەرگی 1, لاپەڕە 321, چاپی 1932) وە مەبەست پێی کورتکردنەوەی کاهینی گەورەیە وەك چۆن نازناوی (فیرعەون) مانای پادشای میسر دەگەیەنێت نازناوی هامانیش لەسەرچاوە زارەکییەکاندا واتە وەزیری فیرعەون.

ئەم گریمانانە بەڕوونیو ئاسانی ئەوە ئاشکرادەکەن کە ئەوەی لەقورئاندایە وەزیری فیرعەونە کەلەگەڵ موسادا بەسەرهاتی هەیەو بە (هامان) ناودەبرێت, وە لێرەدا ئەم بابەتە هیچ کێشەیەکی نییە, وە هەموو ڕەخنە ئاڕاستەکراوەکان لەمبارەیەوە بێکەڵکو نەیارانەن.

بەڵام نۆڵدکە لەم بەشەدا لە (لمحات– لاپەڕە 30)دا وا دیارە خراپ تێگەیشتووە, چونکە پاش ڕەخنەکەی کە پەیوەستە بەهامانو مەریەمەوە دەڵێت "زیاد لەم هەڵانەش وەرگێڕانو لادانی هەمەجۆر هەن بەپێی حەزو ئارەزوو, وە یەکێکیان زۆر مەترسیدارەو پەیوەستە بەخودی موحەممەدەوە, چونکە بینا لەسەر نەشارەزایی بەهەرشتێك لەدەرەوەی

[1] ئامون: خواوەندی میسرییە کۆنەکان بووە بەواتای خوای خۆر. وەرگێڕ–

دوورگەی عەرەبی ئەوەتا قسە لەسەر بەپیتی خاکی میسر دەکات بەشێوەیەك باران هەندێك جار نابینرێت و هەندێك جاریش بزر نابێت, لەبەرئەوە پشت بەستن بەباران بە ئەلتەرناتیڤێکی لافاوی ڕووباری نیل دەژمێردرێت. (سورەتی یوسف, ئایەتی 49).

ئەو ڕەخنە ناشیرین و گێلانەیە دەرخەری ئەو نەزانینییەیە کە بەسەر نۆلدکەی زۆر بەناوبانگدا زاڵە وە لە نەشارەزاییەوە بەزمانی عەرەبی و کاروباری میسرەوە سەرچاوەی گرتووە.

1ـ ئەو ئایەتەی کە نۆلدکە گەواهی پێدەدات دەقەکەی بەمشێوەیەیە (ثُمَّ يَأْتِي مِن بَعْدِ ذَلِكَ عَامٌ فِيهِ يُغَاثُ النَّاسُ وَفِيهِ يَعْصِرُونَ) (سورەتی یوسف, ئایەتی 49).

(یغاث) واتە فریای دەکەوێت (تەفسیری ڕازی, بەرگی 18, لاپەڕە 125– وە ابو حیان, بەرگی 5, لاپەڕە 314) نەك بە ئاشکراقسەکە لێرەدا لەسەر باران بێت, بەڵام نۆلدکە بەهۆی وەرگێڕە ئەورووپییەکانەوە ئەوانەی ئەم وشەیەیان بەئارەزووی خۆیان وەرگێڕاوە کەوتۆتە هەڵەوە, نۆلدکە لەبریتیی ئەوەی پشت بەوانە ببەستێت دەبوایە پشتی بەچەند ڕاڤەکارێك ببەستایە کە گرنگی دەدەنە ڕاڤەکردن و ئاسانکردنی تێگەیەشتنی دەق وەك (سیوطي) ، تەنانەت نۆلدکە ئەو وەرگێرە ئەورووپیانەشی بەشێوەیەکی خراپ و هەڵپەکارانە خوێندووەتەوە, بۆ نموونە (جۆرج سال) ئەم ئایەتەی بەمشێوەیە وەرگێڕاوە "پاشان لەدوای ئەو ساڵێك دێت بارانێکی زۆر بۆ خەڵکی دەبارێت و ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوەی خەڵکەکە ڕۆن و شەراب دروستبکەن".

پاشان لە تێبینییەکدا کەلەژێر لاپەڕەکەوە نووسیویەتی پەلەی کردووەو ڕەخنەیەکی وەك ڕەخنەکەی نۆلدکەی خستۆتە ڕوو دەڵێت: "سەرەڕای ئەوەی کەچەند نووسەرێکی کۆن دەربارەی جیاوازی (ئەفلاتون و بوحب) نووسیویانە ئەگەر باران بارین بەزۆری لەزستاندا لە دەلتاو هەندێك جاریش بارینی بەفر لە ئەسکەندەرییە بە پێچەوانەی ئەوە بێت (سنیکا) وتویەتی, لەناوچەی (صعید)یش لەلای تاڤگەکانی نیلیش زۆرجار باران بارییبێت, لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك گریمانەی ئەوە دەکەن کە ئەو باران بارینە مەبەست پێیان ئەو بارانەیە کەلەماوەی هەڵچوونی ڕووباری نیلدا لە حەبەشە باریوە (جۆرج سال, وەرگێڕانی قورئان بۆ ئینگلیزی).

ئەو میسریانەی لەناوچەی دەلتاو بەڕووی دەریادا دەژین بەتەواوی دەزانن کە لەزستانداو لەماوەی چوار مانگدا لەمانگی (کانونی یەکەمەوە بۆ مانگی ئادار) باران زۆر بەخوڕی دەبارێت, کشتوکاڵی گەنم و جۆو پاقلەو ...هتد, تاڕادەیەك پشت بەو بارانە دەبەستێت کەلەو وەرزەدا دەبارێت, من بەتەواوی دەزانم کە نۆلدکە هەرگیز ئەورووپای بەجێنەهێشتووەو بەدرێژایی تەمەنیشی (1836– 1931) پێی نەناوەتە هیچ وڵاتێکی عەرەبی و ئیسلامی, ئیتر ئەم سەرچاوانەی لەکوێ بوو تاوەکو دیراسەی عەرەبی و ئیسلامیی لەسەر بکات! بەڵام ئەی قورئانە وەرگێڕاوە بەناوبانگەکەی (جۆرج سال)ی لەسەدەی هەژدەهەمدا نەخوێندۆتەوە؟ وادیارە وڕێنە دەکات, هەڵەکەی نۆلدکە لێرەدا دوو سەرەیە: ئەو لە مانای دەقە عەرەبییەکەی ئایەتەکە (49ی یوسف) تێنەگەیشتووە, پاشان دووپاتیشی دەکاتەوە کە لەمیسردا نەباران دەبینرێت و نەبارانیشی لێ بزردەبێت ئەوەش هەڵەیەکی گەورەیەو هیچ منداڵێکی میسری هەڵەی واناکات.

## ناوەڕۆك

## بڵاوكراوەكانی پرۆژەی ( تیشك )

| زنجیره | ناوی کتێب | نووسەر |
|---|---|---|
| 1 | بەئیسلامكردنی كورد، ماستەرنامە یان هەڵەنامە؟ | ن: فازل قەرەداغی |
| 2 | نەزانیی و بێشەرمیی، بەشێك لە چەواشەكارییەكانی مەریوان هەڵەبجەیی لە كتێبی (سێكس و شەرع و ژن)دا | ن: عومەر كەمال دەروێش |
| 3 | ئاشتینامە، وەلامێك بۆ (خوێننامە)ی زەردەشتی | ن: ئامینە صدیق |
| 4 | فەتواكەی مەلای خەتێ، ئەفسانەی مێژوونووسێك | ن: حەسەن مەحمود حەمەكەریم |
| 5 | صەلاحەددینی ئەییوبی، گەورەتر لە رەخنەگرانی، گفتوگۆ لەگەڵ پرۆفیسۆر دكتۆر موحسین موحەممەد حسێن | ئا: ئارام عەلی سەعید |
| 6 | بەرەو بەختیاری ئافرەت "بەرگی یەكەم" | جەمال حەبیبوڵڵا "بێدار" |
| 7 | ئازادیی رادەربڕین لە رۆژئاوا، لە سەلمان روشدییەوە بۆ رۆجیە گارودی | ن: د. شەریف عەبدولعەزیم<br>و: وەرزێر حەمەسەلیم |
| 8 | بەجیهانیكردن، دیدێكی ئیسلامیی | ن: د. موحسین عەبدولحەمید<br>و: حەمەكەریم عەبدوڵلا |
| 9 | كوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامیدا | ن: حەسەن مەحمود حەمەكەریم |
| 10 | بەرەو بەختیاریی ئافرەت "بەرگی دووەم" | ن: جەمال حەبیبوڵلا "بێدار" |
| 11 | مێژووی دێرینی كوردستان "بەرگی دووەم" | ن: فازل قەرەداغی |
| 12 | سەدەیەك تەمەنی نوورین، مامۆستا عەبدولكەریمی مودەڕیس بە پێنووسی خۆی بناسە | ئا: عەبدولدائیم مەعروف هەورامانی |
| 13 | دەوڵەتی خیلافەت، بوژاندنەوەی كۆمەڵگەو گەشەسەندنی شارستانییەت | ن: ئیكرام كەریم |
| 14 | لە سەرگوزشتەكانی ژیان، ئەدەبی گاڵتەوگەپ، روداوی مێژوویی، بیرەوەریی | ن: شێخ موحەممەد خاڵ |
| 15 | پرۆژەی دەستووری هەرێمی كوردستان<br>رامان و سەرنجو پێشنیار | ئا: پرۆژەی تیشك |

